48

پڕۆژەی تیشک



بەرگی یەکەم

# پەروەردەی منداڵان

# لە ئیسلام دا




وەرگێرانی

ناصح ئیبراهیم سازانی

نوسینی:

د. عبدالله ناصح علوان



# پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا

بەرگــی یــەکـەم

نووسینی:

د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان

وەرگێڕانی:

ناصح ئیبراهیم سازانی

پەروەردەی ئیسلامی

پرۆژەی تیشك


ناوی کتێب: پەروەردەی منداڵان لە ئیسلامدا

نووسینی: د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان

وەرگێڕانی: ناصح ئیبراهیم سازانی

ژمارەی سپاردن: (٢٣١٤) ساڵی (٢٠٠٨)

شوێنی چاپ:

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩

نەخشەسازی بەرگ: سیف

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (٤٨)



ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت : www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

## بەناوی خوای گەورەو میهرەبا ن

## پێشـەکیی وەرگێڕ

**إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستهديه , ونعوذ بالله من شرور أنفسنا , ومن سيئات اعمالنا , من يهد الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادى له , وأشهد أن لا اله الاالله وحده لا شريك له , واشهد ان محمدا عبده ورسوله .**

ئەم پەرتوکەی بەردەستت (پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام)دا لە نووسینی بیریاری گەورەی ئیسلام دکتۆر عبداللە ناصح عەلوانە یەکێکە لە نایابترین پەرتوکی بواری پەروەردەی منداڵان و کڕیارێکی زۆری هەیە لە جیهانی ئیسلامدا لەبەر گرنگی و بەپێزی باسەکەی, ئەمڕۆ پەرتوکێکی لەو شێوەیە زۆر پێویستە بۆ باوکان و دایکان و پەروەردەکاران و خوێنەرانی کورد, چونکە هەوڵێکی زۆر خراوەتەگەڕ بۆ لەناوبردنی رەوشتی بەرزی ئەم میللەتە ستەم لێکراوەو, دوورخستنەوەی نەوەکانی لەرێی راستی ئیسلام و, ئاراستەکردنیان بەرەو لای ژیانی ئاژەڵی رۆژئاواو لاسایی کردنەوەی کوێرانەی رەوشتە ناشیرین و ناشایستەکانیان. .

ئێمەش بەپشتیوانی خوای گەورە هەستاین بەوەرگێڕانی و دەرهێنانی فەرموودەکانی, بۆ ئەوەی ببێتە چرایەکی رووناك بۆمان و لە شەوەزەنگی ژیانی سیستەمی نوێی جیهانی و نەفامیەکەی سەردەرکەین و رێگای راستی پێ بدۆزینەوە, بەپێی ئامۆژگای و رێنوومایی و ئاراستەکردنەکانی پەروەردەی منداڵەکانمان بکەین, تاکو بەختەوەری دنیاو دوارۆژبن و سوودیان بۆ خۆیان و بۆ ئێمەش ببێ. .

ئیسلام گرنگی زۆری داوە بەپەروەردەی منداڵ هەر لەهەڵبژاردنی دایکێکی نمونەییەوە بگرە تا دەگاتە لەدایك بوونی و, گوێزەبانە بۆکردنی و, خەتەنەکردن و ناونانی, هەروەها پەروەردەکردنی بەپەروەردەیەکی راست و دروست تا دەبێتە پیاوی ناو پیاوان.

خوای گەورەش لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ**

**نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ..﴾.التحريم:٦**. واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و خاوو خێزانتان بپارێزن لەو ئاگرەی سوتەمەنیەکەی خەڵك و بەردە.

خەلیفەی راشید عەلی کوڕی ئەبو تالیب رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: **(عَلموا أنفسكم وأهليكم الخير)**[1]. واتە: خۆتان و خانەوادەتان فێری خێرو چاکە بکەن.

چاکترین خێرو چاکەش ئەوەیە منداڵەکانمان لەسەر رەوشتی بەرزو جوان پەروەردەبکەین, فێری واجب و ئەحکامەکانی شەرعیان بکەین, تاکو رۆشنبیرو تێگەیشتو بن.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: **﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ..﴾. الزمر: ٩**. واتە: ئەی پێغەمبەرا بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن؟. لە راستیدا نەخێر.

* پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(مَنْ يُرد اللهُ به خيراً يُفَقِهْهُ في الدِّين)**[2]. واتە: ئەگەر کەسێك خوای گەورە خێرو چاکەی بۆ بوێت ئەوا شارەزاو زانای دەکات لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

یەکێك لەو کردەوە چاکانەی دەخرێتە ناو نامەی کردەوە چاکەکانی باوك و دایکەوە بەردەوام دەبێت تادوای مردنیان, بوونی منداڵێکی صالح و چاکە وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: **(إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ)**[3]. واتە: هەر کاتێ ئادەمیزاد مرد لە کردەوەکەی دادەبڕێ, تەنها لەم سێ شتەدا نەبێت: خێرێکی بەردەوام, زانیاریەك بلاو بکاتەوە سودی لێ وەرگیرێت, منداڵێکی صالح و چاك دوعای خێری بۆ بکات.

داواکارین لەپەروەردگاری بالادەست ئەم کردەوەیەمان لێ وەرگرێت بەخێرو چاکەی بەردەوام و, زانستی سوود لێ وەرگیراو, منداڵی صالح و چاکمان پێ ببەخشێت پاش خۆمان دوعای خێرمان بۆ بکات.

---

[1]- أثرصحيح أخرجه حاكم: ٤٩٤/٤, وقال صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه.

[2]- صحيح البخاري: ٧١,٣١١٦, ومسلم: ١٠٣٧, و أحمد في مسند: ١/ ٣٧٠.

[3]- صحيح مسلم: ٢٠٢٩/٤ برقم: ٢٦٣٥, صحيح الترغيب والترهيب: ١٩٩٨/٢.

# پێشەکی چاپی یەکەم

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کەبەرنامەی پەروەردەی راستی داناوە لە قورئانە شکۆمەندە بەرزەکەیدا, وە دروشمەکانی خێرو هیدایەت و چاکسازی روونکردۆتەوە بۆ هەموو جیهان لە ئەحکامەکانی شەرعە راست و پاکەکەیدا.

دروودو سلاو لەسەر گەورەو پێشەوامان موحەممەد صلى الله عليه وسلم ئەو پێغەمبەرەی کە خوای گەورە رەوانەی کردووە بۆ رێنمایی و پەروەردەکردنی مرۆڤایەتی, نیعمەتێکی وەهای بۆ دابەزاندووە تا مرۆڤایەتی بەرزی و گەورەیی و شکۆمەندی پێ بهێنێتەدی, خاوەنی ئەوپەڕی پلەو پایەیەو بەرزی و جێگیربوونە, وە لەسەر گیانی پاکی هاوەڵانی, ئەوانەی نموونەیەکی بەرزو بێ هاوتایان لە پەروەردەی منداڵان و بونیاتنانی نەتەوەکان بەخشیە نەوە لە دوای نەوەی خۆیان, وە لەسەر ئەوانەی لەسەر رێبازو بەرنامەی ئەوان رۆشتن, ئەوانەی کە شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرت لە خێرو چاکەدا تا رۆژی قیامەت, لە پاشان:

١- لە فەزڵ و چاکەی ئەم ئیسلامە بەسەر مرۆڤایەتیەوە ئەوەیە بەرنامەیەکی راست و گشتگیرو تەواوی بۆ ناردووە بۆ پەروەردەی دەروونەکان و, گەشەپێدانی نەوەکان و, بونیادنانی گەل و نەتەوەکان, دروستکردنی بناغەی شارستانیەتی و مەدەنیەت و بەرزی و شکۆمەندی.. ئەمەش تەنها بۆ ئەوەیە تا مرۆڤایەتی وێڵ و سەرگەردان لە تاریکی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان و نەفامی و گومڕایی و بێسەرو بەرەییەوە بگۆڕێت بۆ نورو روناکی یەکتاپەرستی و زانست و زانیاری و رێگای هیدایەت و هێمنی و ئارامی.. خوای گەورە راستی فەرمووە کە دەفەرموێت: **﴿قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ* يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ وَيُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾. المائدة:١٥-١٦.** واتە: بێگومان بۆتان هاتووە لەلایەن خوای گەورەوە رووناکیەکی گەورەو نامەیەکی روونکەرەوە, خوا رێنمایی کەسێکی پێدەکات شوێن رەزامەندی ئەو بکەوێت, بۆ رێگاکانی ئارامی و ئاشتی, دەریان دەهێنێ لە تاریکیەکان بۆ ناو رووناکی بەمەیل و فەرمانی خۆی,

ڕێنماییان دەکات بۆ ڕێگای ڕاست.

٢- ئەوەندە بەسە  فەخرو شانازی بۆ گەورەیی شەریعەتی ئیسلام کە دوژمنانی شاهیدی بۆ دەدەن و کە شەریعەتێکی زیندوو بەردەوامە.. ئەوەش ئێوەو هەندێك لە وتەکانیان, کە چۆن بەجوانی بە شەریعەتی ئیسلامیاندا هەڵداوەو وەسفیان کردووە, بابزانن ئەوانەی کە موسڵمان نین چەند بەویژدانەوە لە پەیامی هەمیشەیی ئیسلام و ڕێنماییە بەرزەکانی دواون؟:

- (غوستان لوبون) لە مامۆستا( لیری)یەوە دەیگێڕێتەوە کە گوتویەتی: ئەگەر عەرەب لە سەر شانۆی مێژوودا دەرنەکەوتنایە ڕاپەڕینی شۆڕشی ڕۆشنبیری ئەوروپا چەند سەدەیەك دوا دەکەوت.

- (لین بول) لە کتێبی (عەرەب لە ئیسپانیا)دا دەڵێت: بەڕاستی ئەوروپای نەخوێندەوار دەورەدرابوو بەنەزانی و بێبەشبوون لە زانست, لە کاتێکدا ئەندەلوس پێشەوا بوو لە زانست و زانیاریدا, وە ئالأی زانست و ڕۆشنبیری هەڵکردبوو.

- (إلياس أبو شبکه) لە کتێبی (پەیوەندی فکری لە نێوان عەرەب و فەرەنگەکان)دا دەڵێت: بەڕاستی نەمانی شارستانیەتی عەرەبی شوم و بەدبەختی بوو بۆ ئیسپانیاو ئەوروپا, ئەندەلوس نەیدەزانی بەختەوەری و خۆشگوزەرانی چییە تەنها لەژێر سایەو سێبەری ئیسلامدا نەبێ, کاتێك دەسەڵاتی عەرەب نەما ئیتر ماڵوێرانی و سەرگەردانی جێگای جوانی و دەوڵەمەندی و بەپیتی گرتەوە.

- (سیدیلوت) لە کتێبی (مێژووی عەرەب)دا دەڵێت: بەڕاستی موسڵمانان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا تاکە نەتەوەو گەلێك بوون کە خاوەنی فەلسەفەو هونەر بوون, هەر شوێنێکیان ڕزگار کردبێ و پێیان خستبێتە ناوی فەلسەفەو هونەرو زانستیان تێدا بڵاوکردۆتەوە, هەر لەوێشەوە گەشتە ئەوروپاو, بووە هۆی پێشکەوتن و سەرکەوتنی ڕاپەڕینی شۆڕشی ڕۆشنبیری.

- زۆربەی زۆری ڕۆشنبیران بیستویانەو دەیزانن کە فەیلەسوفی بەناوبانگی ئینگلیزی **بەرنادشۆ** چ شایەتیەکی داوە لەو بارەوە, گوێ بگرن چۆن بەیەك وشە دەڵێت: بەڕاستی ئایینی موحەممەد جێگەی ڕێزو پێزانینێکی زۆر گەورەیە ئەوەندە

بەرنامەیەکی زیندوو سەرسامکەرە, تاکە ئایینێکە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان دەگونجێت.. من پێم وایە موحەممەد بەرزگارکەری مرۆڤایەتی ناو ببرێت, پیاوێکی وێنەی ئەو ئەگەر جیهانی نوێی پێ بسپێری بەسەرکەوتووی چارەسەری هەموو گرفتەکانی دەکات!!.

- ئەم وتانەو چەندەهای تریش بەڵگە لەدوای بەڵگە دەدەنە دەست هەموو خاوەن عەقڵ و بەرچاو روونێك کە چەندە ئیسلام دەوری کاریگەری هەبووە لە پێشکەوتنی شارستانیەتیدا, خاوەنی دروشمی بەرەو پێش بردنی تەواوە, خاوەنی زانست و زانیاریی زیندوو هەمیشەییە.. لە هەمووی چاکترو گەورەتر ئەوەیە بەویژدانەکان دانیان پێدا ناوەو دوژمنان شایەتیان بۆ داوە:

**شهد الأنام بفضله حتى العدا**

**والفضل ما شهدت به الأعداء.**

٣- لە کاتێکدا کە شەریعەتی ئیسلام ئایینی خواپەرستی و, گشتییە, تایبەتمەندە بەنوێگەرایی و بەردەوامی, ئایا دروشمەکانی گشتگیرو تەواون و بەخشینە زیندووەکانی بۆ هەموو کات و سەردەمێکە, یا تەنها فکرەیەکن لە زەینداو, بیردۆزێکن لەناو لاپەڕەی کتێبەکاندا نووسراون, یان سەلمێنراوەو بەرجستەبووە بەکردەوە لەناو میللەتی ئیسلامداو, بەچاو بینراوە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە با گوێ بگرین لە سەید قوتب بزانین چی دەڵێت: (موحەممەدی کوڕی عبداللە صلى الله علیه وسلم ئەو رۆژە سەرکەوتنی بەدەستهێنا کە هاوەڵەکانی رەزای خوایان لەسەر بێ وا پەروەردە کرد وێنەیەکی زیندوو بن لە باوەری ئەو.. خواردنی دەخوارد, دەگەڕا بەبازاڕدا, ئەو رۆژەی هەر یەکێك لەوان بوو بووە قورئانێکی زیندوو بەسەر زەویدا دەڕۆشت, وە هەموو تاکێك لەوان نمونەیەکی بەرجستەبوو لە ئیسلام, خەڵك دەیبینین ئیسلامیان دەبینی, بەبینینی ئەوان ئیسلامیان بیردەکەوتەوە.

بەراستی دەقەکان بەتەنها هیچ شتێ دروست ناکەن, کتێب بەتەنها کار ناکات هەتا نەبێتە پیاو, دروشمەکان بەتەنها ناژین هەتا نەبنە ئاکارو رەوشی بەرز.

پاشان مەبەستی موحەممەد صلی الله علیه وسلم ئەوە بوو پیاوانێکی وەها دروستبکات بانگەواز بکەن بۆ بەرنامەی خوا, ئامۆژگاری خەڵك بکەن و وتاری جوانیان بۆ بدەن, ویژدانیان بجولێنن و لەخەوی غەفلەت بێداریان کەنەوە, نەك هەر وتارەکان برازێننەوە, ئوممەت بونیاد بنێن لەسەر ئیسلام نەك لەسەر فەلسەفە, سەرچاوەی ئەو فکرەیەش قورئانی پیرۆز زامن و کەفیلی بێ, کارو کرداری موحەممەد صلی الله علیه وسلم ئەوە بوو فکرەی رووتی دەگۆڕی بۆ پیاوانێك بەچاو ببینرێن و دەستیان بەرکەوێ..

موحەممەد صلی الله علیه وسلم ئەو رۆژە سەرکەوت بە فیکری ئیسلامی پیاوانێکی پەروەردەکرد بەکردەوە ئیمانیان بەئیسلام هەبوو, دەیەهاو پاشان سەدەهاو هەزارەها نوسخە قورئانی کۆپی کرد, نەك لەسەر لاپەڕەی کتێبەکان و تەنها مەرەکەبی سەر پەڕەکان بێ بەڵکو بەنور لەسەر پەڕەکانی دڵیان نووسی, بڵاویکردنەوە بەسەر زەویدا تاکو هەڵس و کەوتی جوان لەگەڵ خەڵکدا بنوێنن زانست و زانیاریان پێ بگەیەنن و بەخشندە بن, بە کارو کردەوە ئەیان گوت ئا ئەمەیە ئەو ئیسلامەی کە موحەممەدی کوڕی عبدالله صلی الله علیه وسلم هێناویەتی لەلایەن خواوە)[1].

هەر کەسێك دەیەوێ شتێك لە پەروەردەی کۆمەڵی یەکەم لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بزانێ و, ئەوانەی لە دوای ئەوان هاتن بە چاکی, با مێژوو بخوێنێتەوەو گوێ بگرێت بۆ فەزڵ و بەخشندەییان و کاری زۆرو گەورەی بەجێیان و بینینی جێ دەستیان.

ئایا لە دنیادا هیچ گەل و هیچ کەسێ دەناسی لەوان بەرێزترو جوامێرتر بێ, وەك ئەوان بەبەزەیی و نەرم و نیان بێ, شکۆمەندو گەورەتر بێ , بالاترو زاناتر بێ ؟!

ئەوەندە بەسە بۆ ئەوان شەرەف و فەخرو شانازی و جاویدانی کە قورئانی پیرۆز دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿**مُحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ..**﴾. **الفتح٢٩**. واتە: موحەممەد پێغەمبەری خوایە ئەوباوەڕدارانەی کە

[1] - من كتاب(دراسات الأسلامية)للشهيد سيد قطب فصل(إنتصار محمد بن عبدالله).

لەگەڵیدان بەرامبەر بێباوەڕان توندو تیژن و, لە نێوان خۆیاندا بەبەزەیین, دەیان بینی لە کڕنوش و سەجدەدان, داوای بەهرەو ڕەزامەندی خوا دەکەن, نیشانەیان لەناو چاوانیاندا دیارە, بەهۆی زۆری سەجدە بردنیانەوە..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**كَانُوا قَلِيلًا مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُون* وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُون* وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ** ﴾. **الذاريات: ١٧-١٩.** واتە: شەوانە کەمتر دەخەوتن, زۆربەی کاتی شەویان بە شەو نوێژ بەسەر دەبرد, وە لە بەرەبەیاندا داوای لێ خۆشبوونیان دەکرد, لە ماڵ و سامانیاندا بەشێکی دیاری و بەرچاو هەبوو بۆ بێ بەشان و ئەو کەسەی داوا ئەکا.

هەروها دەفەرموێت: ﴿**وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ**﴾. **الحشر٩.** واتە: ئەو کەسانەش کە بەر لەوان لە مەدینە نیشتەجێبوون و بە دڵ بڕوایان هێنا, حەز بەو ئاوارانە دەکەن کە پەنایان پێ هێناون و بە دڵیش ئیرەیی و حەسودی نابەن بەوەی کە بەوان دراوەو ئەوان لە پێشتر دەزانن, هەرچەندە دەست تەنگیشیان هەیە, کەسانێکیش خۆ لە ڕژدی دەپارێزن , ئەوانە رزگارەکانن.

وە دەفەرموێت: ﴿**مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً**﴾. **الأحزاب٢٣**. واتە: لەناو باوەڕداراندا پیاوانی وایان هەبوو, ئەو پەیمانەی بەخوایان دابوو, ڕاستیان لەگەڵ کردوو, زۆر بەباشی پابەندبوون پێیەوە, کاتێکیش کەوتنە جەنگەوە مەردانە جەنگیان کرد, ئینجا بووشیان نەزرو پەیمانی خۆی بردەسەرو, جەنگاوەرانە جەنگی کرد تا شەهیدکرا, هەشیان بوو هەر چاوەڕوانی شەهیدی بوو لەرێی خوا, بەهیچ جۆرێك کلا نەبوون و پەیمانی خۆیان نەگۆڕی.

ئەمەش دڵۆپێك بوو لەدەریای بێ پایانی فەزڵ و بەخشندەیی بەجێیان, جوانی ڕەوشت بەرزی و سوپاسکراویان, بەکردەوە سەلماندیان و کۆمەڵگەیەکی گەورەو پێشکەوتووی وایان دروستکرد کە موفەکیرو بیریارەکان خەویان پێوە دەبینی, لە

کۆنەوە هیواو ئاواتی فەیلەسوەکان بوو..

جا چۆن وانابێ, قازی دووساڵ لە ناویاندا دانیشتبوو بێ ئەوەی دوو کەس کێشەیان هەبێ بچنە لای؟ کێشەیان چۆن دەبێ قورئان لەبەر دەستیاندا بوو پەیڕەویان دەکرد؟ چۆن جیاوازی و دووبەرەکی دەکەوێتە نێوانیان لە کاتێکدا ئەوەی بۆ خۆیان پێیان خۆشبوو بۆ برا موسڵمانەکەشیان پێیان خۆشبوو؟ بۆچی رق و کینەیان لە یەکتر دەبێ لە کاتێکدا ئیسلام فەرمانی پی‌دەکردن بەخۆشەویستی و برایەتی, هانی دەدان بۆ خۆنەویستی و سۆزو بەزەیی بەرامبەر بە یەکتر؟

ئەوەش ئێوەو وتەی هاوەڵی بەڕێز ئیبن مەسعود رەزای خوای لێ بێ لەبارەی فەزڵ و گەورەیی و هاوەڵان و, واجبی شوێنکەوتنی کرداری چاك و ئاکارو بەرزیانەوە دەفەرموێت: (ئەوەی شوێن سوننەت و ئاکارو رەوشتی جوان دەکەوێت با شوێنی ئەوە بکەوێ کە مردووە, چونکە زیند و پارێزراو نیە لە بەڵاو فیتنەی دنیا, ئەوانەش هاوەڵانی پێغەمبەر بوون صلی الله علیه وسلم کە باشترین کەسی ئەم گەلە ئیسلامیە بوون, خاوەنی دڵ و دەروونێکی پاك و چاك بوون, زانیاریەکی قوڵیان هەبوو, تەکلیفیان کەم بوو, خوای گەورە هەڵیبژاردن بۆ هاوڕێیەتی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم و گەیاندنی ئایینەکەی, بۆ ئەوەی فەزڵیان بزانن, شوێن پێیان هەڵگرن و لەسەر رێگە و رێبازیان بڕۆن, چونکە ئەوانە لەسەر رێگای هیدایەتی راستەقینە بوون).

٤- بەدرێژایی مێژوو نەوەکانی ئیسلام لە سەرچاوەی فەزڵ و گەورەیی ئەوان ئاویان دەخواردەوە, بەنوری بەخشندەیی و رەوشتە بەرزەکانی ئەوان دەدرەوشانەوە, لەسەر رێبازو بەرنامەی پەروەردەیی ئەوان پەروەردە دەبوون, لەسەر بینای سەربەرزی و شکۆمەندی ئەوان دەڕۆشتن.. تا گەشتنە ئەو سەردەمەی حوکمی ئیسلامی لەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامی گەمارۆ درا, مەشخەڵی خەلافەتی ئیسلامی نەما لەسەر زەویدا.. ئەو کاتە دوژمنانی ئیسلام توانیان بەئاسانی بگەنە مەررام و مەبەستی پیس و گلاویان, جیهانی ئیسلامیان لە یەکێتی و برایەتیەوە گۆڕی بۆ پەرتەوازەیی و دووبەرەکی و پارچ پارچەبوون, فڕێیان دانە ناو گێژاوی هەواو هەوەسەوە, چڵێس و

چاوبرسیان کردن, دروشمی جیاجیان خستە ناویانەوە, پەلکێشیان کردن بەدوای ئارەزووی بەرەڵایی و بەدرەوشتی بێسەروبەرەیی, ئەوانیش بەبێ ئامانج و مەبەست ملی ڕێگەیان گرت و ژیانیان بردەسەر بەبێ ئەوەی هەوڵێك بدەن بۆ سەربەرزی و یەکێتی و بوونیان هەبێ..

وات دەزانی کۆن و پێکەوەن لە کاتێدا دڵیان جیابوو پەرتەوازە بوون, وات دەزانی بەهێزن بەڵام وەك کەفی سەر دەریاو پوش و پەڵاش وابوون, هەتا زۆربەی پیاوانی چاکەخواز, ئەوانەی بانگەشەیی خەڵکیان دەکرد بۆ بەرنامەی خوا تووشی بێ هیوای و نائومێدی بوون, پێیان وابوو ئیتر هیچ ڕێگا چارەیەك نەماوە بۆ چاکسازی ئەم گەلەو, هێنانەوەو گەڕانەوەی ئەو سەربەرزی و گەورەیی و کیانەی جارانی.. بەڵکو هەندێك لەوانە بانگەوازیان دەکرد بۆ, پابەندبوون بە وازهێیان لە تێکەڵاوی خەڵك و خزانە ناو کونجی ماڵەکانەوەو, گۆشەگیری تەواو, گومانیان وابوو ئیتر ژیان کۆتایی پێدێ و قیامەت هەڵدەسێ, ئیتر کاتی ئەوە هاتووە موسڵمان بەخۆی و ئایینی و هەندێ مەڕو ماڵاتەوە دەرچێ بەرەو لوتکەی شاخەکان, لەتاو ئاژاوەو ئاشوب و فەرتەنە, هەتا مردن یەخەی پێدەگرێ.

ئەم بیرو بۆچوونی بێ هیوایی و نائومێدیەش لە ئەنجامی ئەم سێ هۆکارەوەیە:

أ- لە ئەنجامی نەزانی بە تەبیعەت و سروشتی ئەم دینە.

ب- لە ئەنجامی خۆشەویستی دنیاو رق بوون لە مردن.

ج- لە ئەنجامی نەزانی ئەو مەبەست و غایەیەی کە موسڵمان لە پێناویا خولقاوە.

أ- کاتێك کە موسڵمانان تێگەیشتن لەوەی کە ئایینی ئیسلام ئایینی هێزەو دروشمیش لەمەدا ئەم ئایەتەیە: **﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ﴾.الأنفال: ٦٠**. واتە: هەرچی لەتواناتاندا هەیە لە چەك و کەرەسەی جەنگی ئامادەی بکەن..

کاتێك کە تێگەیشتن لەوەی کە ئیسلام ئایینی زانست و زانیاییە: زانست و زانیایی شەرعی و گەردوونی بەیەکسانی, دروشمیش لەمەدا ئەم ئایەتەیە: **﴿وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾.طه ١١٤**. واتە: بڵێ ئەی پەروەردگارم زانست و زانیاریم زیاد بکە.

کاتێك کە تێگەیشتن لەوەی کە ئیسلام ئادەمیزادی کردووە بەجێنشین نەوە لەدوای

نەوە لەسەر زەویدا کە جڵەوی کارو باری بگرێتەدەست و شاراوەکانی دەربهێنێ و, ئاگاداری هەموو نهێنیەکانی بێ, دروشمیش لەمەدا: ﴿**وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ الْأَرْضِ..**﴾.**الأنعام: ١٦٥**. واتە: خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی کردووە بەجێنشینانی سەر زەوی نەوە لەدوای نەوە..

کاتێك کە تێگەیشتن لەوەی کە ئیسلام ئایینێکە ڕێزی داناوە بۆ ئادەمیزاد, فەزڵ و ڕێزی داوە بەسەر زۆربەی بەدیهێنراواندا, بۆ ئەوەی هەستێ بە ئەرکی بەرپرسێتی و, ئەو کارە گرنگەی پێی سپێراوە بەکارامەیی و لێهاتویەوە, دروشمیش لەمەدا: ﴿**وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا**﴾.**الإسراء: ٧٠**. واتە: بێگومان ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت و لە وشکانی و لە دەریادا هەڵمانگرتن, ڕۆزی پاکژمان پێداون, لە چاو زۆر لەکردەی خۆمان زۆر پتر قەدرو ڕێزمان گرتوون.

کاتێك کە تێگەیشتن لەوەی کە ئیسلام مرۆڤی کردۆتە بەرپرس لە عەقڵی, وە بەرپرس لە هەموو هەستیارەکانی, ئەگەر هەستان بە پەکخستن و فەرامۆشکردنیان, دروشمیش لەمەدا: ﴿**وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا**﴾.**الإسراء: ٣٦**. واتە: مەکەوە شوێن شتێکی وا کە نازانی چییەو چۆنە, چونکە گوێچکەو چاوو دڵیش گشتیان پرسیاریان لەسەرە.

کاتێك کە تێگەیشتن لەوەی کە ئیسلام ئەم کەونەی بۆ مرۆڤ ژێربار کردووە, بۆ ئەوەی بەکاری بێنێ بۆ خزمەتی زانیاری و, خزمەتی مرۆڤایەتی, دروشمیش لەمەدا: ﴿**وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ..**﴾.**الجاثية: ١٣**. واتە: ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ژێربارکردووە.

کاتێك کە تێگەیشتن لەوەی کە ئیسلام ئایینی ڕامان و بیرکردنەوەیە لە دروستکراوانی ئاسمانەکان و زەوی بۆ گەیشتن بەحەقیقەتی جێگیرو دامەزراو, دروشمیش لەمەدا: ﴿**قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ..**﴾.**يونس: ١٠٢**. واتە: بڵێ بەوردی سەیرێکی ئاسمانەکان و زەوی بکەن..

کاتێك کە تێگەیشتن لەوەی کە ئیسلام ئایینی کردەوەو, چالاکی و ژیانەوەیە,

دروشمیش لەمەدا: ﴿**هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ**﴾. **الملك: ١٥.** واتە: ئەو خوایە زەوی بۆ رامکردوون, بەهەر شێوەیەك بتانەوێ سوودی لێ وەربگرن ئامادەیە, وە لەگەڵ ئەو هەموو جم و جووڵەو سوڕانەوەیەدا, ئێوە زۆر بەئاسودەیی ژیانی خۆتانی تێدا دەبەنەسەر, جا کەوا بوو بچن بەهەموو گۆشەو کەنارێکیا هەوڵی ژیانی خۆتان بدەن و بازرگانی بکەنە پیشە, وە لە رزق و رۆزی بخۆن, هەر بۆ لای خوایە زیندوو بوونەوە بۆ حیساب و جەزا.

کاتێك کە تێگەیشتن لەوەی کە ئیسلام ئایینێکە نائومێدی قەدەغەکردووە, رێگری کردووە لە بێ هیوایی, دروشمیش لەمەدا: ﴿**إِنَّهُ لَا يَيْأَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ**﴾. **یوسف: ٨٧.** واتە: هەرگیز نائومێد نەبن لە رەحم و بەزەیی, چونکە مەگەر هەر خوانەناس و بێباوەڕان لە رەحم و میهرەبانی خوا بێ هیواو نائومێد بن.

کاتێك کە تێگەیشتن لەوەی کە ئیسلام ئایینی رێزو کەرامەتە, پێویستە لەسەریان رووی تێ بکەن و ئاڵاکەی لە جیهاندا بەرزکەنەوە, دروشمیش لەمەدا: ﴿**يَقُولُونَ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ**﴾. **المنافقون: ٨.** واتە: ئەڵێن: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بێگومان دەسەڵاتدارو بەڕێز, خەڵکە رووت و لاتەکەی لێ دەردەکەن, دەسەڵاتیش هەر بۆ خواو بۆ پەیامبەرەکەی و بۆ باوەڕدارانە, بەڵام دووڕووەکان هیچ نازانن, چونکە رێی راستیان لێ چەواشەبووە.

رۆژێك کە موسڵمانان تێگەیشتن لە هەموو ئەمانەی کە باسکران, خەڵکن تەبیعەت و سروشتی ئەم دینەو حەقیقەتی ئایینی ئیسلامیان ناسی بەو شێوەیە- لەسەروی هەموویانەوە ئەوانەی کە بانگەواز دەکەن بۆ لای بەرنامەی خوا- ئەو کاتە نائومێدی و بێ هیوایی روویان تێ ناکات, بەڵکو بەرەو گۆڕپان و مەیدانی بانگەوازو چاکسازی و بیناکردن هەنگاو هەڵدەگرن.. بۆ گێڕانەوەو هەێنانەوەی ئیسلام - هەر وەك چۆن پێشینە چاکەکان- مامۆستا بوون بۆ جیهان و, بوونە هیدایەت دەری گەلان و, مەنارەی بەرزی رووناك و درەوشاوە بوون لەناو تاریکایی ژیاندا.. مرۆڤایەتی لە کانیاوی زانیاری ئەوان تێراو دەبوون, بەدرێژایی مێژوو لە سەرچاوەی مەعاریف و

شارستانیەتی ئەوان سوودیان وەردەگرت, تا ئەو کاتەی خوای گەورە زەوی و هەرچی لەسەر زەویدایە دەیبەخشێتە بەندەکانی.

ب- ئەو رۆژەی موسڵمانان - لەسەروی هەموویانەوە زانایان و ئەوانەی کە بانگەواز دەکەن بۆ لای بەرنامەی خوا- رزگاریان بوو لە خۆشەویستی دنیاو پشت پێ بەستنی, وە لە رۆچوون لە نازو نیعمەتەکاندا.. بوونە هیدایەت دەری خەڵك, چاکسازیان لەناو کۆمەڵگەدا کرد, هەوڵیاندا بۆ گەڕانەوەو پیادەکردنی حوکمی خوا لەسەر زەویدا.. غەم و پەژارەی گەورەیان ئەوە بوو, هەموو غایەو مەبەستێکیان هەر بە تەنها ئەوە بوو, نیەت و لێبڕانیان هەبوو بەعەزم و جەزمەوە رۆشتن بەرەو پیری, ئەو کاتە سەربەرزی دنیاو قیامەت دەبن.

ئەو رۆژەی موسڵمانان رزگاریان بوو لە ترسنۆکی و, رق بوون لە مردن, لە کانگای دڵیانەوە باوەڕیان هەبوو بەوە کە رزق و رۆزیان تەنها لەلایەن خواوەیەو, هەر ئەوە سوود و زیانیان پێ دەگەیەنێ, ئەگەر بیەوێ شتێکیان پێ ببەخشێ کەس ناتوانێت رێگری لێ بکات و پێیان نەگات, ئەگەر بیەوێت شتێکیان پێ نەگات کەس ناتوانێ پێیان بگەیەنێ, ئەگەر هەموو خەڵك کۆببنەوەو بیانەوێت سوودێکیان پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر ئەو سوودە خوای گەورە لەسەری نووسیبێ, ئەگەر هەموو خەڵك کۆببنەوەو بیانەوێ زیانێکیان پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر ئەو زیانە خوای گەورە لەسەری نووسیبێ,

ئەو رۆژەی موسڵمانان دڵنیا بوون بەمەو خۆیان رزگارکرد لە هۆکارەکانی تەمەڵی و سستی و لاوازی, ئەو کاتە ئەچنە ناو مەیدانی بانگەواز بۆ لای ئاین و بەرنامەی خواو, بوارەکانی پەروەردەو ئاراستەو چاکسازیەوە, ئازاو بوێر دەبن و ناترسن, پەیامەکانی خوا رادەگەیەنن و لە خوا زیاتر لە کەسی تر ناترسن, بەڵکو بەهەموو دڵێکیانەوە متمانەیان بەخوای خۆیان دەبێ کەسەرکەوتوویان کات, بیانکات بە دەسەڵاتدار لەسەر زەویدا, ترس و لەرزەکەیان بۆ دەگۆڕێ بە هێمنی و ئارامی, لەدوای پەرتەوازەیی کۆیان دەکاتەوەو یەکێتی و برایەتی دەخاتە نێوانیانەوە, وە لەپاش زەلیلی و ژێردەستەیی دەیانکاتە خاوەنی عیزەت و گەورەیی, ئەوەش بۆ خوا گران و

زەحمەت نیەو هیچی تێ ناچێ, ئەگەرئەوان نیەت و مەبەستەکانیان راستکەنەوە, پەیمان بدەن بەهیممەت بن و سوربن لەسەر بەرنامەی خوا, خۆیان رزگارکەن لە ترس و نائومێدی و خۆشەویستی دنیا..!!

ج- رۆژێك موسڵمانان زانیان لەم ژیانەدا لە پێناوی غایەو مەبەستێکی پیرۆزو بەرزدا خولقاون, ئەم غایەو مورادەش خوای گەورە لە قورئاندا بڕیاری لەسەر داوە لە کاتێکدا کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾. **الذاريات:٥٦**. واتە: من هەر بۆیە جنۆکەو ئادەمیم دروستکردووە بم ناسن و بم پەرستن.

بەڵام ئایا ئەو پەرستشەی کە خوای گەورە دەیەوێ لێمان و, فەرمانمان پێدەکاو, هانمان دەدات لەسەری کامەیە؟ بێگومان گەردنکەچی و فەرمانبەرداریە بۆ بەرنامە جێگیرو دامەزراوەکەی و رێگا راستەکەی.

بەراستی هەڵگرتنی ئەو سپاردەو ئەمانەتەیە کە خوای گەورە نیشانی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکانیداو پێشنیاری کرد بۆیان بەڵام هیچیان رازی نەبوون بەهەڵگرتنی ئەو سپاردەیەو ترسان لێی.

بێگومان تەکلیفێکی بەردەوامە بۆ رزگارکردنی بەندەکانی خوا لە بەندایەتی بەندەوە بۆ بەندایەتی خوا, لە تەنگەلانی دنیاوە بۆ بەرفراوانی, لە زوڵم و ستەمی ئایینەکانەوە بۆ ئایینی پڕ لە دادپەرەری و عەدالەتی ئیسلام.

بێگومان بەخشینی خۆشەویستییە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران.

رەتکردنەوەی ئەو بیروباوەڕو دروشمانەیە کە پەیوەندیان نیە بەشەریعەتی ئیسلامەوەو لێی دوورن.

ئا ئەمەیە ئەرکی گەورەو گرنگی موسڵمان لەم سەر زەویەدا, ئەوەیە غایەی لە ژیاندا, کاتێك موسڵمان خۆشەویستی تەنها بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران هەبوو ئەو کاتە بەندەی خوایە, کاتێك هەستا بەهەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە بە ئیمان و باوەڕەوەو سوربوو لەسەری بەراستی ئەو کاتە بەندەی خوایە, لە کاتێکدا رازی نەبوو بەهیچ بەرنامەو شەریعەتێك غەیری بەرنامەو شەریعەتی دینەکەی خوا ئەو کاتە دەبێتە بەندەی خوا, لە کاتێکدا بەردەوام لە جوڵەو تێکۆشاندا بوو بۆ رزگارکردنی

بەندەکانی خوا لە بەندایەتی بەندەوە بۆ بەندایەتی خوا, لە تەنگەلانی دنیاوە بۆ بەرفراوانی, لە زوڵم و ستەمی ئایینەکانەوە بۆ ئایینی عەدالەتی ئیسلام, ئەو کاتە دەبێتە بەندەی خوا.

ئاگاداربن ئەگەر وانەبوو.. ئەوە ئەو کاتە فەرامۆش دەکرێ و دەکەوێتە ناو رابواردنە هیچ و پوچەکانی دنیاوە, دەبێتە بەندەی هەواو ئارەزوو, بەندەی شەیتان و غەیری خوا, بەندەی نائومێدی و نەبزوتن و بێ هیوایی.. هەنگاو دەنێت کوێرانە بەبێ غایەو مەبەست, بێسەرو بەرەیی بەبێ رێنمای و هیدایەت, دەکەوێتە ناو گێژاوەوە بەبێ بەڵگەو نیشانە: ﴿ **أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ**﴾.**الأنعام: ١٢٢.** واتە: ئاخۆ کەسێ کە مردوو بوو ئێمە زیندوومان کردەوەو رووناکیەکمان خستە پێشی, بەسەربەستی لوناو خەڵکدا بخولێتەوە, ئایا وەك ئەوە وایە لەناو تاریکیدایەو هیچ دەرەتانێکی نیە؟ ئەو کەسانەی خوا نەناسن کارەکانیان لەبەر چاوی خۆیان جوانە.

کەواتە با موسڵمانان سروشت و تەبیعەتی ئایینی خۆیان بناسن.

خۆیان رزگارکەن لە خۆشەویستیی دنیاو رق بوون لە مردن.

ئەو غایەو مەبەستە بزانن کە لە پێناویدا دروستکراون و, لەسەر ئەو بنەمایە هاتوونەتە بوون.

تاکو راپەڕن بۆ هێنانەوەی حوکمی ئیسلام سەر لە نوێ و, بەرزی و شکۆمەندی لەناو چوو دەسەلاّتی زەوتکراوو, هێزی مەزن و یەکێتی گشتی و تەواویان جارێکی تر بگێڕنەوە, ئەوەش لای خوا قورس و گران نیە.

٥- بەلاّم ئایا رێگا چارە چییە بۆ چاکسازی؟ سەرەتای راست و دروست چییە بۆ بونیادنان و دروستکردنی گۆمەڵگەیەکی چاك و پێشکەوتوو؟ ئەرکی کاری بەبەهاو بەنرخ چییە لەسەر شانی باوکان و پەروەردەکاران ؟ پیاوانی پەروەردەو چاکسازی لەم سەردەمەدا ؟ هەموو ئەم پرسیارانە لەراستی و حەقیقەتدا بەدەوری یەك خولگەدا دەخولێنەوە, یەك غایەو مەبەستیان هەیە..

ئەوەی بەدەوری یەك خولگەدا دەخولێتەوە ئەوەیە: هەر کەسێك ئەرکی گەورەی

چاکسازی دەگرێتە ئەستۆ, گرنگی دەدات بە کاروباری پەروەردە.. هەوڵبدات و ئەوەی لە توانایدا هەیە بیخاتەکار بۆ گۆڕینی ئەو رووداوە تاڵانەی کە زۆربەی خەڵك تێوەی گلاون, بۆ ئەوەی گۆمەڵگەیەکی پڕ لە خۆشی و کامەرانی و گونجاو بەچاوی خۆی ببینێ.

وە ئەوەش کە یەك غایەو مەبەستی هەیە ئەوەیە: ئەوانەی لە بواری پەروەردەو ئاراستەکردن و چاکسازیدا کاردەکەن, هێزی خۆیان بخەنەکار بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی چاك, گەلێکی ئیمان پتەو, بەهێز لە رەوشت بەرزیدا, جەستەی چالاك و بەهێز, بەهێز لە زانیاریدا, دەروون بەرز.. بۆ ئەوەی بتوانێت بگاتە لوتکەی سەرکەوتنی گەورە, یەکێتی گشتی و تەواو, شکۆمەندی گەورەو بەرفراوان!!..

بەڵام کێ خاوەنی ئەم هەموو توانایەیە؟ هۆکارەکانی رێکخستن و قۆناخەکانی پەیڕەوکردنی کامانەن؟ وەڵامەکەی تەنها یەك وشەیە ئەویش وشەی (پەروەردەیە).

بەڵام ئەم وشەیە ماناو ناوەڕۆکی زۆر گەورەی هەیە, بوارو لایەنەکانی فراوانن, تێگەیشتنەکانی گشتی و تەواون!!..

ناوەرۆك و تێگەیشتنەکانی ئەمانەن: پەروەردەی تاك, پەروەردەی خێزان, پەروەردەی کۆمەڵگە, پەروەردەی مرۆڤایەتی..لەژێر هەر بابەتێك لەم بابەتانە چەند جۆر بەش و ناونیشانێ هەیە, هەمووشیان ئامانجیان دامەزراندن و دۆزینەوەی کۆمەڵگەیەکی چاك و, گەلێکی نموونەییە.

پەروەردەی منداڵانیش لقێکە لە پەروەردەی تاك کە ئیسلام هەوڵ دەدات بۆ ئامادەکردن و دروستکردنی بۆ ئەوەی ببنە ئەندامێکی سوودبەخش و, مرۆڤێکی چاك بۆ ژیان.

٦- خوێنەری بەڕێز ئەم کتێبەی لەبەر دەستتدایە, رۆشنکەرەوەی بەرنامەی گشتی و راست و دروستی پەروەردەیی منداڵانە لە ئیسلامدا.. ئەگەر خوای گەورە یارمەتیدای خوێندتەوە ئەو کاتە تێدەگەی کە شەریعەتی ئیسلام چەندە گشتی و گەورەو بەنرخە, گشتگیرو کاملە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤایەتی بەختەوەر دەکەن لە دین و دنیاو قیامەتدا, هەروەها بۆت دەردەکەوێ کە ئیسلام خاوەنی

پەروەردەو بەرنامەی چاکسازی خۆیەتی.. ئەگەر پەروەردەکاران پەیوەست بن بەو رێچکەو بەرنامەوە, ئەوا گەل هەست بەهێمنی و بەئارامی و بەختەوەری دەکا لە جیاتی ئاژاوەو فەوزاو ترس و بەدبەختی.. هەروەها بۆت روون و ئاشکرا دەبێت کە ئیسلام ئایینی ژیانە, ئایینی مرۆڤایەتیە, ئایینی هۆشیاری و چاکسازی و پەروەردەییە.. هەر کاتێك مرۆڤایەتی شوێن هیدایەت و رێنماییەکانی کەوت, گەلان لە سەرچاوەی تێراو بوون, دەوڵەتان دەستیان گرت بە دروشم و شەریعەتەکەیەوە, بەراستی ئەو کاتە ئاشتی باڵ دەکێشێ بەسەر جیهاندا, مەشخەڵی کۆمەڵگەیەکی چاك بەچاو بە ئاشکرا دەبینرێ, خەڵك لەسایەو سێبەریدا بەخۆشی و شادی دەحەوێنەوەو ژیان دەبەنەسەر!!.. بۆچی؟.. چونکە ئایینی پەروەردگاری جیهانیانە, پەیامی فەخرو شانازی مرۆڤایەتییە صلی الله علیه وسلم, شەریعەتێکی گشتی و شامل و کاملە کە خوا خۆی پێی رازییە ببێتە دەستورو بەرنامە بۆ مرۆڤایەتی.

٧- تێبینی کتێبخانەی ئیسلامی هەژارە لە بارەی کتێبی پەروەردەی منداڵان لە ئیسلامدا, تا ئێستا رێم نەکەوتووە لە کتێبێکی گشتی و شامل و کامل و سەربەخۆ کە باسی پەروەردەی منداڵ بکات لە کاتی لەدایك بوونیەوە تا دەگاتە تەمەنی لاوی و تەکلیفی دەکەوێتەسەر, مەگەر کتێبی( تحفه المولود فی أحکام المولود) کە ئیبن قەیم رەحمەتی خوای لەسەر بێ نووسیویەتی, ئەویش تەنها باسی لەدایك بوونی منداڵ دەکا لەگەڵ ئەو یاساو ئەحکامانەی کە پێوەی بەندن, لەبەندی سێەم و دوای ئەو لەبەشی یەکەمی ئەو کتێبە سوودێکی زۆرم وەرگرتووە, خوای گەورە چاکترین پاداشتی خێرو چاکەی بداتەوەو, پلەو پایەیەکی بەرزی پێ ببەخشێ لە قیامەتدا.

خوا خۆی دەزانێت چەندە هەوڵم داوەو ماندوو بووم پێوەی! چەند گەڕاوم بەدوای سەرچاوەدا بۆ ئەوەی بۆ خوێندەوارانی عەرەب کتێبێکی گشتی و سەربەخۆ هەبێ باسی پەروەردەی منداڵیان بۆ بکات لە کاتی لەدایك بوونیەوە تا دەگاتە تەمەنی لاوی و تەکلیفی دەکەوێتەسەر.. هەروەها بەرنامەیەکی تەواوە پێویستە باوکان و پەروەردەکاران و ئەوانەی حەقی پەروەردەو ئاراستەکردنیان لە ئەستۆدایە لەسەری برۆن.

سوپاس بۆ خوا کتێبەکە هەدەفی خۆی پێکاوە, بەدرێژی باسی هۆکارو مەبەستەکانی تێداکراوە.. ئەمەش بانگەواز نیە بۆ تەواوی و بێ کەموکوڕی ئەوەی نووسیومە, بەڵام داواکارم لە خوای پاك و بێگەرد ئەم سەرەتایە بکاتە هاندانێ بۆ پێشەوایانی فیکری ئیسلامی لەم سەردەمەدا بۆ ئەوەی ئەوانیش دەست وبرد بکەن و قەڵەمەکانیان بخەنەکار.. بۆ نووسین و لێکۆڵینەوەی زۆرو روونکردنەوەی هۆکارەکان و غایەو مەبەستەکان لە بواری پەروەردەی منداڵاندا.. تاکو کتێبخانەی ئیسلامی لە ماوەیەکی کەمدا دەوڵەمەند بێت بەکتێبی پەروەردەیی و, لێکۆڵینەوەو رێنمایی..بۆ ئەوەی ببنە سەرچاوەیەکی تەواو بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت شوێن چاکترین رێگا بکەون بۆ ئامادەکردنی منداڵ و پەروەردەکردنی ئیسلامیانەو, پێگەیاندنی لەسەر پەروەردەیەکی رۆحی و فکری و رەوشتی..کاتێك ئەوانەی کاردەکەن توانایان یەکخست و بوونە یارمەتیدەری یەکتر بۆ نووسینی پەروەردەی ئیسلامی, هەستان بەو ئەرك و بەرپرسێتیەی سەرشانیان.. ئەو کاتە نەوەی ئێستا دەخەنەسەر رێگای سەربەرزی و بەهێزی, روونی دەکەنەوە بۆ ئەوانەی دوو چاویان هەیە لەنەوەی مرۆڤایەتی ئەو هۆکارە زانستیانەی کە دەبنە هۆی دامەزراندن و بونیادنانی کۆمەڵگەیەکی پەسەندو, نەوەیەکی نموونەیی.

٨- ئەم کتێبە (پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام) دا لە سێ بەشی یەك لەدوای یەك پێکهاتووە, هەموو بەشێکیش لە چەند بەندێك پێکهاتووە, هەر بەندێکیش لە چەند ناونیشانێك, بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

بەشی یەکەم: لەم چوار بەندانە پێکهاتووە:

بەندی یەکەم: هاوسەری نمونەیی و پەیوەندی بەپەروەردەوە.

بەندی دووەم: هەست و سۆزی دەروونی لای منداڵان.

بەندی سێیەم: ئەحکامە گشتیەکانی ناونانی منداڵ, ئەویش لەم چوار باسانە پێکهاتووە:

باسی یەکەم: کاری یەکەم رۆژی منداڵ بوون.

باسی دووەم: ئەحکامەکانی ناونانی منداڵ.

باسی سێیەم: ئەحکامەکانی گوێزەبانە(العقیقه).

باسی چوارەم: ئەحکامەکانی خەتەنەکردن(الختان).

بەندی چوارەم: هۆکارەکانی لادانی منداڵان و چارەسەری.

بەشی دووەم: ئەمەش باسێکە بەناونیشانی (بەرپرسیارێتی گەورە لای پەروەردەکاران) ئەویش ئەویش ئەم حەوت بەندانە دەگرێتەوە:

بەندی یەکەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی ئیمانی.

بەندی دووەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی رەوشتی.

بەندی سێیەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی جەستەیی.

بەندی چوارەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی ئەقڵی.

بەندی پێنجەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی دەروونی.

بەندی شەشەم : بەرپرسیارێتی پەروەردەی کۆمەڵایەتی.

بەندی حەوتەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی جنسی.

بەشی سێیەم و کۆتایی: ئەویش لەم سێ بەندانە پێکهاتووە:

بەندی یەکەم: هۆکارەکانی پەروەردەی کاریگەر.

بەندی دووەم: بنەما سەرەکیەکان لە پەروەردەی منداڵاندا.

بەندی سێیەم: چەند پێشنیارێکی پەروەردەیی پێویست.

کۆتایی.

ئەمەش هێڵە بەرفراوانەکانی هەر بەندێك لە هەموو بەشێك لە بەشەکانی ئەم کتێبە بوون, برای خوێنەری خۆشەویست لەژێر هەر بەندێك لە بەندەکان چەند باسێکی گرنگ و چەند ناونیشانێکی بەسوود دەخوێنیتەوە..هەموشیان مەبەستیانە بەرنامەیەکی چاك روونکەنەوە بۆ پەروەردەی راست و دروستی منداڵان, ئامادەکردنی ئەندامانی چاك و صالح بۆ ژیان و سەربازیانێکی بەهێز بۆ خزمەتی بەرنامەی ئیسلام, گەنجانێکی چوست و چالاك کە خاوەنی ئەوپەڕی مانای جوامێری و بەڕێزی و بەخشندەیی و قوربانیدان و گیان فیدایی بن.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورەو پەروەردگار ئەم کارو کردەوەیەم تایبەت

بێت بەپاکی بۆ ڕەزامەندی ئەو, لێم وەرگرێ لەو ڕۆژەدا دەخرێتەروو, ئەم زنجیرە باسانەم بۆ بکاتە ئامڕازی سوود بۆ بەندەکان, بڵێسەیەکی نورو هیدایەت بێ بۆ ئەو کەسانەی ئەیانەوێ لەسەر ڕێگای راست و هیدایەت هەنگاو هەڵگرن, بەراستی ئەمەش چاکترین هیواو ئاواتە, شایانی ئەوەیە وەڵامدانەوەیە.

**عەبدوڵڵا ناصح عەلوان**

# پێشەكی بە پێنوسی زانای گەورەو بەڕێز شێخ وەهبی سولەیمان غاوجی ئەلبانی

١- مامۆستا عبداللە ناصح عەلوانم لەو كاتەوە ناسیوە كە كتێبی یەكەمی بەناوی (**إلى ورثة الأنبياء**)ی نووسی واتە بۆ میراتگرانی پێغەمبەران, پاشان كتێبی(**التكافل الاجتماعي في الإسلام**), (**حتى يعلم الشباب**), (**صلاح الدين**)ی ئەیوبی, هەروەها سەردەمێكە دەیناسیم و لە ڕێگەی وتەكانی و بەشداریكردنی لە بواری كاری پەروەردەو فێركردندا, گوێم لە وتە بەپێزەكانی گرتووە, ئەگەر پرسیارم لێبكەن بەكورتی نووسەرتان پێ بناسێنم دەڵێم: پیاوێكی ئیماندارەو ئاوا دەژی لەنێو چاوانی و هەر چوار لایدا, لەناو دڵ و خوێنیدا ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری صلى الله تعالى عليه وسلم تێدا نووسی بوو: (**من أصبح ولم يهتم بأمر المسلمين فليس منهم**) [1]. واتە: هەر كەسێك ڕۆژی لێ بێتەوەو گرنگی نەدات بەكارو باری موسڵمانان ئەو لەوان نیە.

كاتێك دەیویست زانایان بدوێنێ كە هەستن بەواجبی گەیاندنی ئیسلام بە حیكمەت و ئامۆژگاری جوان و كتێبی(**إلى ورثة الأنبياء**)ی بۆ نووسین, كاتێك دەیویست خەڵك بەگشتی ئاگادار بكاتەوە لە زۆر سەیركردنی تەلەفزیۆن و مەترسی و ئاسەوارە خراپەكانی نامەی(حكم الإسلام فى التليفزيون)ی بۆ نووسین و پاشان برەوی پێداو كردی بە كتێبی(**حكم الإسلام في وسائل الإعلام**), كاتێك دەیویست قسەبكات بۆ قوتابیان كتێبی (**شبهات و ردود**)ی بۆ نووسین.

كاتێك دەیویست قسەبكات بۆ گەنج و لاوەكان كتێبی (**حتى يعلم الشباب**)ی بۆ نووسین. كاتێك دەیویست قسەبكات بۆ ئەوانەی كە كاروباری كۆمەڵگەیان لە ئەستۆدایە كتێبی(**التكافل الاجتماعي في الإسلام**)ی بۆ نووسین. كاتێك دەیویست شارەزای لاپەڕە پرشنگدارو درەوشاوەكانی مێژووی رابردوومان بكات كتێبی(**صلاح الدين الأيوبي**)ی بۆ نووسین. كاتێك دەیویست باسی زانیاری و زانستی فیقهی شەرعی

[1] رواه الطبراني في الأوسط: ٧٦٨٦, سلسلة الضعيفة: ٣١٠.

بكات بۆ موسڵمانان کتێبی (أحكام الصيام) و (أحكام الزكاه..)ی بۆ نووسین.

کاتێك دەیویست کۆمەڵگە رزگاری بێت لە زیانەکانی سەرمایەداری کتێبی (أحكام التأمين)ی نووسی و زەرەرو زیانەکانی خستەڕوو.. بەراستی لەبری ئەوەدا هاوبەرپرسییێتی کۆمەڵایەتی روونکردەوە بۆ خەڵك.

ئێستاش ئەمانەی باسکران هەموویانی لە کتێبی **(تربية الأولاد في الإسلام)**دا کۆکردۆتەوە, خوای گەورە پاداشتی خێرو چاکەی بداتەوە, زیاتر سەرکەوتوی بکات, بەرەکەت بخاتە کردەوەو تەمەنیەوە.

٢- ئەم کتێبەی دوایی کە ئێستا لە بەردەستاندایە, بریتیە لە چوار بەش لە(١٣٧٦) لاپەڕەی مام ناوەندیدا [١]. کە ئەمەش بەڵگەیەکی راست و دروستە لەسەر گەورەیی گرنگیدانی بەپەروەردەی نەوەکانی داهاتوو, ئەمە جگە لە زانیاری و مەعریفەتەکانی تر.

- پێنازانم هیچ کەسێکی تر لەو بارەوە ئەوندە بەفراوانی و بەراستی و بەئاسانی لە روانگەی ئیسلامەوە کتێبی دەربارەی پەروەردەی منداڵان نووسیبێ, جگە لەوەی کە مامۆستا عبداللە عەلوان نووسیویەتی.

- پێنازانم هیچ نووسەرێك وەك ئەو باسی گەواهی نامەکانی ئیسلامی لە قورئان و سوننەت و ئاسەواری پیشینە چاکەکانی نووسیبێ, لەگەڵ ئەحکام و رەوشتە بەرزەکان و ئادابەکان, وەك ئەوەی کە شێخ عبداللە ناصح عەلوان کردوویەتی.

- پێم وایە لەناو کتێبە رەسەنەکانی موسڵماناندا هیچ نووسەرێك ئەوەندە گرنگی نەداوە بە باسی پەروەردەیی و, باسی وا بەنرخی نەنووسیوە, تەنها ئەوەندە نەبێ وەك کەسانێکی تر دەڵێن: (لەبەر زەروریەتێکی پێویست و مەبەستێکی تایبەتی), بەڵام ئەوەی مامۆستا عبداللە ناصح عەلوان کردوویەتی ئەوەیە بۆ موسڵمانانی دەنووسی و ئاراستەی دەکردن, رێگای دوورو درێژی بۆ کورت دەکردنەوە, چونکە خاوەنی رۆشنبیریەکی رەسەنی ئیسلامی بوو لەسەر بنەماکانی ئیسلام و,

[١] ئەمە مەبەستی لە یەکەم چاپیەتی ئەگینا ئەم چاپی سێیەمە لە دوو بەرگدایە ژمارەی لاپەڕەکانی (١٠٢٢) لاپەڕەیە.

ئەزمووونی موسڵمانانی رابردوو ئەم سەردەمە, ئەمەش وایکرد بێ نیاز بێ لەوەی لای خەڵکی تر هەیە.

- هیچ کتێبێکم نەدیوە ئەوەندە بەگەرمی و بەهێز بێ دەربارەی پەروەردەی منداڵان, وەك ئەوەی کە مامۆستا عبداللە ناصح عەلوان نوسیویەتی.

٣- لە پاشان, نیازم وابوو هەندێ لە ناونیشانە بەسوودەکانی ئەم کتێبە بەنرخە بخەمە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێز بەڵام لەبەر ئەوەی باسەکە درێژە نەکێشێ و نەبێتە زەحمەت بۆیان بەوەندە وازمهێنا, باخوێنەران خۆیان بگەنە ئەو حەقیقەتەی من ویستم پێشکەشیان بکەم.

بەڵام وتەکەی مامۆستا عبداللە ناصح عەلوانتان پێشکەش دەکەم کە لە کۆتایی بابەتەکەوە لەژێر ناونیشانی: (چەند پێشنیارێکی پەروەردەیی پێویست)دا نووسیویەتی:

چواردەوری بابەتەکەی مامۆستا بریتیە لەم چەند لایەنەی لای خوارەوە: هاندانی منداڵ بۆ بەرێزترین کاسبی, چاودێری ئامادەییە فیتریەکانی منداڵ, بوار رەخساندن بۆ ئەوەی منداڵ یاری بکات و پێی شاد بێ, هاوکاری یەکترکردن لە نێوان ماڵ و مزگەوت و قوتابخانەدا, بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان پەروەردەکارو منداڵ, رۆشتن لەسەر بەرنامەو رێبازی پەروەردەیی منداڵ بە شەوو بە رۆژ, تەیارکردن و ئامادەکردنی هۆکارەکانی رۆشنبیرکردنی منداڵ, هاندانی منداڵ بۆ خوێندنەوەی بەردەوام, هەستکردنی منداڵ بە بەرپرسێتی بەرامبەر بە ئیسلام, قوڵکردنەوەی رۆحی جیهادو تێکۆشان لە دەروونی منداڵدا.

لەشەرحی ئەم پێشنیارانەدا(١٧٧) پەڕەی نووسیوە, ئەم نووسەرە بەڕێزە هیچ شتێکی نەهێشتۆتەوە لەبارەی گرنگی پێدانی واجبی پەروەردەیی منداڵان و چاودێریانەوە؟

چەند جێگەی خۆیەتی باوکان و دایکان و پەروەردەکاران و ئەوانەی لە مەیدانی پەروەردەدا کاردەکەن, هەر هەموویان ئەم کتێبە بەنرخە بخوێننەوەو لەسەر ئەم فەرموودەیە بڕۆن کە لە کتێبەکەدا هاتووە:

* پێغەمبەرصلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(كَفَى بِالمَرْءِ إِثْمَاً أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ)**[1]. واتە: ئەوەندە بەسە بۆ گوناهباری پیاو, کە ئەو کەسانەی بەخێویان دەکات پشتگوێیان بخات.

دەی چ پشتگوێ خستنێ پڕ مەترسی ترە لە پشتگوێ خستن و لەکیس چوون و لادانی دڵەکان بەهۆی فەرامۆشکردنەوە ؟!

دەی چ پشتگوێ خستنێك سەخت ترە  لە چوونەدەرەوە لە ئیسلام و دژایەتی کردنی ئەحکامەکانی ؟

دەی چ پشتگوێ خستنێك سەخت ترە  لە لەکیس چوونی دڵ و عەقڵ و رەوشتی منداڵان, تەنها جەستەکەیان مابێتەوە وەك داری وشکی هەڵسپێردراو, نەبێتە خاوەنی عەقیدەو بیروباوەڕێکی گەورەو نەژی لە پێناو غایەو مەبەستێکدا ؟!

خوای گەورە چاوەکانت رووناك کاتەوە ئەی شێخ عەلوان, لەگەڵ چاوەکانی ئەوانەی وێنەی تۆن, نەوەیەکی نموونەیی پێ بگەیەنن بژین وەك چۆن نەوەی نموونەیی یەکەم لەسەر زەویدا ژیان, خوای گەورە سەرکەوتوویان کات وەك چۆن ئەوانی سەرکەوتوو سەرفرازکرد, ئەوانەش نەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاوەڵە ناوازەو بەڕێزەکانی بوون خوای گەورە لێیان رازی بێ بوونە جێنشین و دەسەڵاتدار لەسەر زەویدا بەو ئایینەی کە خوا خۆی پێی رازیە, ترس و بیمی بۆ گۆڕین بەئاسایش و ئارامی, ئاڵای ئیسلامیان بەرزکردەوە لە هەموو سەنگەرو وڵاتێکدا, ئایینیان هەمووی بۆ خوا بوو, ئەمەش لای خوا قورس و گران نیە: **﴿وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ* بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾. الروم: ٤–٥**. واتە: رۆژێ باوەڕداران کەیفێ دەکەن و دڵخۆش دەبن بە یاریدە لە خوداوە, خوا هەر کەسی بوێ سەری دەخات, هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتەو دلۆڤانە.

**وهبی سلیمان الغاوجی**

[1] حديث صحيح: أخرجه : أبو داود ( ١٦٩٢ ) ، والنسائي في " الكبرى " ( ٩١٧٦ ) ، وأخرج مسلم الحديث الثاني ٧٨/٣ ( ٩٩٦ ) ( ٤٠ ) .

# پێشەکی چاپی دووەم

**الحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات، والصلاة والسلام على معلّم الناس الخير، وهادي البشرية إلى نور الحق المبين، والصراط المستقيم ورضي الله عن آله وأصحابه والتابعين.. ممّن حملوا إلى العالم رسالة الإسلام، وتعاليم القرآن.. ورضي أيضاً عمّن سار على دربهم، ومشى على طريقهم بإحسان إلى يوم الدين.**

له پاشان:

سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار دەکەم لەسەرەتاو کۆتاییەوە کە سەرکەوتوی کردم بۆ نووسینی کتێبی (پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام)دا بەهەر سێ بەشەکەیەوە.

دوای تەواو بوونی کتێبەکە هەر وەك خەڵکی پسپۆر شایەتیاندا, ئامانج و مەبەستی خۆی پێکاوەو, هۆکارەکانی روونکردۆتەوە, دروشمەکانی وەردەگیرێن, بەرپرسێتیەکانی هەمەچەشنەن, پێشەنگ و رێ نیشاندەری رێگەو رێبازە, پێویست و لەبارە بۆ رۆحی سەردەم, گونجاوو شیاوە لەگەڵ واقیعی نەوەکان و, حاڵەتی ئەمڕۆی ئوممەتی ئیسلامیدا..

ئاواتەخوازم خوێنەرانی عەرەب لەم کتێبەدا ئەوەیان دەستکەوێت کە جێگای هیوای گەورەیانەو پێویستە بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانیان لە ئێستاو داهاتوودا.. لە دروشمە ئاراستەییە گشتیەکان و بنەما پەروەردەییە گشتگیرەکان..

هیوادارم ئەم کتێبە ببێتە رێ نیشاندەری رێگای راستی, کەلێنێکی گەورە پڕکردبێتەوە لە جیهانی کتێب و, بواری پەروەردەدا.. پەروەردەکار کتێبێکی پەروەردەیی گشتگیری لە کتێبخانەی ئیسلامی ئەم سەردەمەدا دەستکەوێ بۆ چارەسەری (پەروەردەی منداڵ) لە هەموو لایەنێکەوە, بنەما سەرەکیەکانی لەبەر دەستدا بێ بۆ ئامادەکردنی منداڵ لە رووی رۆحی و عەقڵی و جەستەییەوە, هەروەها ببێتە هۆی گەشەپێدانی بواری رەوشتی و دەروونی و کۆمەڵایەتی..

هەروەها هیوام وایە ئەم کتێبە ببێتە مەنارەیەکی پرشنگدار بۆ رێنمایی هەموو ئەو کەسانەی دەیانەوێ منداڵەکانیان پەروەردە بکەن لەسەر عەقیدەو بیروباوەڕی خوا

پەرستی رەسەن, سوننەتەکانی ئیسلام, ڕێنماییەکانی قورئان, زانستەکانی سوننەت, ڕێبازەکانی پێشین و, بەرنامەی شەریعەتی بە بەهای دەوڵەمەندی ئیسلام!

مژەدە ئەدەم بە پەروەردەکاران لەهەر ئاستێکدا بن بە زیادکرنی باسێکی نوێ لەبەشی(بەرپرسارێتی پەروەردەکاران) لەم چاپەدا بەناونیشانی(بەرپرسێتی پەروەردەی جەستەیی) کە ئەمەش چارەسەری کێشەی ئارەزووی منداڵ بۆ جنس دەکات, هەروەها چارەسەری بەڵاو نەهامەتیە خراپەکانی تەمەنی لاوی و هەرزەکاری دەکا, وە دەبێتە ڕێ نیشاندەر بۆ گەیشتن بە پەیوەندی جنسی بە شێوەیەکی گونجاو کاتێك باڵغ بوون و چوونە ناو ژیانی هاوسەریەوە!!

دەمەوێت بەم بۆنەیەوە بیری برا پەروەردەکارەکانم بخەمەوە کە بەتێبینی و پێشنیارەکانیان ئاگادارم کەنەوە ئەگەر هەر هەڵەیەکیان بینی یان هەر رەخنەیەکیان هەبوو.. من لە پێشەوە سوپاسی ئەوان دەکەم لەسەر ئەو کردەوە چاکەو گرنگیدانە گەورەیان, چونکە کەماڵ و تەواوی هەر بۆ خوای تاك و تەنیایە, بێ گوناهیش تەنها بۆ پەیامبەرانە, ئێمەش هیچ نین تەنها ئەوە نەبێت کە کردەوەو گوفتارمان دەدرێتە دواوەو دەدرێتەوە بەسەرماندا.. بەڵکو ئەگەر خوای گەورە بۆی ئاسان کردین و لەشی ساغ و تەمەنی درێژی پێ بەخشین لە چاپەکانی داهاتوودا یاداشتیان بکەین!!..

ئەوەی فێنکایی دەدات بە دەروونمان و دڵمان شاد دەکات ئەوەیە کڕینی کتێبی ئیسلامی لەناو گەنج و لاوەکاندا بووتە دیاردەیەکی بەرچاو بۆ خوێندنەوەو سوود لێ وەرگرتن.. هەرکە بەشەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم کەوتە بازاڕەوە لاوەکان و پەروەردەکاران دەورەیان لێدا بۆ کڕینی, خۆیشم وا گومانم نەدەبرد بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە خێرا نەمێنێ لە بازاڕدا, سوپاس بۆخوا لەسەرەتاو لە کۆتایشدا.

ئەم دیاردەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەوەی موسڵمان ئەگەر بەدڵ و بەعەقڵ قەناعەتیان بۆ دروستبوو دەڕۆن بەرەو ئیسلام.. ئەم قەناعەتەش ئەوەیە کە ئیسلام بەو شەریعەتە گشتی و تەواوەو, بە دروشمە هەمیشەیەکانیەوە, یەکەم رزگارکەری مرۆڤەکانە لە بەڵاو نەهامەتیەکانی دەروونی, لە لادانە رەوشتیەکان, لە پاڵەپەستۆی سیاسی و, هەڵوەشانەوەی کۆمەڵایەتی..

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿**قَدْ جَاءكُم مِّنَ اللّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ * يَهْدِي بِهِ اللّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلاَمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنِ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ**﴾. **المائدة: ١٥– ١٦**. واتە: بێگومان بۆتان هاتووە لەلایەن خواوە رووناکیەکی گەورەو نامەیەکی روونکەرەوە, خوا رێنمایی کەسێکی پێدەکات شوێن رەزامەندی ئەو بکەوێت بۆ رێگاکانی ئارامی و ئاشتی, وە دەریان دەهێنێ لە تاریکیەکان بۆ رووناکی بەمەیل و فەرمانی خۆی, وە رێنماییان دەکات بۆ رێگای راست.

من بەخەیاڵی خۆم وێنەی ئەوەم کێشاوە کە پێشەنگ و پێشڕەوانی ئیسلام دەستیان کردووە بەجوڵانەوە بەرەو داهاتوو بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی شکۆمەندو بەرفراوان هاوشێوەی گەلانی گەورە لە بەرزی و بڵندیدا.. بەراستی گەورەترین هۆکاری بەدیهاتنی دەوڵەتی ئیسلامی و شکۆمەندی موسڵمانان دەگەرێتەوە بۆ هەوڵدانی ئەو کەسانەی کە کاردەکەن بۆ دروستکردنی نەوەیەکی قورئانی موسڵمان و, ئامادەکردنی گەلێکی ئیسلامی رەسەن و تێکۆشەرو, تەیارکردنی کۆمەڵگەیەکی بەرێزو پڕ لە خواناسی..

ئەوەش لای خوای باڵا قورس و گران نیە ئەگەر کارکەران دەسبگرن بەهۆکارەکانەوەو, موسڵمانان بەرن بەرەو ئامانج و مەبەستەکان!!

ئەوا چاپی دووەمی کتێبی پەروەردە بەپێدا چوونەوەی و زیادە خستنەسەریەوە پێشکەش دەکەم بەنەوەی موسڵمانی ئەم سەردەمە بەپێی جیاوازی ئاستی رۆشنبیریان.. بەڵکو ئەم کتێبە ببێتە بناغە بۆ ئامادەکردنی پتەو, بۆ بنەمایەکی پەروەردەیی پێشکەوتوو, وە ببێتە دروشم بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی خاوەن پلەو پایە.. هیچ دەستێك نەبینن تەنها ئەو دەستە نەبێت کە دەستیگرتووە بەبەرنامەی پەروەردەیی گشتی ئیسلامیەوە, کەشەریعەتی ئیسلام زانستەکانی روونکردۆتەوەو, پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم بنەماکانی ئاشکرا کردووە!..

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوێنەران لە دوعای خێر بە پەنهانی بێ بەشمان نەکەن ئەگەر چاکەیان بینی لەم کتێبەدا, وە من زۆر سوپاسیان دەکەم..

داواکارم له خوای گەورە ئەم بەرهەمەم بەچاکی لێ وەرگرێت, هەمیشەو بەردەوام یارمەتم بدات بۆ سەرخستنی ئەم ئایینە راست و پیرۆزە, ئیسلام روونکەمەوە بەگشتی بۆ مرۆڤایەتی و گەردوون و ژیان.. هەر ئەوە جێی ئومێدو شایەنی وەڵامدانەوەیە.

# پێشەکی چاپی سێیەم  کە نووسەر لێی زیادکردووە

**الحمد لله رب العالمين، وأفضل الصلاة وأتم التسليم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، وعلى دعاة الحق، وقادةالخير بإحسان إلى يوم الدين..** لە پاشان:

وام گومان نەدەبرد کتێبەکەم(پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام)دا ئاوا ببێتە جێگەی ڕێزو پێزانین لەلایەن زانایان و مامۆستایان و پەروەردەکاران و ئەدیبان و پێشەنگی بانگخوازان و ڕۆشنبیرانەوە.. سوپاس بۆخوا لەسەرەتاو لە کۆتایشدا چونکە ئەو سەرکەوتووی کردم و بۆی ئاسان کردم.. پشت و پەنام هەر ئەوەو داوای کۆمەکی هەر لەو دەکەم, هەموو فەزڵ و گەورەیش هەر بۆ ئەوە.. ئەمە چاپی سێیەمی ئەم کتێبەیە پێشکەشی دەکەم لەگەڵ ئەم دوو بابەتە زیادە گرنگەدا:

یەکەم: دەرخستنی بەڵگەی بڕاوەو بێ گفت و گۆ لەسەر واجبی داپۆشینی دەم و چاوی ئافرەتان لە نامەحرەم.

دووەم: هاوکاریکردن بۆ چارەسەری واقیعی لادانە جنسیەکان لەبەر ڕۆشنایی راستی ڕووداوەکاندا, داواکارم لە خوای بەرزو بڵندو خاوەن دەسەڵات کتێبەکەم بەجوانترین چاپ بکەوێتە بەردەستی خوێنەران, ببێتە یارمەتیدەری ئەو کەسەی گرنگی دەدات بە پەروەردەی منداڵەکەی لەسەر بناماکانی ئیسلام, وە بە هەموو ئەو کەسانەی هەوڵدەدەن نەوەی نوێ لەسەر بنەمای رەوشت ئیمان پەروەردەبکەن.. سوپاس بۆ خوا کە ئیسلام خاوەنی چاکترین بنەمای پەروەردەیی و, بەهێزترین ئاراستەو رەوشتی بەرزە.. پێویستیەکانی گەلی موسڵمان دەردەکات بەتەواوی لە هەموو کات و سەردەمێکدا, هەروەها پێویستی ئەوانەش دەردەکات کە دەیانەوێ هەنگاو هەڵگرن بەرەو ئایندەیەکی پرشنگدارو داهاتوویەکی گەشبین و دڵ خۆشکەر..

داواکارم لە نەوەی ئیسلامی ئەمڕۆ لە فیکرو بیروباوەڕویاندا ئیسلام بکەنە پێشەنگ, ئامانجیان پەیڕەوکردن و کارکردن و پەروەردەکردن بێ, مەبەستیان لە هەنگاونان بۆ بەرزو بڵندی و کەرامەت و یەکێتی ئیسلامی بێ بەگشتی.. چونکە بەراستی ئەوە باشترین بەرپرسێتیەو, شایەنی وەڵا مدانەوەیە.

# بەشی یەکەم: هەڵبژاردنی هاوسەر

## بەندی یەکەم: هاوسەری نموونەیی و پەیوەندی بەپەروەردەوە

پێش ئەوەی باسی ئەو بنەمایانە بکەین کە ئیسلام دایناون بۆ پەروەردەکردنی منداڵان چاکتر وایە لە پێشەوە کورتە باسێکی هاوسەرگرتنتان بۆ بکەم لەم سێ رووەوە:

أ- هاوسەرگرتن لە فیترەتی مرۆڤەکانە.

ب- هاوسەرگرتن بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵایەتیە.

ج- هەڵبژاردنی هاوسەری چاك و شیاو.

چونکە خستنەرووی وێنەی ئەمانە لەو بوارانەوە دەریدەخات کە چەندە پەروەردە پەیوەندی هەیە بەهەڵگرتنی ئەرکی سەرشان و, خستنەوەی وەچەو, دانانی بەرەچەڵەکی منداڵ و, سەلامەتی جەستەو رەوشتی و, جوڵاندنی هەست و سۆزی دەروونی دایك و باوك بەرامبەری و, هاوکاریکردنی ژن و مێرد لەسەر پەروەردەو راستکردنەوەی لاریەکانی و, ئامادەکردنی تا دەبێتە مرۆڤێکی چاك بۆ ژیان..

### أ. هاوسەرگرتن لە فیترەتی مرۆڤەکانە

یەکێك لە کارە ئاشکراو دیارەکانی دروشمی شەریعەتی پاکی ئیسلام ئەوەیە, کە بەراستی شەریعەت دژایەتی و رەبەنی و هاوسەرنەگرتنی کردووە, چونکە یەکناکەوێ لەگەڵ فیترەتی پاکی مرۆڤەکاندا, ناگونجێت لەگەڵ شەوق و زەوق و ئارەزوو غەریزەکانیاندا.

* سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: **(إنّ الله أبدلنا بالرهبانية الحنفيّة السمحة)** [1].

---

[1] صحيح رواه البيهقي.

واته: خوای گەورە لە رەهبانیەت و گۆشەگیریەوە ئێمەی گۆڕیوە بۆسەر ئاییینی راست و ئاسانکاری.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: **(مَنْ كَانَ مُوسِرًا لأنْ يَنْكِحَ ثُمَّ لَمْ يَنْكِحْ فَلَيْسَ مِنِّي)**[1]. واتە: هەر کەسێك توانای ژن هێنانی هەبێت و نەیهێنێت, ئەوە لە من نیە, واتە لەسەر سوننەت و رێبازی من نیە.

* عائیشە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: **(النِّكَاحُ مِنْ سُنَّتِي فَمَنْ لَمْ يَعْمَلْ بِسُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي وَتَزَوَّجُوا فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ الْأُمَمَ)**[2]. واتە: هاوسەرگرتنی حەڵاڵ و ژن هێنان لەسوننەتی منە, جا هەرکەسێ کار بەسوننەتی من نەکات ئەوە لەمن نیە, ژن بهێنن با منداڵی زۆرتان ببێ, چونکە من شانازی بەزۆریتانەوە دەکەم لەلای نەتەوەکانی تردا..

* عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرموی: **(أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ التَّبَتُّلِ)**[3]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ژیانی رەبەنی و ژن نەهێنانی قەدەغەکردووە.

وەك دەبینیت ئەم فەرموودانەو چەندهای تریش دەریدەخەن کە بەراستی شەریعەتی ئیسلام رەبەنی و ژن نەهێنانی لەسەر موسڵمان حەرام کردووە, بەنیەتی گۆشەگیری و زوهدو خۆیەکلایکردنەوە بۆ خوا پەرستی و, نزیك بوونەوە لە خوای پەروەردگار, بەتایبەتی لە کاتێکدا موسڵمان توانای هاوسەرگرتنی ببێ و, هۆکارەکانی بۆ رەخسابێت و بەئاسانی بتوانێ بیهێنێت.

ئێمە ئەگەر سەرنج بدەین لە هەڵوێستەکانی پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم لەبارەی چاودێریکردنی تاکەکانی کۆمەڵ و, چارەسەری دەروونی مرۆڤەکان زیاتر دڵنیادەبین کە ئەو چارەسەری و چاودێریکردنە لەسەر ناسینی حەقیقەتی ئادەمیزادو, دەسنیشانکردنی حەزو ئارەزوو شەوق و زەوقێتی, تا هیچ کەسێك لە تاکەکانی کۆمەڵ

---

[1] - ضعيف رواه البيهقي والطبراني في معجم الكبير: ١٨٣٥٥, سلسلة الضعيفة: ٤٠٦/٤ برقم : ١٩٣٤.
[2] - صحيح سنن إبن ماجة: ١٤٩٦, سلسلة الصحيحة: ٢٣٨٣.
[3] - صحيح سنن النسائي: ٥٨/٦ برقم ٣٢١٣, والترمذي: ٣٩٣/٣ برقم: ١٠٨٢.

له سنوری فیترەتی خۆی دەرنەچێت, کارێك نەکات له توانای خۆی بەدەربێت, بەڵکو لەسەر رێگای راست بەشێوەیەکی ئاسایی و گونجاوو مام ناوەندی هەنگاو هەڵگرێ.. کاتێك خەڵك رۆشتن ئەو نەکەوێت, کاتێك خەڵك پێشکەوتن ئەو دوانەکەوێ و نەبەزێت, کاتێك نەوەکانی ژیان بەهێزو چالاك بوون ئەو بیٚ هێز نەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ**﴾. **الروم:٣٠**. واتە: دینێکی بنەڕەتیەو له سروشتدا خوا ئەو خەڵکەی هەر لەسەر یەکتا پەرستی وەدی هێناوە, کاری خودا گۆڕانی بەسەردا نایە, دینی پتەوو پایەدار هەر ئەمەیە بەلاٚم زۆربەی خەڵك ئەم راستیانە نازانن.

ئەوەش ئێوە ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم کە یەکێکە له گەورەترین هەڵوێستی چاکسازی و پەروەردەیی بۆ چارەسەری خوو نەریتە خراپ و نەشیاوەکان و, تێگەیشتن له حەقیقەتی ئادەمیزاد:

* سیٚ پیاو چونە ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم, له چۆنیەتی خوا پەرستی پێغەمبەریان پرسی, کاتێك چۆنیەتی خوا پەرستیەکەیان پیٚ گوترا, ئەوانیش گوتیان: ئێمە له کوێین لەچاو خوا پەرستی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم, له کاتێکدا خوای پەروەردگار له گوناهەکانی رابردوو داهاتوی خۆش بووە ؟!.

یەکێك لەو پیاوانە گوتی: کەواتە هەموو شەو بەردەوام شەونوێژ دەکەم.

یەکێکی تر گوتی: بەدرێژایی ساڵ هەموو رۆژێك بە رۆژوو دەبم.

ئەوی تریشیان گوتی: هەرگیز ژن ناهێنم بەرەبەنی خوا پەرستی دەکەم.

کاتێك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم قسانەی پیٚ گەیشتەوە فەرموی: (**أَنْتُمْ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي**) [1]. واتە: ئێوە ئەم جۆرە قسەیەتان گوتووە ؟! سوێند بێت بەخوا من له هەمووتان زیاتر لەخوا ئەترسم, بەلاٚم من بەرۆژوو دەبم و دەیشکێنم, شەونوێژ دەکەم و دەشخەوم, ژنیش دەهێنم, هەر

[1]- أخرجه البخاري في النكاح: ٢/٧ ( ٥٠٦٣ ) ، ومسلم ١٢٩/٤ ( ١٤٠١ ) ( ٥ ).

کەسێکیش واز لە سوننەت و ڕێبازی من بهێنێ ئەوە ئەو کەسە لە من نیە.

ئەم دەقانەی سەرەوە دەریدەخەن بۆ هەموو کەسێکی خاوەن ئاوەزو زیرەك و بەرچاو ڕوون کە بێگومان هاوسەرگرتنی حەڵاڵ لە فیترەتی مرۆڤەکانە, بۆ ئەوەی موسڵمان هەستێ بەهەڵگرتنی ئەرکی ئەو ئەمانەت و بەرپرسیارێتیە گەورەیەی کە لەسەر شانیەتی بەرامبەر بەو کەسانەی کە حەقی پەروەردەو چاودێریان لە گەردنیایەتی.. وەڵامی ئەم فیترەت و غەیزە جنسیە بداتەوەو, لەسەر سوننەتی ئەم ژیانە هەنگاو هەڵگرێ!!.

## ب – هاوسەرگرتن بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵایەتیە

وەك ئاشکرایە سودەکانی هاوسەرگرتن لە ئیسلامدا گشتیە, بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵایەتیە, بەپشتیوانی خوای گەورە لەبەر گرنگی باسەکە, پاشان پەیوەندیەکانی لە ڕووی بەپەروەردەییەوە بۆ ڕوون دەکەینەوە:

١- پارێزگاریە لە مانەوەو بەردەوامی جۆری ئادەمیزاد:

بەهۆی هاوسەرگیریەوە وەچەی مرۆڤایەتی بەردەوام دەبێ و زۆر دەبێ نەوە لەدوای نەوە.. تا ئەو کاتەی خوای گەورە ئەم زەویەو هەرچی لەسەریەتی بە میرات دەیگرێ, شاراوە نیە ئەم زۆربوونی نەوە لەدوای نەوە بۆ پارێزگاریە لە مانەوەو بەردەوامی جۆری مرۆڤایەتی, ئەوە پسپۆڕەکانی هانداوە بۆ دانانی پەیڕەو پرۆگرامی پەروەردەیی و, بنەماو ڕێسای ڕاست و دروست لە پێناوی سەلامەتی ئەم جۆرە بەشێوەیەکی یەکسان لەڕووی ڕەوشتی و جەستەییەوە, بێگومان قورئانی پیرۆزیش ئاماژە داوە بەباسی حیکمەتی کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی مرۆڤایەتی لە کاتێکدا کە دەفەرموێت: **﴿وَاللّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً﴾. النحل: ٧٢.** واتە: خودا هەر لەخۆتان هاوسەرانی بۆ فەراهەمهێناون, هەر لە ڕێگەی هاوسەرانتانەوە منداڵ و نەوەی پێ بەخشیوون..

هەروەها دەفەرموێت: **﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء﴾. النساء: ١.** واتە: ئەی خەڵکینە خۆتان

لەخەشم و نارەزایی ئەو پەروەردگارەتان بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسێك هێناوەتەدی, هەروەها لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدیهێناوەو, لەو دووانە پیاوان و ئافرەتانی زۆری خستۆتەوەو بلاوکردۆتەوە بەسەر زەویدا.

٢- پارێزگاریکردنە لە رەچەڵەك و نەژاد:

بەو هاوسەرگرتنە کە خوای پەروەدگار دایناوە منداڵان شانازی دەکەن بە رەچەڵەکی خۆیان و باو باپیریانەوە, شاراوە نیە ئەو کاتە هەست بەئارامی و دڵنیایی و کەرامەتی مرۆڤانەیان دەکەن.. بەڵام ئەگەر ئەو هاوسەرگرتنە شەرعیە نەبوایە کە خوا دایناوە, ئەوا کۆمەڵگە پڕئەبوو لە منداڵانی بێ رەچەڵەك و بێ رێز, ئەوەش ئەبووە هۆی تانەو تەشەر بۆسەر رەوشتە بەرزو جوانەکان و, بلاوبونەوەی تاوان و خراپەو بەرەڵایی ترسناك.

٣- کۆمەڵگە سەلامەت دەبێ لە هەڵوەشانەوەی رەوشتی:

بەهاوسەرگرتن کۆمەڵگە سەلامەت دەبێت لە هەڵوەشانەوەی رەوشتی, تاکەکان ئەمین دەبن لە تێکچونی کۆمەڵایەتی.. شتێکی شاراوە نیە لای هەموو خاوەن بیروهۆش و تێگەیشتوویەك کە تێرکردنی ئارەزووی جینسی بەحەلاڵی, تاك و کۆمەڵ ئەبات بەرەو چاکترین ئاکاری بەرزو رەوشتی جوان, ئەو کاتە شایەن ئەبن بەگەیاندن و بەجێهێنانی پەیامی خوا, بەرگەی ئەو بەپرسیارێتیە گەورەیەش ئەگرن کە لەسەر شانیانە بەو شێوەیەی کە خوای گەورە ئەیەوێ و فەرمانی پێکردووە, پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چەند راست و جوانی فەرمووەو حیکمەتی هاوسەرگرتنی روون کردۆتەوە بۆ پاراستنی رەوشت و, سوودی کۆمەڵایەتی کاتێك کە هانی کۆمەڵی لە لاوان دەدات بۆ ژن هێنان: (**يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ**)[1] واتە: ئەی کۆمەڵی گەنج و لاوان! هەر کەسێك لە ئێوە پارەو سامان و پێداویستیەکانی ژن هێنان و توانای جنسی هەیە با ژن بیهێنێ, چونکە باشترین پارێزەرە بۆ چاو داخستن و داوێن

---

[1] البخاري: ١٩٠٥\٤ , ومسلم: ١٠١٨/٢ - ١٤٠٠ .

پاکی, هەر کەسێکیش توانای ژن هێنانی نەبوو با رۆژوو بگرێ, چونکە رۆژوو بۆی قەڵغانەو دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئارەزووەکانی و لە خراپە دەیپارێزێ.

٤- کۆمەڵگە سەلامەت دەبێت لە نەخۆشیەکان:

بەهاوسەرگرتن کۆمەڵگە سەلامەت دەبێت لە نەخۆشیە کوشندەو گواستراوەکان: ئەو نەخۆشیانەی کە بڵاودەبێتەوە لەناو رۆڵەکانی کۆمەڵدا بەهۆی زیناکردن و, بەرەڵایی و بەدڕەوشتی و, تێکەڵاوی حەرامەوە.. لەوانە وەك نەخۆشی زوهری و سیلان و ئایدز.. وە جۆرەها نەخۆشی تری ترسناك کە کاریگەرییان ئەبێ بۆ سەر نەمانی وەچەو, جەستە لاواز دەکەن, دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعون و کولێراو.. لەناوبردنی تەندروستی منداڵان.

٥- هێمنی و ئارامی رۆحی و دەروونییە:

هاوسەرگرتن دەبێتە هۆی گەشەکردنی رۆحی سۆزو خۆشەویستی لە نێوان ژن و مێردا, مێرد کاتێ لەسەر کارەکەی دەست هەڵئەگرێ لە ئێوارااندا و ئەگەڕێتەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵەکانی و کۆئەبێتەوە لەگەڵیان, ئەو هیلاکی و ناڕەحەتیەی بیرئەچێتەوە کە لەو رۆژەدا تووشی بووە, هەست بەئارامی و حەوانەوە ئەکات لەدوای ئەو هەوڵ و ماندووبونە زۆرە, هەروەها ژنیش بەهەمان شێوە کاتێ ئێواران پێشوازی لە هاوڕێی ژیانی دەکاو, لەگەڵ مێردەکەیدا کۆدەبێتەوە.. بەو شێوەیە هەر یەکێکیان لە سێبەری ئەوی تریاندا ئەحەوێتەوەو هەست بەهێمنی و ئارامی ئەکات, ژن و مێردێکی بەختەوەر ئەبن, خوای گەورە راستی فەرمووە کاتێك وێنەی ئەو دیاردەیەمان بەجوانترین شێوە بۆ دەردەخات: **﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾. الروم: ٢١**. واتە: یەکێك لەنیشانەکانی خوا ئەوەیە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ فەراهەمهێناون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایاندا, سۆزو خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان, بێگومان ئەمە چەندین بەڵگەی تێدایە بۆ ئەوانەی بیردەکەنەوەو تێدەفکرێن.

٦- هاوکاریکردنی یەکتری ژن و مێرد بۆ پێکهێنانی خێزان و پەروەردەکردنی منداڵان:

بەهاوسەرگرتن ژن و مێرد ئەتوانن پێکەوە بژین و یارمەتی یەکتربدەن و بەرگەی بەرپرسێتی بگرن.. هەر یەکێکیان تەواوکەری کاری ئەوی تریانە ژن دەبێ لەبواری خۆیدا کار بکات, ئەو کارانە بکات کە دگونجێن لەگەڵ سروشتی مێینەیی خۆیدا, ئەویش سەرپەرشتی و بەرێوەبردنی ئەرکی ناو ماڵ و هەستانیەتی بەپەروەردەکردنی مندالەکانی, راستی گوتووە ئەو شاعیرەی کە دەڵێ:

**الام مدرسة إذا اعددتها**

**اعددت شعبا طيب الاعراق.**

واتە: دایك قوتابخانەیەکە ئەگەر ئامادەتکرد, گەلێکی رەسەن و خاوەن رەوشتی باشت ئامادەکردووە.

پیاویش لە بواری خۆیدا کار دەکات و ئەو کارانە ئەکات کە دەگونجێ لەگەڵ پیاوەتی و تەبیعەتی خۆیدا, هەوڵ و تەقەلاو رەنج ئەدات بۆ بژێوی ژیان و, پارێزگایکردنی خێزان لە بەڵاو نەهامەتیەکانی سەردەم و رۆژگار.. بەو شێوەیە رۆحی یارمەتیدان و هاوسەرییان برەوی پێدەدرێ و, تەواوکەری یەکتری ئەبن و ئەگەنە چڵەپۆپەی باشترین ژیان, باشترین بەرهەمیان ئەبێ لە ئامادەکرنی مندالانی چاك و باشدا, پەروەردەی نەوەیەکی موسوڵمان ئەکەن کە خۆیان بەرۆحی ئیسلام برازێننەوە, بەڵکو ئەو نیعمەتە گەورەیە خانەوادەکەشیان دەگرێتەوەو, لە سێبەری ئەو خۆشەویستی و خۆش گوزەرانیەدا بەخۆشی و شادی و ئارامی ژیان دەبەنەسەر.

٧- پەرەسەندن و زۆربوونی سۆزو بەزەیی باوکایەتی و دایکایەتی:

بەهاوسەرگرتن سۆزو بەزەیی و جوامێری پەرەدەسێنێ لە دڵ و دەروونی باوك و دایکدا.. شاراوە نیە کە ئەوەش کاریگەری چاك و, ئەنجامی باشی ئەبێ بۆ سەرپەرشتیاری مندالەکانیان و, شەونخونی کێشان لە پێناوی بەرژەوەندیەکانیان و بەرەوپێش بردنیان بۆ ژیانێکی ئارام و پڕ لە خۆشگوزەرانی و, پاشە رۆژێکی گەشاوەو چاك.

ئەمانەش گرنگترین بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی هاوسەرگرتن بوون, بینیتان چۆن پەیوەندی هەبوو بەپەروەردەی منداڵ و چاکسازی خێزان و, پێگەیاندنی نەوەو وەچەوە.

دەی ئیتر جێگەی سەرنج نیە کە دەبینن شەریعەتی پاکی ئیسلام فەرمانی کردووە بەژن هێنان و هانی خەڵکیشی داوە بۆ ئەو مەبەستە, پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم راستی فەرمووە کە دەفەرموێت: (**مَا اسْتَفَادَ الْمُؤْمِنُ بَعْدَ تَقْوَى اللَّهِ خَيْرًا لَهُ مِنْ زَوْجَةٍ صَالِحَةٍ إِنْ أَمَرَهَا أَطَاعَتْهُ وَإِنْ نَظَرَ إِلَيْهَا سَرَّتْهُ وَإِنْ أَقْسَمَ عَلَيْهَا أَبَرَّتْهُ وَإِنْ غَابَ عَنْهَا نَصَحَتْهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهِ**)[1]. واتە: مرۆڤی باوەڕدار لەپاش ترسان لەخوا , هیچ خێرێکی وەك هاوسەرێکی چاك بەدەست نەهێناوە, ئەگەر فەرمانی پێکرد گوێڕایەڵی دەکات, گەر تەماشایکرد دڵخۆشی دەکات, گەر سوێندی لەسەر خوارد دەیگەیەنێتە جێ, گەر لێی دوورکەوتەوەو چووە سەفەرێك ئامۆژگاری دەکات بەپارێزگاریکردنی ماڵ و نەفسی.

* هەروەها دەفەرموێت: (**الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ**)[2] . واتە: ژیانی دنیا رابواردن و خۆشییە, چاکترین خۆشی دنیاش هاوسەرێکی چاك و خاوەن تەقوایە.

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**خَيْرُ النِّسَاءِ الَّتِي تَسُرُّهُ إِذَا نَظَرَ وَتُطِيعُهُ إِذَا أَمَرَ وَلَا تُخَالِفُهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهَا بِمَا يَكْرَهُ**)[3]. واتە: چاکترین ئافرەت ئەوەیە بەبینینی دڵت خۆش دەکات, ئەگەر فەرمانی بەسەردا بدەیت گوێڕایەڵیت بکات, بەپێچەوانەی ئەو نەکات و دەست لەماڵەکەی نەدات, کە ئەو پێی ناخۆشە.

## ج – هەڵبژاردنی هاوسەری چاك و شیاو

ئیسلام بەو شەریعەتە بەناوبانگەی خۆی و, ئەو یاساو رێسا گشتیەی.. چەند بنەماو یاساو رێسایەکی داناوە بۆ داواکەرو داواکراو, ئەگەر خەڵك لەسەری ئەو رێنماییانە برۆن و هەنگاوهەڵگرن ئەوا هاوسەرێتیەکەیان ئەبێتە مایەی پێکەوە گونجان و

---

1- ضعيف رواه إبن ماجة: ٥٩٦, مشكاة المصابيح: ٣٠٩٥/٢.

2- أخرجه مسلم: ١٧٨/٤ ( ١٤٦٧ ) ( ٦٤ ).

3- تحقيق الألباني(صحيح) انظر حديث رقم: ٣٢٩٨ في صحيح الجامع.

خۆشەویستی و لێك تێگەیشتن.. ئەو کاتە خانەوادە پێکدێ لە کوڕان و کچانێ ئیمانیان جێگیر دەبێ و دەگاتە چڵەپۆپە, جەستەیان ساغ و سەلامەت دەبێ, خاوەنی خوڕەوشتی بەرزو جوان دەبن, ژیرییان پێگەیشتوو دەبێ, دەروونیان پوخت و ئارام دەبێ.. [1].

ئەوەش ئێوەو ئەو ئەحکام و بنەما گرنگانە:

١ - هەڵبژاردن لەسەر بنەمای دینداری:

مەبەست لە وشەی دین تێگەیشتنە لە حەقیقەتی ئیسلام, پەیڕەوکردنی کردەوە چاکەکان و ئاکارە بەرزەکانیەتی بەکردەوە.. مەبەست ئەوەیە ئەو ئافرەتەی هەڵیدەبژێری پابەندبێ بەئاینی ئیسلامەوە بەشێوەیەکی گشتی لەکردارو گوفتاردا, شایەتی بۆ بدرێت لەلایەن کەسانی باوەڕ پێکراوەوە, وە دەبێ داواکەرو داواکراو لە ئاستی ئەو پابەندبوون و تێگەیشتن و پەیڕەویکردنەدا بن.. ئەو کاتە شایەنی ئەوە دەبن پێیان بوترێت خاوەن ئاین و خاوەن خووڕەوشتی بەرز.. بەڵام ئەگەر لە ئاستی ئەو پابەندبوون و پەیڕەوکردن و تێگەیشتنەدا نەبن ئەوا بێگومان حوکمی لادان و پابەندنەبوون و دوور لە ئیسلام دەدرێ بەسەریاندا, هەرچەندە لای خەڵك خۆیان واپیشان بدەن کە پابەندن بە ئیسلامەوەو خاوەن تەقوان..

چەندە وردبووە خەلیفەی عادل عومەری کوڕی خەتتاب خوای لێ رازی بێ کە تەرازووی راست و هاوسەنگی داناوە بۆ ناسینی مەردوم و خستنە رووی حەقیقەتی پیاوان, پیاوێك هاتە لای بۆ ئەوەی شایەتی بدات بۆ پیاوێکی تر.. عومەر فەرمووی: ئەم پیاوە دەناسی؟ وەڵامی دایەوەو گوتی: بەڵێ! فەرمووی: ئایا دراوسێیەتیت کردووەو رێگای چوونەدەرەوەی و هاتنەوەی بۆ ماڵ ئەزانی؟ گوتی: نەخێر نایزانم. فەرمووی: ئایا

[1] - ماڵ قەڵایەکە لەقەڵاکانی بیروباوەڕی ئیسلام, بۆیە پێویستە ئەو قەڵایە لە نێوخۆیدا پتەو بێ, تا دوژمن نەتوانێت بەئاسانی بێتە ناو ئەو قەڵایەوە, دایکی موسڵمانیش دەبێت هاوکار بێت, چونکە تەنها بە باوك ئەو قەڵایە پتەوو پارێزراو نابێ, چاودێر بێ بەسەر کوڕو کچەکانیەوەو یارمەتی باوك بدات بۆ پەروەردەکردنیان بەچاکی و, راپەڕاندنی ئەرکەکانی خۆی لەناو خانەوادەکەیدا.. وەرگێڕ.

سەفەرت لەگەڵ کردوە تا ڕەوشتە بەرزەکانی بزانی؟. وتی: نەخێر سەفەرم لەگەڵ نەکردووە؟ فەرمووی: ئایا بەدینارو درهەم سەوداو مامەڵەت لەگەڵ کردووە تا شارەزای خۆپارێزی بیت لە حەرام ؟ گوتی نەخێر, عومەر بەدەنگی بەرزو بەتوڕەییەوە فەرمووی: لەوانەیە لە مزگەوت بینی بێتت نوێژی کردبێ چەند جارێك هەستابێت و دانیشتبێت, چەند جارێکیش سەری نەوی کردبێت و بەرزی کردبێتەوە, پیاوەکە وەڵامی دایەوەو گوتی: بەڵێ!!.. عومەر فەرمووی: بڕۆ بەراستی تۆ نایناسی, ئاوڕی دایەوە بەلای پیاوەکەداو فەرمووی: بڕۆ پیاوێکی ترم بۆ بێنە بابت ناسێ.

عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بە ڕووخسارو شکڵ و شێوەی پیاوەکە نەخەڵەتا, بە ترازووی هاوسەنگ و پێوەری ڕاستەقینە حاڵەتەکەی بۆ دەرکەوت, ئایین و ڕەوشتی دەرخست!!..

* ئەمەش مانای ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم کە ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە: **(إِنَّ اللَّهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَجسَامِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ)**[1] . واتە: بەڕاستی خوای گەورە سەیری ڕووخسارو شێوەتان ناکات, بەڵکو تەماشای دڵ و دەروون و کردەوەکانتان دەکات.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێنمایی ئەو کەسانە دەکات کە دەیانەوێ ژن بهێنن بەوەی کە هاوسەری خاوەن ئایین هەڵبژێرن, بۆ ئەوەی ئەو ژنە هەستێ بەڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی خێزان و سەرپەرشتیاری بەتەواوی, لە بەجێهێنانی مافی مێرد و منداڵان و, وە بەجێهێنانی مافی ناوماڵ بدات بەو شێوەیەی ئیسلام داوایکردووەو, پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هانی خەڵکی بۆ داوە.

* ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَلِجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ)**[2]. واتە: ئافرەت لەبەر چوار شت دەخوازرێت: لەبەر سامان و

---

[1] رواه مسلم: ٢٥٦٤ , ٣٤.

2- متفق علیه, اخرجه البخاري: ٥٠٩ , ومسلم: ١٤٦٦.

ماڵەکەی, یا لەبەر ناوداری بنەماڵەکەی, یان لەبەر جوانی و شۆخ و شەنگی ئافرەتەکە, یاخود لەبەر دین و رەوشتی, جاتۆش ئەی ئەو کەسەی ئەتەوێ ژن بهێنی دیندارەکە هەڵبژێرەو ئاوڕ مەدەرەوە بەلای ماڵ و سامان و شتی تردا تادەستت پڕ بەرەکەت بیت, ئەگەر وا نەکەیت دەستت بەقوڕدا چێت.

* ئەنەس رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمویەتی: **(من تزوج امرأة لعزها لم يزده الله إلا ذُلاً ومن تزوجها لمالها لم يزده الله إلا فقرا ومن تزوجها لحسبها لم يزده الله إلا دناءة ومن تزوج امرأة لم يرد بها إلا أن يغض بصره ويحصن فرجه أو يصل رحمه بارك الله له فيها وبارك لها فيه)**[1]. واتە: هەر کەسێك ژن بهێنێت لەبەر دەسەڵات و خوای گەورە هیچی بۆ زیاد ناکات جگە زەلیلی و بێ دەسەڵاتی, هەر کەسێك ژن بهێنێت لەبەر سامان و داراییەکەی ئەوە خوای گەورە هیچی بۆ زیاد ناکات جگە لە هەژاری, هەر کەسێك ژن بهێنێت لەبەر ناوداری بنەماڵەکەی ئەوە خوای گەورە هیچی بۆ زیاد ناکات جگە لە ریسوایی, هەر کەسێك ژن بهێنێت تەنها لەبەر ئەوەی چاوی بپارێزێت لە نامەحرەم و, داوێنی بپارێزێت لە زیناو, سیلەی رەحم بەجێ بهێنێ ئەوە خوای گەورە فەڕو بەرەکەتی تێدلەخاتبەرامبەردا پێغەمبەری پێشەوا صلی اللە علیە وسلم رێنوومایی کەسوکاری ئافرەت دەکات کە پرسیار بکەن دەربارەی رەوشت و دینداری ئەو کەسەی داوای کچەکەیان دەکات, چونکە پاراستنی شەرەف و کەرامەتی ئافرەت مافێکی سەرەکی ئافرەتە بەسەر پیاوەکەیەوەو بەرپرسە لێی, هەستێ بەئەرکی پەروەردەی منداڵان, هەروەها دەبێ پێویستیەکانی ماڵی بۆ دابین کات و خەرجی بکێشێ و دیاریشی پێ ببەخشێ.

* پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: **(إذا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ**

---

[1]- رواه الطبراني في الأوسط: ٥/٣٨٨برقم: ٢٤٣٢, قال الألباني موضوع في ضعيف الترغيب والترهيب ١٢٠٨/٢.

دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ)[1]. واته: ئەگەر یەکێك خوازبێنی کچەکەتانی کردو ئێوەش لە ئاین و خوڕەوشتی رازیبوون، ئەوا بیکەنە هاوسەری کچەکەتان، ئەگەر واشتان نەکرد ئەوا فیتنەو خراپەکاری لەسەر زەوی بڵاودەبێتەوە. زیناو بەدڕەوشتی گەورە روودەدا، وەك لەم رۆژگارەدا دەبینین بەچاوی خۆمان کە چۆن خراپە سەر زەوی و وشکانی و دەریاشی گرتۆتەوە..

دەی ئیتر چ بەڵاو فیتنەیەك لەوە گەورەترە بۆ سەر ئایین و پەروەردە و رەوشت کە ئافرەتی موسڵمان بکەوێتە ژێر چنگی پیاوێکی گومڕاو بەدڕەوشت، مێردێکی بێ بەڵێن و پەیمان شکێن بەرامبەر بە ئافرەتێکی ئیماندار کە هیچ رێزێك دانەنێ بۆ پاراستنی شەرەف و کەرامەتی بەبێ نرخ تەماشای بکات؟!.

چ بەڵاو فیتنەیەك لەوە گەورەترە ئافرەتی چاکی ئیماندار بکەوێتە دەستی پیاوی بێ شەرەف و بێ رەوشت، بەزۆر ناچاری بکات بەرەڵابێ و تێکەڵاوی پیاوانی نامەحرەم بکاو لەگەڵیان رابوێرێ، ناچار بکرێ مەی و عەرەق و مادە سەرخۆشکەرەکان بخواتەوەو سەما بکا لەگەڵ پیاواندا، بەزۆر ناچار بکرێ رەشمەو پەتی ئایین و رەوشت لەگەردن داماڵێ و بەرەڵا بکرێ وەك حەیوانی بەرەڵا بەچ لایەکدا ئەڕوا با بڕوات؟

بەداخەوە چەندەها ئافرەتی بەدین و داوێن پاك و بەڕەوشت هەبوون لە ماڵی خۆیاندا، کاتێ کەوتونەتە ناو ماڵێکی بێ ڕەوشت و بەرەڵاوە، بوون بەژنی پیاوانی بێ ناموس و خراپەکار، گۆڕاون و بوونەتە ئافرەتانی بەرەڵا و داوێن پیس، هیچ بەهاو نرخ و رێزێکیان بۆ بنەماکانی ئایین دانەناوە، هیچ ئیعتبارێکیان بۆ داوێن پاکی و شەرەف نەهێشتۆتەوە!!.

گومانی تێدا نیە ئەگەر منداڵان لەناو ماڵێکی ئاوا هەڵوەشاوەو بێ ئابڕوو خراپەکاردا گەورە بوون و پێگەیشتن، ئەوا ئەو منالانە گەشەدەکەن لەسەر لادان و بەرەڵایی و بەدرەوشتی، وە لەسەر تاوان و خراپەکاری پەروەردە دەبن.

چاکترین شتێ کە ئافرەتی لەسەر بخوازرێت بریتیە لە دینەکەی و رەوشتی چاك و

[1] صحيح سنن الترمذي: ٨٦٦, الارواء: ١٨٦٨ حديث صحيح.

لەخوا ترسانی, جا بەم جۆرە ئافرەتە چاو رۆشن دەبێتەوە, ئەمیندار دەبێ لەسەر خۆی و ماڵ و سامانی و مێردەکەی بەشێوەیەکی گونجاو پەروەردەی منداڵەکانی دەکات, بەختەوەر ئەبن, شەرەفیان دامەزراو ئەبێ, ئارام ئەگرن و ئەحەوێنەوە [1].

٢ - هەلبژاردن لەسەر بنەمای شەرەف و خانەدانی:

یەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی هەڵبژاردنی هەریەکێ لە هاوسەر بۆ ئەوی تریان کە ئیسلام دایناوە, ئەوەیە هەڵبژاردنی هاوسەر بۆ هاوەڵی ژیان لە خێزانێکی خاوەن ڕێزو خانەدان بێ و بنەماڵێەکی بەشەرەف و ناسراو بن بەچاکی رەوشتیان, چونکە مرۆڤەکان وەك کانزا وان جیاوازی هەیە لە نێوانیاندا ئەگەر چاك و خاوەن شەرەف بوون ئەوا منالەکانیشیان وەك ئەوان دەرئەچن, هەروەها بەپێچەوانەشەوە ئەگەر خراپ بوون ئەوا ئەوانیش هاوشێوەی ئەوان دەبن!!..

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم باسی ئەوەی کردووە کە خەڵك وەك کانزان جیاوازن لەڕووی شەرەف و رەچەڵەك و خێرو خراپەوە:

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(النَّاسُ مَعَادِنٌ كَمَعَادِنِ الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ ، خِيَارُهُمْ فِي الجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا)**[2]. واتە: خەڵك کانزان, وەك کانزای ئاڵتون و زیو وان لەخێرو خراپەدا, ئەوەیان لە نەفامیدا چاك و باش بێ لە ئیسلامیشدا هەر چاك دەبێ ئەگەر تێکەیشت لە ئایین و موسڵمان بوو.

---

[1] پێویستە یەکەمین هەوڵ ئاڕاستەی ماڵ بکرێت, ئاڕاستەی هاوسەر یان دایك بکرێ, پاشان ئاراستەی منالەکان بکرێت پاشان بۆ کەس و کاری بەگشتی, پێویستە گرنگی تەواو بەپێگەیاندنی ئافرەتی موسڵمان بدرێت تا ماڵێکی موسڵمان پێ بگات و دروست ببێ, ئەو کەسەش ئەیەوێت ماڵێکی موسڵمان بنیات بنێ پێویستە یەکەمجار بەدوای ئافرەتێکی موسڵماندا بگەڕێت, ئەگینا بنیات نانی کۆمەڵی ئیسلامی دوادەکەوێ و دیوارەکانی بەبێ هێزی و پڕ لە کەلێن دەمێنێتەوە. لەکتێبی دستور الاسره فی القرأن الکریم ص١١٢ وەرگیراوە.

[2] أخرجه مسلم ٤١/٨ ( ٢٦٣٨ ) ( ١٦٠ ), والطيالسي والعسكري و إبن منيع, مشكاة المصابيح: ٢١٠/١.

لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەڵکی هانداوە لەسەر هەڵبژاردنی هاوسەری چاك و خاوەن بنەماڵەی خانەدان و بەشەرەف و ناسراو.. ئەمانەی لای خوارەوەش چەند فەرموودەیەکن لەو بارەوە:

* ئەبو سەعیدی خودری رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**إيّاكُم وخَضراء الدِّمَن**). واتە: ئاگادارتان دەکەمەوە لە(**خضراء الدِّمَن**), وتیان: (**خضراء الدِّمَن**)چیە؟ فەرموی: (**المرأة الحَسناء في المنبت السوء**)[1] . واتە:گیایەکە لەناو پیاسیدا گەشەدەکات و گەورە دەبێت. جا گیای ناو پیسایی و سەرەنوێلك زوو بەرز دەبێ و گەشەدەکات بەڵام سودی نیە, ئەوەش کینایەیە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە خاوەنی قەدو بالای بەرزو جوانن بەڵام روکاری ناوەوەیان هیچ نیەو بەکەڵکی هاوسەری نایەن.

* عائیشە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ وَانْكِحُوا الْأَكْفَاءَ** )[2] . واتە: ئافرەتانی گونجاو بۆ نوتفەکانتان هەڵبژێرن, وە با هاوکوفی خۆتان بن.

* ئافرەتانی چاك و گونجاو هەڵبژێرن چونکە نەخۆشیە بۆماوەکان لە باوانەوە بۆ نەوەکانیان دەگوێزرێنەوە هەروەك لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی پێدراوە: (**تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ فإن العِرقَ دسَّاس**) [3].

* عائیشە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ فإن النِساء تلدن أشباه إخوانهن وأشباه أخواتهن**) [4] . واتە: ئافرەتانی چاك بۆ نوتفەکانتان هەڵبژێرن, چونکە ئافرەتان هاوشێوەی براو

---

[1] ضعيف رواه دارالقطني والعسكري وإبن عدي مرفوعا, سلسلة الضعيفة: ٦٩/١ برقم: ١٤.

[2] صحيح, رواه ابن ماجه: ١٩٥٧, ودارالقطني والحاكم, تحقيق الألباني : (صحيح) انظر حديث رقم: ٢٩٢٨ في صحيح الجامع.

[3] موضوع: رواه إبن ماجة والديلمي, سلسلة الضعيفة: ٣٤٠٠/٧.

[4] رواه إبن عدي وإبن عساكر مرفوعا: حقيق الألباني: (موضوع) انظر حديث رقم: ٢٤١٥ في ضعيف الجامع.

خوشکەکانی خۆیان دەبێت.

* لە ریوایەتێکی تردا فەرمویەتی: **(اطلبوا موضع الاكفاء لنطفكم, فإن الرجل ربما أشبه أخواله)**[1]. واتە: ئافرەتانی چاك و هاوشان بۆ نوتفەکانتان هەڵبژێرن, چونکە لەوانەیە پیاو بچێتەوە سەر خاڵوانی.

* ئافرەتانی چاك و پەروەردەکراو هەڵبژێرن, چونکە نەخۆشیە بۆماوەکان دەگوێزرێنەوە لە باوانەوە بۆ نەوکانیان هەروەك لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی پێدراوە: **(تزوجوا في الحجر الصالح فإن العِرقَ دسَاس)**[2].

ئەم فەرموودانە هەموویان بەکۆ رێنوومایین بۆ ئەوانەی ئەیانەوێ هاوسەربگرن, با هاوسەری چاك و هاوەڵی باش بۆ خۆیان دەست نیشان بکەن کە لە خانەوادەیەکی خاوەن شەرەف و خانەداندا پەروەردەبووبن, لە نوتفەی چاك و حەڵاڵ بن, نهێنی ئەمەش لەوەدایە تا پیاو کوڕو کچی خاوەن رەوشت و ئیمانداری وەك ئەوانی ببێ, دابونەریتی ئەوان پەیڕەو بکات, بەئاکارو رەوشتە بەرزەکانی ئەوان خۆی برازێنێتەوە..!!

- هەر لەسەر ئەم بنەمایانە بووە عوسمانی کوڕی ئەبو عاصی سەقەفی ئامۆژگاری منداڵەکانی کردووە ئافرەتی چاك و گونجاو هەڵبژێرن بۆ نوتفەکانیان, بەدوور بن لەڕەگ و ریشەو بنەچەی خراپ.. ئەوەش ئێوەو ئەو وتەیەی کە گوتی بە منداڵەکانی: رۆڵەکانم! ژنخواستن وەك نەمام ناشتن وایە, ئەبێ پیاو بزانێ لە کوێدا ئەو نەمامە ئەچێنێ, شوێنەکەی ئەبێ لەبارو گونجاو بێت رەگ و ریشەی خراپ کەم جار نەجیب و نایاب دەردەچێ, شوێنی لەبارو گونجاو هەڵبژێرن بۆ نوتفەکانتان با لەپاش ماوەیەکی زۆریش بێ, پەلەمەکەن هەتا لەو جۆرەتان دەسدەکەوێ.

- بۆ سەلماندنی ئەو هەڵبژاردنەش عومەری کوڕی خەتتاب رەزای خوای لێ بێ لەوەڵامی پرسیاری ئەو منالەدا کە وتی حەقی کوڕ چییە لەسەر باوکی؟. فەرموی:

---

1- موضوع: في ضعيف الجامع: ٢٤٢٨.

2- رواه إبن عدي في الكامل مرفوعاً, تحقيق الألباني: (موضوع) انظر حديث رقم: ٢٤٢٨ في ضعيف الجامع.
تێ بینی ئەم فەرموودانەی سەرەوە هەموویان بەتەنها لاوازن بەڵام بەکۆ(حسن)ن.

دایکێکی چاکی بۆ هەڵبژێرێ, ناوێکی چاکی لێ بنێ و, فێری قورئان خوێندنیشی بکات.

ئەم هەڵبژاردنەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاراستەی ئوممەتی کردووە یەکێکە لە گەورەترین حەقیقەتە زانستیەکان و, تیۆرەکانی پەروەردەیی ئەم سەردەمە.. زانستی بۆماوە سەلماندویەتی کە منداڵ لە سەرەتای لەدایك بوونیەوە سیفاتی باوانی ئەگوێزێتەوە جا چ لەڕووی جەستەییەوە بێ یان لەرووی ئەقڵی و ڕەوشتییەوە.. جا ئەگەر هەڵبژاردنەکە لەسەر بنەمای بنەماڵەی خاوەن شەرەف و چاك و گونجاو بوو, گومانی تێدا نیە منالەکان لەسەر چاکە و دامەزراوی و پاکی گەشە ئەکەن.. ئەگەر منالّ هۆکاری بۆماوەکەی چاك بوو, هۆکاری پەروەردەکەشی هەر چاك بوو ئەو کاتە دەگاتە چڵەپۆپەی رەوشتی جوان و دینداری, نموونەی خاوەن تەقواو ئاکاری جوان و هەڵسوکەوتی چاك و خورەوشتی بەرز وشکۆدار دەبێ..

٣- باشتر وایە هاوسەر خزمی نزیك نەبێت:

یەکێکی تر لە ئاراستەکردنە پڕ لە حیکمەتەکانی ئیسلام بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر ئەوەیە فەزڵی ئافرەتی بێگانەی داوە بەسەر ئافرەتانی خزم و خوێشدا, بۆ بەتەنگەوە چوونی رەسەنی منداڵ و دەستەبەرکردنی ساغ و سەلامەتی و پاراستنی جەستەی لە نەخۆشیە بۆ ماوەو درمەکان و, فراوان بوونی پەیوەندی و یەکترناسین لە نێوان خانەوادەکان و, بەهێزی پەیوەندی کۆمەڵایەتیان.

بەوەش جەستەی منداڵەکانیان بەهێز دەبێ, برایەتی و خۆشەویستیان پتەو دەبێ, خزم و ناسیاوی لە نێوان بنەماڵە و هۆزەکاندا بەر فراوان دەبێ!!.. بۆیە دەبینن پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاگاداری کردوینەتەوە لە هەڵبژاردنی هاوسەری خزم و نزیك, تاکو نەبێتە هۆی لاوازی و بێ هێزی جەستەی منداڵ و, سیفەتە بۆماوەیی و نەخۆشیەکانی باوانیان نەگوێزرێتەوە بۆیان. یەکێك لە ئاگادایەکانی ئەمەیە کە دەفەرموێ لە خزمە نزیکەکان ژن مەخوازن, چونکە منداڵەکانتان لاوازو نازیرەك دەبن: **(لاتنكحوا القرابة فإن الولد يخلق ضاويا)**. هەروەها دەفەرموێ: **(إغتربوا**

**ولا تضووا)** [1].

زانستی بۆ ماوەزانی دەریخستووە کە خواستنی ئافرەتی خزم ئەبێتە هۆی لاوازی و بێ هێزی منداڵ لەڕووی جەستەییەوە, هەروەها زیرەکی کەمتر تێدا دەردەکەوێ, سیفاتە خراپەکانیش بۆ منداڵاّن ئەگوێزێتەوە لەگەڵ داب و نەریتە کۆمەڵایەتیە بێزراوو ناتەواوەکان..

پێویستە لەدوور کەوتنەوەکەدا خێزانی بەهێزتر و خاوەن توانای عەقڵی وجەستەیی چاکتر بدۆزرێتەوە بۆ ئەوەی منداڵان لە خێزانی یەکەم چاکترو بەهێزتر بن, هەتا ئەو دوو خێزانەش وەچەو نەوەی بەتواناتر و چاکتریان لێ بکەوێتەوە.

ئەم حقیقەتەش یەکێکە لە موعجیزەکانی تری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم, وەك چەندەها موعجیزاتی ترو, و هەواڵە راستەکانی..

٤ - هاوسەر کچ بێت چاکترە:

یەکێکی تر لە ئاراستەکردنە هۆشیاریەکانی ئیسلام لە هەڵبژاردنی هاوسەردا ئەوەیە فەزڵی کچی داوە بەسەر بێوەژندا, چونکە حیکمەتی زۆرو سوودی گەورەی تێدایە!.

لەو سوودانە: پاراستنی خێزانە لە ناخۆشیەکانی ژیان و, کەوتنە ناو داوی دووبەرەکی و دوژمنایەتی, لە هەمان کاتدا کچ بەپەرۆشترەو خۆشەویستی زیاترە بۆ مێردەکەی, چونکە یەکەمجارە دەگات بەپیاوێکی لەو جۆرەو یەکتری ئەناسن, بۆ پاك راگرتنی خۆی و پاراستنی ئابڕوی, هاورێ لەگەڵ ئەوەشدا رۆڵێکی گەورەی هەیە لە رووی ئارامی و دڵنیایی دەروونیەوە.. بەپێچەوانەوە بێوەژن لەبەر ئەوەی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کەسێکی تردا کردووە, بەتەواوی رووناداتە مێردی دووەمی و خوی پێوەناگرێ, خۆشەویستی تەواوی ناداتێ, بەڕاستی و بەدڵ وابەستە نابێ پێیەوە, لەبەر ئەو جیاوازیە زۆرەی نێوان رەوشتی مێردی یەکەمی و هەڵسوکەوتی مێردی دووەمی.

بەلاتانەوە سەیر نەبێت کە خاتو عائیشە رەزای خوای لێ بێ مانای هەموو ئەمانەی بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم روونکردۆتەوە, لەکاتێکدا کە پێی

---

[1] - ئەم فەرمودەیە حافظی عیراقی لە تەخریج کتێبی (الأحیاء علوم الدین)ی ئیمام غەزالیدا بە وتەی عومەری کوڕی خەتابی داناوە واتە لای ئەو فەرموودە نیە .

فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر بچیتە ناو شیو دۆڵێکەوە دارو درەختی لێ بێ لەوەڕی لێ کرابێ و, دارو درەختی وای لێ بێ لەوەڕی لێ نەکرابێ, لەکامیان حوشترەکەت دەلەوەڕێنی؟ پێغەمبەرصلی الله علیه وسلم وەڵامی دایەوەو فەرموی: (**فِي الَّذِي لَمْ يُرْتَعْ مِنْهَا**). واتە: لەوەیان لێی نەخورابێ, عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرموی: دەی ئەوە منم[1]. مەبەستی ئەوە بوو فەزڵی خۆی روون بکاتەوە بەسەر خێزانەکانی تریدا بە ئیعتیباری ئەوەی کە تەنها ئەوی بەکچێتی هێناوە.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاماژەی بەهەندێ لە حیکمەتی هاوسەری کچ داوەو فەرمویەتی: (**عَلَيْكُمْ بِالْأَبْكَارِ فَإِنَّهُنَّ أَعْذَبُ أَفْوَاهًا وَأَنْتَقُ أَرْحَامًا وَأَرْضَى بِالْيَسِيرِ**) [2]. واتە: کچان مارەبکەن و بیان کەنە هاوسەری خۆتان, چونکە قسەیان خۆشەو منداڵی زۆریان ئەبێ و بەکەم قەناعەت دەکەن و رازین بەبەشی خۆیان.

هەروەها پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاماژەی کردووە بەوەی کەکچان خۆشەویستیان زیاترە بۆ مێردو زیاتر بەپەرۆشەوەن بۆ چاك ڕاگرتنی خۆیان و ئابڕوویان.

کاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە جەنگی(**ذات الرقاع**) گەڕایەوە بە جابری فەرموو: ئایا ژنت هێناوە؟ گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا!. فەرموی: (**أَبِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا**) کچە یان بێوەژن؟ گوتم بێوەژنە, فەرموی: (**أَفَلَا تَزَوَّجْتَ بِكْرًا تُلَاعِبُكَ وَتُلَاعِبُهَا**) بۆ کچت نەهێنا بۆ ئەوەی گەمەت لەگەڵدا بکات و یاری و گەمەی لەگەڵ بکەیت؟ دڵخۆش ئەبوون بەیەکترو بەیەکەوە گونجانتان چاکتر دەبوو. گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! باوکم لە جەنگی ئوحوددا مردووە حەوت خوشکم هەیە من بەخێویان دەکەم بۆیە بێوەژنم هێناوە تاکو سەرپەرشتیان بکات, فێری ئەدەب و رەوشتی جوانیان بکات, قژیان شانە بکات, ئەگەر هاوتەمەنی خۆیانم بهێنایە ئەوە بێگومان خزمەتی ئەوانی بەو شێوەیە پێنەدەکرا, پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموی: (**أَصَبتَ إنشَاءَ الله**) [3].

---

1- صحيح رواه البخاري, سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٣١٠٥/٧.

2- حسن رواه إبن ماجة: ١٨٥١, سلسلة الصحيحة: ١٩٢/٢برقم ٦٢٣.

3- صحيح رواه البخاري ومسلم, سلسلة الصحيحة:٦٠٤/٦ برقم ٢٧٨٥.

بە ویستی خوا پێکاوتە.

ئەم فەرموودەی جابرە رەزای خوای لێ بێ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کچ خواستن چاکترە لە بێوەژن, تەنها لە هەندێ حاڵەتدا نەبێت, وەك ئەو حاڵەتەی جابر بۆ ئەوەی چاودێری و سەپەرشتی منداڵە هەتیوەکان بکات و یارمەتی دەریان بێت. بۆ سەلماندن و بەجێهێنانی ئەم ئایەتەش: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى..﴾. **المائدة: ٢.** واتە: لەسەر چاکەو تەقوا یارمەتی یەکتری بدەن..

٥ - چاکتر وایە منداڵی ببێ و نەزۆك نەبێ:

یەکیکی تر لە ئاڕاستەکردنەکانی ئایینی پاکی ئیسلام لە هەڵبژاردنی هاوسەردا ئەوەیە منداڵی ببێت, ئەوەش بەدووشتدا دەردەکەوێ:

یەکەم: جەستەی ساغ و سەلامەت بێ لەو نەخۆشیانەی ئەبنە هۆی منداڵ نەبوون, ئەوەش بەیارمەتی پسپۆڕانی شارەزا لەو بوارەدا دەزانرێت.

دووەم: بەسەیرکردنی حاڵی دایك و ئەو خوشکانەی کە شویانکردووە ئەگەر ئەوان مناڵیان بوو, ئەوا ئەویش بەزۆری ئەچێتەوە سەر ئەوان.

وەك ئاشکرایە لەڕووی پزیشکیەوە ئەو ئافرەتەی منداڵی ئەبێت بەزۆری تەندروستی باشەو جەستەی چالاك و بەهێزە.. ئەوەی ئەم دیاردانەی تێدابێ باشتر ئەتوانێ هەستێ بەبەڕێوەبردن و راپەڕاندنی کاروباری ناو ماڵ, بەجێهێنانی ئەرکی پەروەردەیی و, بەمانای جوامێری و مەردایەتی و بەشێوەیەکی تەواو مافی مێردەکەی دەدات.

ئەمەش ئاماژەیە بەوەی پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە ژنێکی ئاوا ئەخوازێ مناڵی ببێ و, سورە لەسەر خستنەوەی نەوەو وەچە, ئەبێ هەستێ بەئەنجامدانی کارەکانی بە رێکوپێکی و ئەو بەرپرسێتیەی لەسەر شانیەتی, ئیتر بەرپرسێتی خەرجی و بژێوی ژیان بێ, یان بەرپرسێتی پەروەردەیی و فێرکردنی زانست و زانیاری بێ, ئەگەر زێدەڕۆیی یان کەموکوڕی بکات لەو ئەرکانەی لەسەریەتی ئەوا خوای گەورە لێی دەپرسێتەوە موحاسەبەی دەکات, پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم راستی فەرمووە کاتێك کە دەفەرموێت: **(إِنَّ اللَّهَ سَائِلٌ كُلَّ رَاعٍ عَمَّا اسْتَرْعَاهُ, أحَفِظَ ذلِكَ أَمْ**

**ضَيعَه؟ حَتّى يَسْأل الرَجُل عَن أهْل بَيْتِه)**[1]. واته: خوای بالاّ له هەموو لێپرسراوێك دەپرسێتەوە, لەبارەی ئەو کەسانەی لەژێر دەستیدا کاریان کردووە, ئایا مافی ئەو کەسانەی پاراستووە یان فەوتاندوویەتی؟ تەنانەت پیاویش دەربارەی خانەوادەکەی پرسیاری لێ دەکرێت.

بەکورتی پوختەی ئەوەی لە پێشەوە لێی دواین ئەوەیە: ئەوەی ئەیەوێ ئەرکی بەرپرسێتی منداڵەکانی بخاتەگەردنی خۆیەوە بەو شێوەیەی کە ئیسلام داوای کردووە, بابگەڕێت بەدوای ئافرەتێکی گونجاودا کە منداڵی ببێ و نەزۆك نەبێ, بۆ ئەوەی ژمارەی نەتەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم زیاد بکات کە چاکترین گەل و کۆمەڵ بوون هێنراونەتە ئەم سەر زەویە بۆ کەڵك گەیاندن بەخەڵك و رێنمایی کردنیان, ئەوەش تەنها بە ئارستەکردنەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەبێت, کاتێك پیاوێك هاتە خزمەتی و پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! من ئافرەتێکی جوان و خانەدان و خاوەن سامانو خۆشدەوێ و ئەمەوێ خوازبێنی بکەم بەلاّم منالّی نابێ, ئایا بیکەمە هاوسەری خۆم؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگەی نەدا, دووەم جار هاتەوەو بەهەمان شێوە رێگەی نەدا, سێیەم جار هاتەوە پێی فەرموو: **(تَزَوَّجُوا الْوَلُودَ الْوَدُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ الأُمَم)**[2]. واتە: ئەو ئافرەتانە بکەنە هاوسەری خۆتان کە منالّیان ئەبێ و خاوەنی خۆشەویستی و ئەوینن, چونکە من شانازی بەزۆریتانەوە دەکەم لەناو نەتەوەکانی تردا, حەز دەکەم ژمارەشتان زۆر بێ.

ئەمانە گرنگترین دروشمی هاسەرگرتن بوون, هەروەها پەیوەندی گرنگیشیان هەیە بەبواری پەروەردەوە.. ئیسلام چارەسەری بۆ پەروەردەی تاکەکان لەسەرەتای پێکهێنانی خێزانەوە داناوە, چونکە وەلاّمدانەوەی سروشت و فیترەتی پاکی مرۆڤەو, لە وێشەوە سەرچاوەی دەگرێ, هەنگاو هەڵگرتنە لەسەر خۆشیەکانی ژیانی دنیا, منداڵ لە رێگەی نەژادەوە دەگەیەنێ بەباو باپیرانیان, کۆمەڵگەش دەپارێزێ لە نەخۆشیە

[1] - رواه ابن حبان في صحيحه : ٤٥٧٠, قال الألباني صحيح في غاية المرام: ٢٧١..

[2] صحيح رواه النسائي: ٣١٧٥, وابو داود: ١٧٥٤, سلسلة الأحاديث الصحيحه: ٥/ ٤٩٧, برقم: ٢٣٨٣.

کوشندەو ترسناکەکان و, هەڵوەشانەوەی ئاکارو رەوشتە بەرزەکان, وە دەستەبەرکردنی هاوکاری ژن و مێردە بۆ پەروەردەکردنی منداڵان بە شێوەیەکی شیاو, پەرەسەندنی سۆزو خۆشەویستی باوکایەتی و دایکایەتیە لە دەروونیاندا..

بۆ ئەوەی بناغەی هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان پتەو بێت, دەبێت هاوسەر بەدین بێت, خانەدان و خاوەن شەرەف بێت, کچ بێت چاکترە لەوەی کە بێوەژن بێ.

کاتێ موسڵمان زانێ لە کوێوە دەسپێدەکات؟ بۆ پێکهێنانی خانەوادەیەکی موسڵمان, خستنەوەی وەچەی چاك و, نەوەی ئیماندار.. ئەو کاتە ئەرك و بەرپرسیارێتیەکانی تر لەبەر چاوی ئاسایی دەبن.

بۆچی؟ چونکە بەردی بناغەی ماڵەکەی پتەوە کە بینای پەروەردەی راست و چاکسازی کۆمەڵگەی لەسەر دەکات, ئەویش ئافرەتێکی ئیماندارو چاکە!!.

کەواتە پەروەردەکردنی منداڵان لە ئیسلامدا پێویستە یەکەم شت لە هەڵبژاردنی هاوسەری نمونەییەوە دەست پێبکات, لەسەر دروشمی دامەزراوبێت, بۆ ئەوەی کاریگەری چاکی هەبێت بۆ پەروەردەو, ئامادەکردنی نەوەیەکی کامڵ و پێگەیشتوو!![1].

دەی کەواتە ئاگادار بن ئامۆژگاری وەربگرن ئەی خاوەن ئاوەزو هۆشمەندەکان..

---

[1] پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پوختەی ئەو رەوشتانەی کە لەئافرەتێکی هەڵبژاردەو شیاودا هەیە خستۆتەڕوو کە ئەمانەن: نەزۆك نەبێ و وەچەو منداڵ بخاتەوە, بەسۆزو بەزەیی و دڵ نەرم بێ, کەموکوڕیەکان بشارێتەوە, داوێن پاك و پارێزگاربێ, لەکردارو ڕەفتاردا دەروون بەرزبێ و گوێڕایەڵی مێردەکەی بێ, بۆ مێردەکەی کراوەو بۆ کەسانی تر داخراو بێت, مێردەکەی داوای چی لێکرد بیداتێ, رەوشت زبرو دڵ ڕەق نەبێ. وەرگێڕ.

# بەندی دووەم: هەست و سۆزی دەروونی لای منداڵان

مەبەست لە هەستی دەروونی: ئەو سۆزو خۆشەویستی و بەزەییەیە کە خوای گەورە خستویەتیە دڵی باوك و دایکەوە بەرامبەر بەمناڵەکانیان.. حیکمەتیش لەوەدا نەهێشتنی ئەو دابونەریتە دزێوو ناشیرینانەی سەردەمی نەفامیە کە لەناو دڵ و دەروونی هەندێ کەسی نەخۆشدا تا ئێستاش هەر ماوە, ئەویش ئەوەیە بەچاوی سوکەوە سەیری کچان دەکەن, هەروەها دەرخستنی گەورەیی و پاداشتی خێری ئەو کەسانەیە کە خۆراگرن لەسەر مردنی منداڵ.. لە کۆتایدا دەبێت دایك و باوك چی بکەن ئەگەر بەرژەوەندی منداڵ یەکنەکەوت لەکەڵ بەرژەوەندی ئیسلامدا؟

ئەم هەموو هەست و سۆزە دڵ و دەروونیانەو, چەندەها پرسیارو بیرو بۆچوونتان بەپشتیوانی خوای گەورە لەم بەندەدا بۆ روون دەکەینەوە:

**أ- خۆشەویستی دایك وباوك بۆ مناڵ کارێکی فیترییە:**

وەك ئاشکراو روونە خۆشەویستی و ئارەزووی منداڵ لەدڵی دایك و باوکدا شتێکی فیتریەو رەگی داکوتاوە لەناو دڵ و دەروونیاندا, بەو هەست و نەستەیە باوك و دایك مناڵەکانیان دەپارێزن, بەزەییان پێیاندا دێتەوە, بەخێویان دەکەن و, گرنگی دەدەن بەئەرك و کارو بارەکانیان.

ئەگەر ئەوەش نەبوایە ئەوا جۆری مرۆڤەکان لە زەویدا بەرەو نەمان دەچوو, دایك و باوك خۆڕاگر نەدەبوون لەسەر چاودێری منداڵەکانیان, خەرجیان نەدەکێشان, پەروەردەیان نەدەکرن, شەونخونیان نەدەکێشا لە پێناوی ئەرکەکانیاند, بەرژەوەندیەکانیان لەبەر چاو نەدەگرت.

بەلاتانەوە سەیر نەبێت کە قورئان چەندە بەشێوەیەکی جوان ئەو هەستە راستەقینەیەی دایك و باوکی وێنەکێشاوە جارێ منداڵانی بەزینەت و جوانی و ژیانی دنیا ناوی هێناوە: **﴿الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا..﴾. الكهف: ٤٦**. واتە: سامان و ماڵ و منداڵ زینەت و خۆشی ژیانی دونیان..

جارێکی تربە بەخشش یکی گەورە ناوی دەبات کە هەقە سوپاسگوزاری خوای لەسەر بکرێ: ﴿وَأَمْدَدْنَاكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَاكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا﴾. **الاسراء:٦**. واتە: ماڵ و سامان و نەوەیەکی زۆرمان پێ بەخشین, وە ژمارەمان گەلێك زۆرکردن هەتا رێگای راست بگرنەبەرو ئامادەبن بۆ هێرش بردن و پەلاماردان ..

سێیەم جار لە شوێنێکی تردا بەڕووناکی و بیبیلەی چاو ناویان دەبات ئەگەر شوێن رێبازی خوا ناس خاوەن تەقواکان بکەون: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾. **الفرقان: ٧٤**. واتە: ئەوانەی بەدڵ لەخوا دەپاڕێنەوەو دەڵێن: پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەکانماندا کەسانێکمان پێ ببەخشە کە ببنە مایەی رووناکی چاومان و شادمانی دڵمان, لە چاکەکاری و خوا ناسیدا بمانکە بەپێشەوا بۆ ئیماندارانی لە خوا ترس و خاوەن تەقوا, یارمەتیمان بدە بۆ ئەوەی فەرمانەکانتیان پێ بگەیەنین و, رێنماییان بکەین بۆ سەر رێگای راست .

ئەم ئایەتە پیرۆزانەو چەندەها ئایەتی تر وێنەی سۆزو بەزەیی دایك و باوکمان بۆ روون ئەکەنەوە بەرامبەر مناڵەکانیان و راستی هەست و نەست و خۆشەویستیان بەدڵ بۆ جگەرگۆشەو بەرهەمی دڵەکانیان.

ئەوەش ئێوە- ئەی خوێنەرە بەڕێزەکان- هۆنراوەی شاعیرە بەناوبانگەکان دەربارەی خۆشەویستی منداڵ و هەست و سۆزی دەروونی نەرم و نیانی بەرامبەریان, ئەو هەموو هۆنراوانەش بەدڵنیاییەوە بەڵگەن بۆ ئەو هەست و سۆزو خۆشەویستییەی کەخوای گەورە بەخشیویەتی بەدڵی دایك و باوك, بۆ ئەوەی هەرچی لە توانایاندا هەیە بیخەنەگەڕو هەوڵبدەن بۆ پەروەردەکردنی منداڵ و ئامادەی بکەن بۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤێکی چاك بۆ ژیان.

- سەرەتا لە هۆنراوەیەکی (**أمية بن أبو صلت**)وە دەست پێدەکەین کە دەربارەی کوڕەکەی ئازاری دابوو وتویەتی, یەکێکە لەو هۆنراوە ناسك و پاراوانەی کە راستی هەست و سۆزی دڵ و دەروونی باوکایەتی دەردەخەن بەرامبەر بە منداڵ:

**غذوتُك مولوداً وعلتُك يافعاً**

**تَعُلّ بما أجني عليك وتنهل**

**إذا ليلةٌ ضافتك بالسقم لم أبت**

**لسقمك إلاّ ساهراً أتململ**

**كأني أنا المطروقُ دونك بالذي**

**طُرِقتَ به دوني فعينيَ تَهمِل**

**تخاف الردى نفسي عليك وإنها**

**لتعلم أن الموت وقت مؤجل**

**فلما بلغت السنّ والغايةَ التي**

**إليها مدى ما آنت فيك أؤمِّل**

**جعلتَ جزائي غلظةً وفظاظة**

**كـأنك أنت المنعم المتفضِّل**

**فليتك إذ لم ترعَ حق أبوّتــي**

**فعلتَ كما الجار المجاور يفعل**

**فأوليتني حق الجوار فلم تكن**

**عليَّ بمالٍ دون مالك تبخل.**

- گوێ بگرن بزانن(**أبو بكر الطرطوسي**) دەربارەی چەشتنی ئازارو نارەحەتی باوك و دایك لە كاتی وەفاتی منداڵیاندا دەڵێ چی:

**لو كان يدري الابنُ أيّة غُصّةٍ**

**يتجرّعُ الأبوان عند فِراقهِ**

**أمٌّ تهيج بوَجْد حيرانـة**

**وأبٌ يسحّ الدمعَ من آماقه**

**يتجرعان لِبَيْنه غصصَ الرَّدَى**

**ويبوح ما كتماه من أشواقه**

**لَرَثَى لأمٍ سُلّ من أحشائها**

**وبكى لشيخ هام في آفاقه**

**ولبدّل الخلق الأبيَّ بعطفه**

**وجزاهما بالعطفِ من أخلاقه**

- یەکێکی تر لەو شاعیرانە دەربارەی هەست و سۆزی دڵ و دەروونی باوکایەتی دەڵێ:

**لقد زاد الحياة اليّ حبا**

**بناتي إنهن مـن الضعاف**

**أحاذر أن يريْنَ الفقرَ بعدي**

**وأن يشربْن رنْقاً بعد صاف**

**وأن يريْن إن كُسيَ الجواري**

**فتنبو العينُ عن كرم عجاف**

**ولولا ذاك قـد سوَّمت مُهر**

**وفي الرحمن للضعفاء كاف**

**أبانا مَنْ لنا إن غبت عنا**

**وصار الناس بعدك في اختلاف**

* * *

**ولولا بُنيّات آزُغْب القطا**

**حُطِطْنَ من بعضٍ إلى بعض**

**لكان لي مضطربٌ واسع**

**في الأر ذات الطول والعرض**

**وإنما أولادنا بيننا**

**أكبادنا تمشي على الأرض**

**لو هبّت الريح على بعضهم**

**لامتنعت عيني من الغمض**

* * *

لە کۆتایدا شاعیری گەورە مامۆستا **(عمر بهاء الأميري)** کاتێك هەر هەشت منداڵەکەی بۆ گەشت و گوزار دەچنە هاوینەهەواری حەلەب, ئەویش لەماڵەوە بەتەنها دەبێت, هۆنراوەیەکی جوان و پاراو دەهۆنێتەوە دەربارەی خۆشەویستی باوك بەرامبەر بەمنداڵان و دەڵێ:

أين الضجيج العذبُ والشغَبُ

أين التدارسُ شابَه اللعبُ

أين الطفولة في تَوَقُّده

أين الدُمى في الأرض والكتبُ

أين التشاآس دونما غرضٍ

أيـن التـشاكي ماله سبَبُ

أين التباكي والتضاحكُ في

وقتٍ معاً، والحزنُ والطربُ

أين التسابق في مجاورت

شغَفاً إذا أكلوا وإن شربوا

يتزاحمون على مجالستي

والقرب مني حيثما انقلبوا

يتوجهون بسَوْق فطرتهم

نحوي إذا رَهبُوا وإن رغبوا

فنشيدُهُمْ: (بابا) إذا فرِحوا

ووعيدُهُمْ: ( بابا ( إذا غضبوا

وهتافهُم:) با با( إذا ابتعدوا

ونجيُّهم: ) با با( إذا اقتربوا

بالأمس كانوا ملءَ منزِلنا

واليومَ، ويحَ اليوم، قد ذهبوا

وكأنما الصمتُ الذي هبَطَت

أثقاله في الدار إذ غَرَبوا

إغفاءةْ المحموم هدْأتُها فيها

يشيعُ الهمّ والتعب

ذهبوا، أجلْ ذهبوا، ومسكنُهُم

في القلب، ماشطّوا وما قرّبوا

إني أراهم أينم التفتَتْ

نفسي وقد سكنوا، وقد وثبوَا

وأحسّ في خلَدي تلاعبُهم

في الدار ليس ينالهم نصبُ

وبريقَ أعينهم، إذا ظفروا

ودموعَ حُرقتهم إذا غُلبُوا

في كل ركن منهمُ أثرٌ

وبكلّ زاوية لهم صَخَبُ

في النافذات زُجاجَها حطموا

في الحائط المدهون قد ثقَبُوا

في الباب قد آسروا مَزالجه

وعليه قد رسموا وقد كتبوا

في الصحن فيه بعضُ ما أكلوا

في علبة الحلوى التي نهبُوا

في الشطر من تفاحَة قضموا

في فضلة الما ء التي سكبوا

إني أراهم حيثما اتجهت

عيني كأسراب القطا سَرَبوا

بالأمس في قرنايلٍ نزلوا

واليوم قد ضَمتهُمُ حَلَبُ

دمعي الذي آتّمتُه جلداً لما

تباكوا عند ماركبوا

حتى إذا ساروا وقد نزعوا

من أضلعي قلباً بهم يجبُ

الفَيْتُني كالطفل عاطفةً

فإذا به الغيث ينسكب

**قد يعجب العُذّال من رجلٍ**

**يبكي، ولو لم أبكِ فالعجبُ**

**هيهات ما كل البُكا خَوَر**

**إني وبي عز الرجَال أبُ**

بەم شێوەیە بۆمان دەركەوت خۆشەویستی دایك وباوك بۆ منداڵ كارێكی سروشتی و فیتریە, یاسایەكی یەكجار گونجاوە لەگەڵ یاسای سەرجەم ژیان و فیترەتی مرۆڤەكان, ئەویش لەبەر ئەوەیە چاودێری و پەروەردەیان بكەن, گرنگی بدەن بە كاروبارو بەرژەوەندیان.

مرۆڤ حەز دەكات وێنەی خۆی لە منداڵەكەیدا ببینێتەوە میرات بەرێك لەدوای خۆی بەجێ بهێڵێ, بۆ ئەوەی بەری ماندووبوونی بەهەدەر نەڕوات [1].

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ..**﴾. **الروم:٣٠.** واتە: دینێكی بنەڕەتیەو لە سروشتدا خوا ئەو خەڵكەی هەر یەكتا پەرستی وەدی هێناوە, كاری خودا گۆڕانی بەسەردا نایە..

**ب- سۆزو بەزەیی خوای گەورە داویەتی بەبەندەكانی:**

ئەو هەستە جوامێریەی خوای گەورە بەخشیویەتی بەدڵی دایك و باوك هەستی سۆزو بەزەیی بەرامبەر بەمنداڵان, نەرم و نیانی لەگەڵیان, دڵسۆزی و بەسۆزی بەرامبەریان.. هەستێكی رەسەنەو كاریگەری هەیە بۆ ئامادەكردن و پێگەیاندن و پەروەردەكردنی منداڵان و, بەدەسهێنانی چاكترین ئامانج و, گەورەترین ئاسەوار.

بێگومان هەر دڵێ خاڵی بێ لەو سۆزو بەزەییە بەرامبەر بەمنداڵان, ئەوا خاوەنەكەی رەوشت خراپ و دڵ رەق دەناسرێت, زبرو بێ بەزەیی و سەرزەنشتكراو دەبێ, شاراوە نیە لە كەس ئەو سیفاتە ناشیرین و ناپەسەندانەش كاردانەوەی خراپیان

---

[1] شاعیر دەڵێ:

نِعمَ الاله على العباد عديدة      واجلّهُـنَ نجابـة الاولادِ.

واتە: نازو نیعمەتەكانی خوا لەسەر بەندەكانی زۆرن و لەژمارە نایەن, یەكێ لە نیعمەتە گەورەكانی ئەوەیە كە پیاو منداڵی نەجیبی هەبێ.

ئەبێ لەسەر منداڵان, دەبێتە هۆی لادانیان لەڕێی ڕاست, سەرەنجام منداڵان دەڕۆن بەرەو بێسەروبەرەیی, دەکەونە ناو چاڵی گومرایی و نەفامی و توشی نەگبەتی و نەهامەتی دەبن..

لەبەر ئەم هۆیانەیە شەریعەتی بەرزی ئیسلام ئاوپژێنی دڵی خەڵکی کردووە بە ڕەحمەت و بەزەیی, باوکان و دایکان و مامۆستایان و بەرپرسانی هانداوە بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بڕازێننەوەو, خویگرن بەو ڕەوشتە جوان و بەرزانەوە.

ئەوەش ئێوەو گرنگیدانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەلایەنی سۆزو بەزەیی و زۆر سووربوونی لەسەر ئەوەی کە گەورەکان پەیڕەوی بکەن, خۆیان بڕازێننەوە بەڕەوشتە بەرزەکان و هەستە جوامێریەکان:

* عەمری کوڕی شوعەیب ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە لە باوکیەوە ئەیش لە باپیریەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا وَيَعْرِفْ حَقَّ كَبِيرِنَا فَلَيْسَ مِنَّا)**[1]. واتە: لە ئێمە نیە ئەو کەسەی ڕەحم و بەزەیی نەبێ بەرامبەر بەبچوکمان, قەدرو ڕێزی گەورەمان نەزانێ.

* ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوەو گوتویەتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مناڵێکی پێبوو گوشی بەخۆیەوەو ماچی کرد پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: **(أتَرحَمَه؟)** واتە: ئایا بەزەییت هەیە بەرامبەری و ڕەحمی پێ دەکەیت؟ پیاوەکە گوتی: بەڵێ. فەرموی: **(فالله أرحَم بِكَ مِنكَ بِه وَهُو أرحَمُ الراحمِين)**[2]. واتە: دەی خوا لە تۆ زۆر بەڕەحم ترو بەبەزەیی ترە بەرامبەر بەو منداڵەو هەر ئەویش بەبەزەیی ترینە لەوانەی کە خاوەنی بەزەیین.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر بیبینیایە یەکێك لە هاوەڵانی سۆزو بەزەیی نیە بەرامبەر بە منداڵەکانی ئەوا زۆر بەتوندی ڕێگری لێدەکردو, ئاراستەی دەکرد بەوەی بەسۆزو بەبەزەیی و چاك بێ بەرامبەر بەمنداڵەکانی و خانەوادەکەی,

---

[1] قال الشيخ الألباني: صحيح, رواه ابوداود: ٤٩٤٣, والترمذي: (١٩٢١).

[2] صحيح رواه البخاري في الأدب المفرد: ١ /١٣٧ برقم: ٣٧٧.

ماچکردن رۆڵێکی گەورەی هەیە لە جوڵاندنی هەست وسۆزی منداڵدا, دەبێتە هۆی دامرکاندنەوەی هەڵچوون و توڕەیی, پەیوەندی پتەو دروستدەکات لە نێوان گەورەو بچوکدا, دڵی منداڵ دەگەشێنێتەوەو دەروونی دەکاتەوە.

* عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرموی: هەندێك دەشتەکی هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم, وتیان: ئایا ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن؟. فەرموی: بەڵێ ئێمە منداڵەکانمان ماچ دەکەین. وتیان: سوێند بەخوا ئێمە ماچیان ناکەین. فەرموی: **(أوَ أمْلِك إنْ كَانَ اللهُ نَزَعَ مِنْ قُلُوبِكُم الرَّحْمَةَ!)**[1]. دەسەڵاتم چیە خوای گەورە سۆزو خۆشەویستی لە دڵی ئێوەدا هەڵکێشاوە؟.

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ فەرموی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەسەنی کوڕی عەلی ماچکرد لەو کاتەدا ئەقرەعی حابسی تەمیمی لای دانیشتبوو, ئەقرەع وتی: من دە منداڵم هەیە تائێستا هیچ کامیانم ماچ نەکردووە, پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەماشایەکی کردوو پاشان فەرموی: **(مَنْ لاَ يَرْحَمْ لاَ يُرْحَمْ !)**[2] . واتە: ئەوەی بەرەحم و بەبەزەیی نەبێ, رەحم و بەزەیشی پێ ناکرێ.

* ئەنەسی کوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ فەرموی: ئافرتێك هاتە خزمەتی عائیشە دوو منداڵی پێبوو, عائیشە سێ دەنکە خورمای دا بەئافرەتەکە ئەویش یەکی دەنکە خورمایەکی دا بەمنداڵەکان و دانەیەکی بۆ خۆی هەڵگرت, دوو منداڵەکە یەکی دەنکە خورمای خۆیان خواردو سەیری دایکیان دەکرد, ئەویش دەنکە خورماکەی کرد بەدوو لەتەوەو یەکی لەتێکی دانێ, کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتەوە بۆ ماڵەوە عائیشە بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوەو فەرموی: بۆچی سەرت لەوە سوورِ دەمێنێ؟ بێگومان بەهۆی بەزەیی هاتنەوەی بەو دوو منداڵەدا خوای گەورە رەحمی پێ دەکات[3].

---

[1] مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجه البخاري: ٩/٨ ( ٥٩٩٨ ) ، ومسلم: ٧٧/٧ ( ٢٣١٧ ) ( ٦٤ ) ..

[2]- مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجه البخاري ٨/٨ ( ٦٠١١ ) ، ومسلم ٧٧/٧ ( ٢٣١٨ ) ( ٦٥ ) .

[3] قال الألباني صحيح في الأدب المفرد: ١ /٢٥ برقم : ٨٩.

هەرکاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم منالێکی بدیایە لە گیانەڵادا بوایە چاوەکانی فرمێسکیان هەڵدەوەران ئەوەندە سۆزو بەزەیی هەبوو بەرامبەر بە مندالآن, بەو شێوەیە ئوممەتەکەی فێردەکرد کە بەڕەحم و بەزەیی بن..

* ئوسامەی کوڕی زەید ڕەزای خوای لێ بێ فەرموی: یەکێ لە کچەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەواڵی نارد بۆ باوکی و گوتی: یەکێك لە مناڵەکانم خەریکە ئەمرێ بابێ بۆ لام, پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە نێردراوەکەدا سلاوی بۆ نادوو فەرموی: بگەڕێرەوە بۆ لای و پێی بڵێ: **(أَنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى فَمُرْهَا فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ)**[1]. واتە: بێگومان خوای گەورە خۆی خاوەنی ئەو شتەیە کە ئەیباتەوەو خاوەنی ئەوەشە کە ئەیبەخشێ, هەموو شتێك لای ئەو دیاریکراوە, بەلام با ئارام بگرێ و رازی بێ بە بەشی خواو بڵێ: **(حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ)** واتە: هەر خوامان بەسە, چەند پشت پێ بەسراوێکی چاکە. ئەویش جوابی ناردەوە بۆ باوکی و سوێندی خواردبوو کەئەبێ بیهێنن بۆ لام, پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستا لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادەو مەعازی کوری جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی **ثابت** و چەند پیاوێکی تردا ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ڕۆشتن بۆ ماڵی کچەکەی, مناڵەکەیان بەرزکردەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم, ئەویش لەکۆشی خۆیدا داینا, مناڵەکە دەستیکرد بەجولآن و ناڕەحەت بوو باری تێکچوو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چاوەکانی فرمێسکی لێ ئەهاتە خوارەوە بۆی, سەعد وتی: ئەوە چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: **(هَذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللَّهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ)** ئەوە ڕەحم و بەزەییە خوای گەورە خستویەتیە دڵی بەندەکانی. لە ریوایەتێکی تردا فەرمویەتی: ئەوە ئەو سۆزو بەزەییەیە خوای گەورە بیەوێ ئەیخاتە دڵی بەندەکانی, خوای گەورە سۆزو بەزەیی هەیە بەرامبەر ئەو بەندانەی کەوا خاوەنی سۆزو بەزەیین.

---

[1] - متفقٌ عَلَيْهِ . البخاري: ١٢٨٤ ، ومسلم: ٩٢٣.

بەلاتانەوە سەیر نەبێ ئەگەر سۆزو بەزەیی لەدڵی دایك و باوكدا چەسپا ئەو كاتە هەڵدەستن بەجێبەجێ كردن و دەستەبەركردنی ئەو ئەركانەی كە خوای گەورە واجبی كردووە لەسەریان بەرامبەر بەچاودێریكردن و بەخێوكردن و بەرپرسیارێتی منداڵەكانیان.

**ج- رق بوونەوە لەكچ خراپەو رەوشتێكی سەردەمی نەفامیە:**

ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەو بانگەوازەی كە بۆ یەكسانی و دادپەروەری گشتی دەیكا هیچ جیاوازیەكی لەنێوان پیاو ژن و كوڕ و كچ دا نەكردووە لە مامەڵەی بەزەییانەداو لە سۆزی دایكی و باوكیدا بۆ بەدیهێنانی فەرمانی خوای پەروەردگار كە فەرموویەتی: **﴿اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾. المائدة : ٨.** واتە : دادپەروەر بن چونكە دادپەروەری بۆ پارێزكاری نزیكترە.

بۆ بەجێهێنانی پەیرەوكردنی فەرمانی پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم كە دەفەرموێت : **(اعْدِلُوا بَيْنَ أَبْنَائِكُمْ اعْدِلُوا بَيْنَ أَبْنَائِكُمْ)**[1]. واتە: لەنێوان رۆڵەكانتاندا دادپەروەربن، لەنێوان رۆڵەكانتاندا دادپەروەربن، لە نێوان رۆڵەكانتاندا دادپەروەربن.

لەبەر رۆشنایی ئەو ئایەتە پیرۆزە و ئەو فەرموودە بەپێزەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوەو بەدرێژایی مێژوو هەتا ئێستا دایكان و باوكان یاسای دادپەروەری و یەكسانیان بەكارهێناوە لە خۆشەویستی و مامەڵەی جوان و سۆز و بەزەیی لەنێوان رۆڵەكانیاندا بەبێ ئەوەی جیاوازی لەنێوان كوڕو كچدا بكەن بەهیچ شێوەیەك!!.. ئەگەر شتێكی واش روویدابێت ئەوە هۆی عادەت و نەریتی گەندەڵی ئەو ژینگەیەیە كە ئەویش لەبەر ئەوەیە چونكە خەڵكی ئەو ژینگەیە لە رەوشت و ئادابە بەرزەكانی ئیسلامەوە دوور كەوتوونەتەوەو چوونەتە سەر هەندێ دابونەریتی سەردەمی نەفامێتی ئەو سەردەمەی كە خوای پەروەردگارمان لەبارەیەوە فەرموویەتی: **﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالْأُنْثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ (٥٨) يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾.**

[1] - قال الألباني صحيح, صحيح سنن النسائي: ٢٦٢/٦ برقم ٣٦٨٧ .

**النحل:٥٨–٥٩**. واتە: هەرکاتێ یەکێك لە کافرەکان موژدەی کچێکی پێ بدرایە دەم و چاوی رەش هەڵدەگەڕاو پیشی دەخواردەوەو خۆی لە خەڵکەکە دەشاردەوە لەبەر ئەو موژدە ناخۆشەی کە پێی دراوە، ئایا بەو سوکایەتیەوە بیهێڵێتەوە یان زیندەبەچاڵی بکاو بیخاتە ژێر خاکەوە؟ ئاگاداربن قسەی ئەو کافرانە چەندە خراپە، وە دابەش کردنەکەیان " کەدەڵێن خوا کچی هەیە و بۆ خۆشیان بەکچ ڕازی نین چەندە نارێکە.

هەروەها هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی ئیمان و, بزواندنی گومان و نەمانی دڵنیایی و رازی نەبوون بەو بەشەی کە خوای گەورە داویەتی, بێگومان نەدەسەلاتی خۆیانی تێدایە نەهی ژنەکانیان, هەرچیش لەسەر زەویدایە ناتوانێت ئەو شتەی خوای گەورە خەڵقی کرد بیگۆڕن, ئایا نەتان بیستووە کە خوای پەروەردگار چی دەفەرموێت لەبارەی ئیرادەو ویستی رەهای خۆیەوەو, فەرمانی زاڵ و سەرکەوتوی دەربارەی بەخشینی کوڕو کچەوە: ﴿**لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاء يَهَبُ لِمَنْ يَشَاء إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَاء الذُّكُورَ* أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَن يَشَاء عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ**﴾. **الشورى: ٤٩–٥٠**. واتە: هەر بۆ خودایە خاوەنداریێتی ئاسمانەکان و زەوی, هەرچی بوێت دەیهێنێتەدی, کچ بەو کەسە دەبەخشێت خۆی بیەوێ, بەو کەسەش خۆی بیەوێ کوڕی پێ دەبەخشێ, یان لە هەردوو جۆر بەهەندێك خێزان دەبەخشێ لە کوڕو کچ, هەیشە ویستی خوا وایە هیچی نەداتێ و نەزۆك بێ, بەڕاستی ئەو زاتە زاناو بەدەسەلاتە.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە کچی پێش خستووە بۆ ئەوەی دایکان و باوکان پێشوازی چاکیان بۆ کچەکانیان هەبێ.

یەکێ لەو بەسەرهاتە دانسقە و دەگمەنانەی دەیگێڕنەوە ئەوەیە یەکێ لە پاشاکانی عەرەب کە نازناوی ئەبو حەمزە بووە, ژنێکی خواستبوو بەهیوای ئەوەی کوڕی ببێ, بەڵام ئەو کچی بوو,ماڵەکەی بەجێهێشت و چوو بۆ ماڵێکی تر لەوێ ژیانی دەبردە سەر, لەپاش چەند ساڵێ دای بەلای دەوارەکەی خۆیاندا کچەکەی گاڵتەو گەپی دەکردو ئەم هۆنراوەیەی دەوت:

**مـا لأبي حمزة لا يأتينا        يظل في البيت الذي يلينا**

غضبان الا نلد البنينا         تـالله ما ذلك فـي ايدينا
وانمـا ناخذ ما اعطيـنا

بەکورتی مانای هۆنراوەکە ئەوەیە: ئەی ئەبو حەمزە! بۆ نایەیتەوە بۆ لامان و پێکەوە بژین لەم ماڵەدا, لەبەر ئەوە توڕەو زویر بوویت لێمان و بەجێت هێشتوین کە کوڕمان نەبووە, سوێند بەخوا ئەوە بەدەستی ئێمە نیە, ئەوە خوای گەورە خۆی پێی بەخشیوین و وەریشی دەگرێتەوە. پیاوەکە گەڕایەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی دوای ئەوەی دەرسێکی ئیمانی وەرگرت, رازی بوو دامەزراوو دڵنیا بوو, سەری خێزانەکەی ماچ کردوو رازی بوو قەدەری خواو, ئەو دیاریەی کە پێی بەخشیبوو!!.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ ئەوەی رەگ و ریشەی نەفامی لەناو دڵ و دەروونی هەندێ نەفس لاوازدا دەربهێنێ و ریشەکێشی بکا, کچانی تایبەت کردووە, هانی موسڵمانانی داوەو فەرمانی بەباوکان و پەروەردەکاران کردووە کە بەچاکی لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکەن, چاودێری باشیان بکەن و هەستن راپەڕاندنی ئەرکەکانیان, بۆ بەدەسهێنانی رەزامەندی خواو, چوونە بەهەشتی نەبڕاوەوە..

* ئەنەسی کوڕی مالیك گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ وَضَمَّ أَصَابِعَهُ)** [١]. واتە: هەر کەسێ دوو کچ بەخێو بکا تا لەخەم دەرەخسێن و بالغ دەبن, من و ئەو رۆژی قیامەت لە بەهەشتدا پێکەوە ئەبین وەك ئەو دوو پەنجەیەم, لەو کاتەدا دوو پەنجەی پیرۆزی جووت کردو نوساندنی بەیەکەوە.

* عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی رەزای خوای لێ بێ فەرموی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموی: **(من كانت له ثلاثة بَنَاتٍ فصبر عليهن, وسَقاهن وكَساهن مِن جدته كُن له حِجابا من النار)** [٢]. واتە: هەر کەسێ سێ کچی هەبێ و خۆڕاگربێ و ئارام بگرێ لەسەریان, خواردن و خواردنەوەیان بداتێ و لە ماڵی خۆی

---

[1] - رواه مسلم (٢٦٣١ -٢٠٢٧ ), والترمذي: ٤/٣١٩برقم: ١٩١٤. .

[٢] تحقيق الألباني: (صحيح) انظر حديث رقم: ٦٤٨٨ في صحيح الجامع , صحيح الأدب المفرد: ٤١/١ برقم: ٧٦.

جل و بەرگیان بۆ بکات, ئەوە ئەبنە بەربەست و ئەیپارێزن لە ئاگری دۆزەخ.

* ئەبو سەعید رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(مَنْ كانَ لَه ثَلَاثَ بَنَا تٍ او أخَوَاتٍ, أوْ بِنْتَانِ أوْ أُخْتَانِ فأَحْسَنَ صَحبَتهن, وَصبر عَليهن, واتقى الله فيهن دَخل الْجَنَّةُ)**[1]. واتە: هەر کەسێ سێ کچ یان سێ خوشکی, یا دوو کچ یان دوو خوشکی هەبێت بەجوانی بەخێویان بکات و لەبارەیانەوە پارێزکار بێت و لەخوا بترسێت دەچێتە بەهەشتەوە.

ئەم ئایەت و فەرمودانە هیچیان بۆ دایك و باوك و پەروەردەکار نەهێشتۆتەوە تەنها ئەوەندە نەبێ کە بەیەکسانی بجولێنەوەو لە گەڵیان و جیاوازی نەکەن لە نێوان کچ و کوڕدا, کوڕ زاڵ نەکەن بەسەر کچدا, وە دیارییان پێ ببەخشن بەیەکسانی, تەنانەت وەك یەکیش ماچیان بکەن, بۆ ئەوەی رەزامەندی گەورەی خوا بەدەست بهێنن, بچنە بەهەشتەوە فراوانەکەی خوای گەورە کە پانتاییەکەی بەقەد ئاسمانەکان و زەویەو, نیشتگەیەکی پەسەندە لای پادشایەکی بەدەسەلات و بەتوانا ![2].

**د - ئارام گرتن لەسەر مردنی منداڵ:**

لە کاتێکدا موسڵمان دەگاتە پلەو پایەیەکی بەرز لە ئیمان و, یەقین بەدەست دێنێ و, بەراستی بڕوای بەقەزاو قەدەری خوای گەورە دەبێ بەچاك خراپیەوە, ڕووداوەکانی بەلاوە بچوك دەبن و بەڵاو ناخۆشیەکانی لەبەر چاو ئاسان دەبێ, خۆی تەسلیمی خوا دەکات, لە هەموو کارو بارێکدا ملکەچی خوا دەبێ, ئەگەڕێتەوە بۆ لای و تەوبە دەکا, دڵی هەست بەحەوانەوەو ئارامی دەکا, زەمیری خۆشحاڵ دەبێ, چونگە ئارامی گرتووە لەسەر بەڵاو ناخۆشیەکان, رازی بووە بەبڕیارو فەرمانەکانی خوا, گەردنکەچی

---

[1] صحيح لغيره في صحيح الترغيب والترهيب: ١٩٧٣/٢. رواه احمد: ٢٢٣\١ وحسنه احمد شاكر, وابو داود عن ابن عباس رضي الله عنه.

[2] ئیمام غەزالی رەحمەتی خوای لێ بێ لە کتێبی(احياء علوم الدين)دا ئەفەرموێت: باوك و دایك نابێ بە مناڵی نێرینە خۆشحاڵبن و بە مناڵی مێینەش غەمبار بن چونکە نازانن خێر لەچیدایە, زۆر خاوەن کوڕ هەن ئاوات بۆ کچان دەخوازن, بگرە خۆشی و شادی لە کچاندا زیاترە و, ئەجرو پاداشت لە کچاندا زۆرترو گەورەترە. (احياء : ٢/)٤٩.

قەدەرەکانی پەروەردگاری جیهانیان بووە.

لەم بارەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەواڵی ئەوەی داوە کاتێ بەندەیەك منداڵی دەمرێت ئارام بگرێ و, بڵێ: ﴿**إنّا لله و إنّا إلَيْهِ رَاجِعُونَ**﴾ واتە: هەمووما‌ن لای خواوە هاتوین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە, خوای گەورە دەفەرموێ: کۆشك و تەلارێکی بۆ دروستبکەن لە بەهەشتدا و ناوی بنێن کۆشکی سوپاس گوزاری..

* ئەبو موسای ئەشعەری گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**إِذَا مَاتَ وَلَدُ الْعَبْدِ قَالَ اللَّهُ لِمَلَائِكَتِه قَبَضْتُمْ وَلَدَ عَبْدِي فَيَقُولُونَ نَعَمْ فَيَقُولُ قَبَضْتُمْ ثَمَرَةَ فُؤَادِهِ فَيَقُولُونَ نَعَمْ فَيَقُولُ مَاذَا قَالَ عَبْدِي فَيَقُولُونَ حَمِدَكَ وَاسْتَرْجَعَ فَيَقُولُ اللَّهُ ابْنُوا لِعَبْدِي بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَسَمُّوهُ بَيْتَ الْحَمْدِ**)[1] . واتە: کاتێ بەندەیەك منداڵی دەمرێت خوای گەورە بەمەلائیکەکانی ئەفەرموێ: رۆحی منداڵی بەندەی منتان کێشا؟ ئەڵێن بەڵێ. ئەفەرموێ: گیانی جگەرگۆشەکەیتان کێشا کە بەرهەمی دڵی بوو؟ ئەڵێن: بەڵێ دەفەرموێ: ئەی بەندەکەم چی گوت؟ ئەڵێن: سوپاس و ستایشی خوای کردو وتی: ﴿**إنّا لله و إنّا إلَيْهِ رَاجِعُونَ**﴾ هەمووما‌ن لای خواوە هاتوین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە. خوای گەورە ئەفەرموێ: کۆشك و تەلارێکی بۆ دروستبکەن لە بەهەشتدا و ناوی بنێن کۆشکی سوپاس گوزاری.

ئەم ئارامی و خۆراگریە بەرهەمی زۆری هەیە, ئەو کەسەی بەراستی خۆراگرە بەرهەمەکە دەچنێتەوە, لە رۆژێکدا کە ماڵ و سامان و منداڵ و نەوە هیچ سوود ناگەیەنن.

لە بەرهەمەکانی رێگای چوونە بەهەشتە, بەربەستە لە ئاگری دۆزەخ.. ئەبو سەعیدی خودری گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جارێکیان بەئافرەتانی فەرموو: (**مَا مِنْكُنَّ مِنْ امْرَأَةٍ تُقَدِّمُ بَيْنَ يَدَيْهَا مِنْ وَلَدِهَا ثَلَاثَةً إِلَّا كَانُوا لَهَا حِجَابًا مِنْ النَّارِ فَقَالَتْ امْرَأَةٌ وَاثْنَانِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاثْنَانِ**)[2].

---

[1] صحيح جامع الترمذي: ٣٤١/٣ برقم ١٠٢١.

[2] متفقٌ عَلَيْهِ: أخرجه البخاري ٣٦/١ ( ١٠١ ) ، ومسلم ٣٩/٨ ( ٢٦٣٣ ) ( ١٥٢ ).

واته: هەر ئافرەتێك لە ئێوە سێ منداڵی بمرێ, ئەبنە بەربەست و پەرژین بۆی و ئەیپارێزن لە ئاگری دۆزەخ. ئافرەتێ وتی: ئەی ئەگەر دوان بن؟. فەرموی: با دوانیش بن.

* جابر گێڕایەوەو فەرموی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: **(مَنْ مَاتَ لَهُ ثَلَاثَةٌ مِنْ الْوَلَدِ فَاحْتَسَبَهُمْ دَخَلَ الْجَنَّةَ قَالَ قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَاثْنَانِ قَالَ وَاثْنَان)**[1]. واتە: هەر موسڵمانێك سێ مناڵی بمرێ ئارام بگرێ لەسەریان ئەچێتە بەهەشتەوە, وتی: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی ئەگەر دوان بن. فەرموی: با دوانیش بن. یەکێ لە راویەکان بە جابری وت: ئەگەر بتان گوتایە یەکێکیش, ئەیفەرموو: با یەکێکیش بێ, جابر وتی: منیش وای بۆ دەچم.

خۆراگری لەسەر مردنی مناڵ دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو مناڵە تکا بکات بۆ دایك و باوکی لە قیامەتدا, حەبیبە لای عائیشە بوو رەزای خوایان لێ بێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتە ژوورەوە بۆلایان و فەرموی: **(مَا مِنْ مُسْلِمِين يموت لهما ثَلَاثَةٌ مِنْ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أدخلهما الله بفضل رحمته إياهم الْجَنَّةِ قال يقال لهم ادخلوا الجنة فيقولون حتى يدخل آباؤنا فيقال ادخلوا الْجَنَّة أنتم وآباؤكم)**[2]. واتە: هەر موسڵمانێك سێ منداڵی بمرێ نەگەیشتبنە تەمەنی باڵغ بوون و تەکلیفیان لەسەر نەبێ, لەڕۆژی قیامەتدا ئەیان هێنن لەبەردەم دەرگای بەهەشتدا ئەیان وەستێنن و پێیان دەڵێن: بچنە بەهەشتەوە, ئەڵێن: ناچین تا دایك و باوکمان لەگەڵمان نەیەن. پێیان ئەڵێن: بچنە بەهەشتەوە خۆتان و دایك و باوکتان.

* ئیمام موسلیم لە ئەبو حەسانەوە رەزای خوای لێ بێ دەیگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: دوو کوڕی من وەفاتیان کرد ئەوە بوو منیش بە ئەبو هورەیرەم گوت: هیچ فەرموودەیەکت بیستووە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم لە بارەی منداڵ مردنەوە تا دڵمان لە بارەی مردووەکانمانەوە خۆش ببێ؟ فەرموی: بەڵێ: **(صِغَارُهُمْ**

---

[1] - حسن صحيح في الأدب المفرد: ٦٣/١ برقم ١٤٦., وأحمد وإبن حبان .

[2] صحيح رواه الطبراني, صحيح الترغيب والترهيب: ٢٠٠٣/٢ .

**دَعَامِيصُ الْجَنَّةِ يَتَلَقَّى أَحَدُهُمْ أَبَاهُ أَوْ قَالَ أَبَوَيْهِ فَيَأْخُذُ ببناحية ثَوْبِهِ أَوْ بِيَدِهِ كَمَا آخُذُ بِصَنِفَةِ ثَوْبِكَ هَذَا فلا يفارقه حَتَّى يُدْخِلَهُ اللَّهُ وَأَبَاهُ الْجَنَّةَ)**[١]. واته: منداڵە بچوكەكانتان دەبن بە پەروانەی بەهەشت, یەكێكیان دەگات بە باوك و دایكی و پۆشاكەكەیان یان دەستیان دەگرن, وەك چۆن من پۆشاكەكەی تۆ دەگرم, ئەو منداڵانە لە دایك و باوكیان جوێ نابنەوە, هەتا خوای گەورە هەموویان دەخاتە بەهەشتەوە.

یەكێ لەو هەڵوێستە مەردانە و ئیمانیانەی كە ئافرەتانی هاوەڵان رەزای خوایان لێ بێ نواندویانە بەڵگەیە لەسەر خۆڕاگری و رازی بوون و ئیمانداری لەكاتی مردنی منداڵدا, هەڵویستە جوامێریەكەی ئوم سولەیمە رەزای خوای لێ بێ كە ئەنەسی كوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ فەرموێ: ئەبو تەڵحە كوڕێكی هەبوو زۆر نەخۆش بوو, ئەبو تەڵحە لەماڵ دەرچوو لەپاش دەرچونی كوڕەكە مرد, كاتێ گەڕایەوە وتی: كوڕەكەمان چۆنە؟ ئوم سولەیم وتی: زۆر باشەو ئارامە مەبەستی ئەوەبوو مردووە, بەڵام ئەو واتێگەیشت كەچاك بۆتەوەو خەوتووە, نانی بۆ ئامادەكردو تێری خوارد, خۆی بۆ رازاندەوە لەجاران چاكتر, ئەویش جوتبوو لەگەڵی, كاتێ ئوم سولەیم سەیری كرد تێری خواردوو كاری جووت بوونی ئەنجامدا پێی وت: ئەی ئەبو تەڵحە ئەگەر یەكێ ئەمانەتێ لای تۆ دابنێ پاشان داوای بكاتەوە تۆ رێگری لێ دەكەیت؟ وتی نەخێر, وتی: دەی ئارام بگرە مناڵەكەت مردووە بچۆ ئەسپەردەی بكەو بیشارەوە, داوای پاداشت لە خوای گەورە بكە, ئەبو تەڵحە زویر بوو وتی: هەواڵت پێ نەدام تا لەشم قورس بوو, لە ماڵ دەرچوو رۆشت بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و هەواڵەكەی بۆ گێڕایەوە, ئەویش فەرموی: (**أَعْرَسْتُمْ اللَّيْلَةَ**). ئەمشەوتان كرد بە شایی و زەماوەند؟. ئەبو تەڵحە وتی بەڵێ. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموی: (**بَارَكَ الله لَيْلَتكُما**) خوایە فەڕو بەرەكەتی خۆتیان بۆ بنێری, ئوم سولەیم كوڕێكی تری بوو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ناوی نا عبدالله, پیاوێك لە ئەنصار وتی: حەوت منداڵم بینی لە كوڕانی ئەو عبدالله یە قورئانیان ئەخوێند,

---

[١] صحيح رواه مسلم: ٢٠٢٩/٤ برقم: ٢٦٣٥, صحيح الترغيب والترهيب: ١٩٩٨/٢.

ئەوەش تەنها بەهۆی ئەو پارانەوەیەی پێغەمبەری خواوە بوو صلى الله عليه وسلم کە فەرمووی: خوایە فەرو بەرەکەتی خۆتیان بۆ بنێری[١].

گومانی تێدا نیە ئیمان بەخوا ئەگەر جێگیربوو لەدڵی ئیمانداردا شتی سەرسوورهێنەر دروستدەکات لەبەر ئەوە لە لاوازیەوە دەیبات بەرەو بەهێزی, لە ترسنۆکیەوە بۆ ئازایەتی و مەردایەتی, لە رژدی و بەخیلیەوە بۆ بەخشندەیی و سەخاوەت, لە نائارامی و ترسانەوە بۆ خۆڕاگری و گونجاوی..

چەندە جێگای خۆیەتی باوکان و دایکان یەکلایی ببنەوە بۆ ئیمان, خۆیان پڕچەك بکەن بە یەقین و دڵنیایی تاکو ئەگەر توشی هەر بەڵاو نەهامەتیەك هاتن و منداڵیان مرد ئارامیان لەبەر نەبڕێ و خۆڕاگربن, لەو کاتەدا ئەمە وتەیان بێ: **(إِنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ, وَلَهُ مَا أَعْطَى, وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى, فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ)**. واتە: بێگومان خوای گەورە خۆی ئەیبەخشێ و هەر خۆیشی ئەیباتەوە, هەموو شتێك لای خوای گەورە دیاریکراوە, ئارام بگرێ و رازی بێ بەبەشی خواو بڵێ: **(حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ)** واتە: هەر خوامان بەسە, چەند پشت پێ بەسراوێکی چاکە, تاکو پاداشتی خێرو چاکەی دەسکەوێت لەلایەن کەسێکەوە کە بڕیارو حوکم و فەرماندان تایبەتی ئەوە.

خودایە بەڵاو نەهامەتیەکانی دنیا سوك و ئاسان بکە لەسەرمان, رازیمان بکە بەقەزاو قەدەری خۆت, وە پشتمان بگرە لە دنیاو لە دوارۆژدا چونکە تەنها تۆ چاکترین پشتیوانی ئەی پەروەردگاری جیهانیان.

**هـ- پێویستە بەرژەوەندی ئیسلام پێش خۆشەویستی منداڵ بخرێ:**

لە کاتێکدا دڵ و دەروونی دایك و باوك ئەو هەستە راستگۆیەی تێدا بێ لە خۆشەویستی و سۆزو بەزەیی و رەحمەت بەرامبەر بە جگەرگۆشەکانیان, پێویستە ئەو هەست و سۆزە زاڵ نەبێ بەسەر خۆشەویستی بۆ جیهادو تێکۆشان لە پێناوی خواو گەیاندنی بانگەوازەکەی لەسەر زەویدا, چونکە بێگومان دەبێ بەرژەوەندی ئیسلام

[1]- متفقٌ عَلَيْهِ: البخاري: ٣/١٣٥, ومسلم: ٢١٤٤.

لەسەروی هەموو بەرژەوەندیەکانەوە بێ.. وە بەراستی دەبێ دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئیسلامی ئەوپەڕی ئامانج و مەبەستی ئیماندار بێ لە ژیاندا.. لەبەر ئەوە هیدایەت و ڕێنمایی مرۆڤەکان بەرزترین کارێکە ئیماندار هەوڵی خۆی بۆ بخاتەگەڕ, سوربێ لەسەر بەدیهێنان و بڵاوکردنەوەو گەیاندنی پەیامی خوا بە شێوەیەکی گونجاو.

کۆمەڵی یەکەم لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و ئەوانەش کە بەڕاستی شوێن ئەوان کەوتن ئابەو شێوەیە تێگەیشتبوون, جوڵەو بزوتنەوەیان نەئەزانی تەنها جیهادو تێکۆشان نەبێ, ڕاگەیاندنیان تەنها بانگەواز بوو بۆ دینی خوا, هەموو مەبەست و ئامانجێکیان تەنها ئیسلام بوو.

بۆیە سەیر نیە کە دەبیستین لە مێژوودا چەندە داستانی گەورەیان تۆمارکردووە لە پێناوی گەیاندنی پەیامی ئیسلام و, بەرزکردنەوەی ئاڵاو پەرچەمی**(لا اله الا الله) دا..** وە بەلاتانەوە سەیر نەبێ کە لەو پێناوەدا قوربانیان داوە بە بەهاترین و بەنرخترین شت, وە ئاواتە خوازی شەهیدی بوون لە پێناوی خوادا.

ئەوەش ئێوەو وتەکەی عوبادەی کوڕی صامت ڕەزای خوای لێ بێ لەبەردەم پادشای میصردا کەناوی مقەوقەس بوو, پادشای میصر مقەوقەس عوبادەی ترساند بەزۆری لەشکری رۆم و, بوغرا بوو بوو بەسامان و پارەو پولەکەی, عوبادە رەزای خوای لێ بێ پێی گوت: (ئەی پاشا! لەخۆت بایی مەبە خۆت و شوێنکەوتوانت هەڵمەخەڵەتێنە.. ئەگەر بەزۆری لەشکری ڕۆم ئەمانترسێنی کە ئێمە سەرناکەوین بەسەرتاندا, ئەوە ئێمە لەوە ناترسین, ئەگەر ئەوەی دەیلێی ڕاست بێ, ئەوا ئێمە یەکێ لەم دوو شتە چاکەمان دەست ئەکەوێ, ئەگەر سەرکەوتین بەسەرتاندا ئەوا ئەو ماڵ و سامانەی شانازی پێوە دەکەن و پێی بوغرا بوون بۆ ئێمە دەبێ و غەنیمەتەو دەسکەوتی جەنگیە بۆ ئێمە, خۆ ئەگەر ئێوەش سەرکەوتن بەسەرماندا کە بەزۆریش نیە, خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: **﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾. البقرة:٢٤٩**.واتە: چەندەها جار دەستەی کەم زاڵبوون بەسەر دەستەی زۆردا بەفەرمانی خوا, خوا یارو یاوەری خۆڕاگرو ئارامگرانە.

هەروەها هەر یەکێ لە ئێمە بەیانیان و ئێواران لە خوا دەپاڕێتەوە شەهید بێ و

بەپلەی بەرزی شەهادەت بگاو, نەگەڕێتەوە بۆ ناو وڵات و کەس و کارو منداڵەکانی.. هیچ کەسێ لە ئێمە خەمی ماڵ و منداڵی بەجێهێشتوی نیە, هەریەکێ لە ئێمە ماڵ و منداڵەکانی راسپاردووە بەپەروەردگاری خۆی, خەمی ئێمە تێکۆشان و جیهادە لە پێناوی خواو بەرزکردنەوەی وشەی خودا.. ئەوەش کە دەڵێی ئێوە ژیانتان سەختەو ماڵ و سامانتان نیە, ئەوا ئێمە لەوپەڕی خۆشگوزەرانی و بەختەوەریداین, ئەگەر دنیا هەر هەمووی بۆ ئێمە بێ ئێمە لەوە زیاترمان ناوێ کە ئێستا هەمانە).

ئەم هەڵوێستە جوامێریەی عوبادە یەکێکە لە هەزاران هەڵوێستی باو باپیرە ئازاکانمان کە بەدرێژایی مێژوو تۆماریان کردووە, ئەو لەخۆبوردەیی و ئازایەتی و گیان فیداییەی کە هەیان بووە لەپێناوی خوا, خۆشەویستیان بۆ بانگەوازی ئیسلام و جیهادو تێکۆشان خستبووە پێش خۆشەویستی ماڵ و منداڵ و هۆزو نیشتمان.. پەیڕەوی ئەم ئایەتە پیرۆزەیان دەکرد کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ**﴾. التوبة:٢٤. واتە: ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەگەر باوك و کوڕ براو, ژن و خێزان وکۆمەڵ و خێڵ و خزمانتان, ماڵ و سامانێك پەیداتان کردووەو بازرگانیەك دەترسن رەواجی نەمێنێ, ئەو خانو بەرەو کۆشك و تەلارانەی کە بەلاتانەوە خۆش و جوان و دڵگیرن, هەر یەك لەمانەتان لە خواو پێغەمبەرەکەی لاخۆشەویستر بێت, خۆتان بگرن و چاوەڕێ بن هەتا فەرمان لە خواوە دێت و سزای سەختتان دەدات, خوایش رێنمایی لەشەرع دەرچووان ناکات بۆ هیچ خێرو چاکەیەك.

یەکێکی تر لەو بەسەرهات و رووداوە رەسەنانەی کە دەیگێڕنەوە لە پێشەوای شەهید حەسەن بەنناوە ئەوەیە: پێشەوا هەمیشە عادەتی وابوو ئەو گەنجانەی بانگەوازیان دەکرد بۆ ئایینی خوا بەسەری دەکردنەوە, لە هەموو جەژنەکاندا ئەچوو بۆ قەزاو ناحیەکان بۆ لایان.. جارێکیان وەك عادەتی هەمیشەیی خۆی ئەیەوێ بڕوات بۆ ناو گەنجەکان و جەژنیان لەگەڵدا بکا, لەو کاتەدا سەیفی کوڕی زۆر نەخۆش دەبێ

بەتەمای مانی نابن, خێزانەکەی پێی دەڵێ: خۆزگە ئەم جەژنەت لەگەڵ دەکردین بەخۆشی و چاویشت لە سەیف ئەبوو لەپاڵ سەریا دەبویت کە نەخۆشە, ئەویش جانتای سەفەری هەڵگرتبوو وەڵامی دایەوەو وتی: ئەگەر خوای گەورە خەڵاتی خۆی بەخشیەوە پێمان و چاك بوویەوە ئەوا سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە و خەڵاتی ئەوە, خۆ ئەگەر ویستی خوا وابوو بمرێ ئەوە باپیری رێگەی گۆڕستان شارەزایە! پاشان چووە دەرەوە لەبەر خۆیەوە ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە: ﴿**قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ..**﴾. تا کۆتایی ئایەتەکە. **التوبة:٢٤.**

**(الله أكبر)** گەورەیی هەر بۆ خوایە! ئا بەو شێوەیەیە خۆبەختکردن لە پێناوی بەرزکردنەوەی وتەی خوادا..**(الله أكبر)** گەورەیی هەر بۆ خوایە! بەو شێوەیەیە بانگەواز بۆ دینی خوا.. ئەگەر پێشینی چاك و پیاوانی بانگخواز هەر ئەم هەڵوێستانەیان بنواندایە بەدرێژایی رۆژگار ئەوندەیان بەس بوو تا قیامەت فەخرو شانازییان پێوە بکرایە!!..

ئەی باوکی ئیماندار! پێویستە خۆشەویستی ئیسلام و تێکۆشان و بانگەواز بۆ لای خوا زاڵ بێ بەسەر دڵ و ئەندامەکانی جەستەتدا, بیخەیتە پێش خۆشەویستی ماڵ و منداڵ و هۆزەکەتەوە, تاکو بۆت ببێتە پاڵنەرێك بۆ بانگەوازکردن بۆلای خواو بەرزکردنەوەی ئاڵای جیهادو تێکۆشان, وە بۆ ئامادەکردنی پیاوانێك کە بەهێزی بازوویان بونیادی شکۆمەندی بینای ئیسلام بکەن, بەعیزەت و دەسەڵاتیان دەوڵەتی قورئان دروستبکەن, ئەو کیان و کەرامەت و بڵندیەی کە ساڵانێکە لە نەتەوەی موحەممەد زەوتکراوە بیگێڕنەوە, ئەمەش لای خوای گەورەو بەدەسەڵات قورس و گران نیە.

گوێ بگرە بزانە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چی دەفەرموێ دەربارەی ئەوانەی دەیانەوێ ئیمانیان تەواو بکەن و لەناخی دڵیانەوە خۆشی ئیمان بچێژن, هەروەها ویژدانیان لەناخەوە هەست بەخۆشی بکات!!..

* ئەنەس رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ مَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ**

**إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ أَنْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ مِنْهُ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ)**[1]. واته: هەركەسێ ئەم سێ شتەی تێدابێ تامی شیرینی ئیمان دەچێژێت: خواو پێغەمبەری لە هەموو شتێ زیاتر لا خۆشەویستر بێ, هەر کەسێکی خۆش ویست تەنها لەبەر رەزامەندی خوا خۆشی بوێ, چۆن حەز ناکات بیخەیتە ناو ئاگرەوە ئاواش حەز نەکات بگەڕێتەوە بۆ سەر کوفرو بێباوەڕی.

* عومەری کوڕی خەتتاب رەزای خوای لێ بێ بە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم فەرموو: تۆم لا خۆشەویسترە لەهەموو شتێ تەنها لەخۆم نەبێ, پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: **(لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ نفسه)**. واتە: هیچ کەسێك لە ئێوە ئیمانی تەواوی نیە تا منی لە نەفسی خۆی زیاتر خۆشنەوێت, عومەر فەرموی: سوێند بەوەی قورئانی بۆ دابەزاندووی کە خوایە ئێستا تۆم لەخۆم خۆشتردەوێ, پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموی: **(الْآنَ يَا عُمَرُ)**[2]!!. ئا ئێستا ئیمانەکەت تەواوە ئەی عومەر.

* لە فەرمودەی راست و دروستدا چەسپاوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يَكُونَ هَوا هُ تَبعا لِمَا جِئْتُ بِهِ)**[3]. واتە: ئیمانی تەواوی نابێ هەریەکێ لەئێوە تاکارو کرداری بەپێی قورئان و سوننەت نەبێ, پێویستە شوێن هەواو هەوەسی خۆی نەکەوێ و هەواو هەوەسی بکاتە شوێن کەوتەی شەرع .

* ئیمام بوخاری و موسلیم لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: **(لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِه وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)**[4]. واتە: هیچ کەسێ لەئێوە ئیمانی تەواو نیە تا منی لا خۆشەویستر نەبێ لەماڵ و منداڵی و هەموو خەڵك بەگشتی.

---

[1] - مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجه البخاري ١/١٠ ( ١٦ ) ، ومسلم ١/٤٨ ( ٤٣ ) ( ٦٧ ) .

[2] - رواه البخاري: ٦٦٣٢.

[3] رواه في شرح السنة وقال النووي في أربعينه هذا حديث صحيح رويناه في كتاب الحجة بإسناد صحيح.

[4] صحيح رواه البخاري: (١٦), ومسلم (٤٣), تحقيق الألباني: (صحيح) انظر حديث رقم: ٧٥٨٢ في صحيح الجامع..

**و- لێدان و دەنگ وەرگرتن لە منداڵ بۆ بەرژەوەندی پەروەردەیی:**

لەبەر ئەوەی منداڵ بچوکەو لەژێر ڕکێفی باوك و دایکیدا ژیان بەسەردەبات, چونکە لەتەمەنی فێر بوون وپەروەردە کردندایە, وا چاك و شایستەیە دایك و باوك هەموو ڕێگاو هۆکارێك بگرنەبەر بۆ چاکسازی و ڕاستکردنەوەی لاریەکانی, پاککردنەوەی ویژدان و ڕەوشتی, هەتا پەروەردەبێ و گەشەبکات لەسەر ڕەوشتە جوان و تەواوەکانی ئیسلام و, ئەدەبە کۆمەڵایەتیە بەرزو بڵندەکان.

ئیسلام ڕێگای تایبەتی خۆی هەیە بۆ پەروەردەکردن و چاکسازی منداڵ, ئەگەر ئامۆژگاری و نەرم و نیانی سوودی هەبوو بۆ منداڵ ئەوە دروست نیە پەنا ببرێتە بەر دەنگی لێ وەرگرتن و وازی لێ بهێنرێ, ئەگەر دەنگ لێوەرگرتن و قەدەغەکردن سوودی هەبوو بۆی نابێ پەنا ببرێتەبەر لێدان, ئەگەر ئەو هەموو هۆکارانە سوودی نەبوو, ئەوە ئیتر قەیدی نیە لێدانێکی سوکی بکرێ بەمەرجێك هیچ شوێنێکی نەشکێنرێ و لە سەرو دەم و چاوو شوێنی مەترسیداری نەدرێ, بەڵکو ئەو لێدانە سوکە ببێتە هۆی چاك بوون و, ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی!!.

**ئەمانەی خوارەوە چەند هەنگاوێکێن بۆ چاکسازی منداڵ کە لەسوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و, کاروکردەوەی هاوەڵانی هەڵێنجراون, بۆ ئەوەیە - ئێوە ئەی پەروەردەکاران- شارەزای ڕێگەی ئیسلام لە چاکسازی و, بەرنامەی پەروەردەیی بن.**

* عومەری کوری ئەبو سەلەمە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموی: منداڵ بوم لەژێر چاودێری پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بووم لە کاتی نان خواردندا دەستم لەناو قاپەکەدا دەگێڕا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چاوی لێ بوو پێی فەرموم: **(يَا غُلَامُ سَمِّ اللَّهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ)**[1]. واتە: ئەی کورەکەم بۆ نان خواردن ناوی خوای گەورە بهێنەو بەدەستی ڕاستت لەبەردەم خۆتەوە نانەکەت بخۆ.

* سەهیلی کوری سەعد ڕەزای خوای لێ بێ فەرموی: ئاویان هێنا بۆ پێغەمبەری

[1] البخاري: ١٤٩٢, ومسلم: ١٠٦٩.

خوا صلى الله عليه وسلم ئەویش لێی خواردەوە, لەلای راستەوە کوڕێك دانیشتبوو لەلای چەپیشەوە چەند پیاوێکی پیر, جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە کوڕەکەی فەرموو: **(أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ هؤُلاء ؟)**. واتە: ئایا مۆڵەتم پێ دەدەیت ئاوەکە بدەم بەوانە؟ کوڕەکە وتی: سوێند بەخوا رێگە نادەم بەوەو کەس پێش خۆم ناخەم لەوەی کەتۆ بۆ منت داناوە, (**فَتَلَّهُ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم فِي يَدِهِ**)[1]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئاوەکەی دابە کوڕەکە. ئەو کوڕەش عبداللەی کوڕی عەبباس بووە.

لە بارەی دەنگ لێ وەرگرتنەوە لە منداڵ:

* ئەبو سەعید عبدللە کوڕی موغەففەل فەرموی: **(نَهَى رَسُول الله صلى الله عليه وسلم عَنِ الخَذْفِ)، وقالَ: (إِنَّهُ لاَ يَقْتُلُ الصَّيْدَ، وَلاَ يَنْكَأُالعَدُوَّ، وإِنَّهُ يَفْقَأُ العَيْنَ، وَيَكْسِرُ السِّنَّ )**. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پەلەپیتکە هاوێشتنی قەدەغکردووە, وە فەرمویەتی: ئەو کارە نە نێچیری پێ دەکوژرێ, نە دوژمنی پێ کۆڵەوار دەکرێ, بەڵام چاو کوێر دەکاو, ددان دەشکێنێ. لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: **(أَنَّ قَرِيباً لابْنِ مُغَفَّل خَذَفَ, فَنَهَاهُ، وَقالَ: إنَّ رَسُول الله صلى الله عليه وسلم نَهَى عَن الخَذْفِ، وَقَالَ: ( إنَّهَا لاَ تَصيدُ صَيداً ) ثُمَّ عادَ، فَقَالَ: أُحَدِّثُكَ أنَّ رسولَ الله – صلى الله عليه وسلم – نَهَى عَنْهُ ، ثُمَّ عُدْتَ تَخذفُ ! ؟ لا أُكَلِّمُكَ أَبَداً)**[2]. واتە: خزمێکی ئیبن موغەففەل - نەگەیشتبووە تەمەنی باڵغ بوون - پەلەپیتکەی دەهاویشت, ئەویش ئەو کارەی لێ قەدەغەکردوو گوتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پەلەپیتکە هاوێشتنی قەدەغکردووەو فەرمویەتی: بێگومان ئەو کارە راوی پێ ناکرێ, بەڵام خزمەکەی دووبارە تێ هەڵچۆوەو دەسیکردەوە بە پەلەپیتکە هاویشتن, عبداللە توڕە بوو گوتی: من پێت دەڵێم: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پەلەپیتکە هاوێشتنی قەدەغکردووەو رێگەی شتی وا نادا, کەچی تۆ دووبارە پەلەپیتکە

1- مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجه البخاري ١٤٤/٣ ( ٢٣٥١ ) ، ومسلم ١١٣/٦ ( ٢٠٣٠ ) ( ١٢٧ ).

2- مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجه البخاري ٦٠/٨ ( ٦٢٢٠ ) ، ومسلم ٧٢/٦ ( ١٩٥٤ ) ( ٥٦ ) .

دەهاوێژی, کەواتە ببڕای ببڕ قسەت لەگەڵ ناکەم!![1].

لەبارەی لێدانەوە عەمری کوڕی شوعەیب گێڕاویەتیەوە لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ**)[2]. واتە: فەرمان بکەن بەمنداڵەکانتان لەحەوت ساڵیدا نوێژ بکەن, لە دە ساڵیدا لێیان بدەن ئەگەر نوێژیان نەکرد, جێگەشیان جیابکەنەوە با بەیەکەوە نەخەون.

ئەم هەنگاوانەش بەپێی تەمەن ئەگۆڕێ کاتێ گەیشتە تەمەنی لاوی و گەورە بوو هەنگاوی چاکسازی و ئەدەب دادانی جیاوازە, ئەوەی پێشەوە باسمانکرد تەمەنی منداڵیە.

ئەگەر ئامۆژگاری و رێنمایی سوودی نەبوو ئەویش گەورە بوو بەردەوام سوربوو لەسەر ئاکارو رەوشتە خراپەکانی و لەرێ لادان و گومڕایی ئەوا پەروەردەکار ئەتوانێ دەنگی لێوەربگرێ بەهەمیشەیی.

ئەوەش ئێوەو ئەو بەڵگانەی ئەم ڕاستیە ئەسەلمێنن.

* ئیبن عەبباس گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**أَوْثَقُ عُرَى الإِيمَانِ: الْمُوَالاةُ فِي اللَّهِ، وَالْمُعَادَاةُ فِي اللَّهِ، وَالْحُبُّ فِي اللَّهِ، وَالْبُغْضُ فِي اللَّهِ**)[3]. واتە: پتەوترین لایەنی ئیمان: دۆستایەتیە لەبەر خوا, دوژمنایەتیە لەبەر خوا, خۆشەویستیە لەبەر خواو, ڕق لێبونە هەر لەبەر خوا.

* پێشەوا بوخاری لە باسی (دروستە دەنگ وەرگرتن لەو کەسانەی لاساری و تاوان ئەکەن)دا.. دەفەرموێ: کەعبی کوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ کاتێ لە غەزای تەبوك دواکەوت لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و هاوەڵەکانی گوتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قەدەغەیکرد لە موسوڵمانان کەقسەمان لەگەڵ

---

[1] - قال الشيخ الألباني صحيح, صحيح سنن إبن ماجة: ٨/١ برقم:١٧.

[2] - اخرجه ابو داود في الصلاة (٤٩٥), والترمذي (٤٠٧), و أحمد في المسند: (١٨٧\٢).

[3] - رواه الطبراني في معجم الكبير:٩/ ٤١٥, قال الشيخ الألباني حسن: سلسلة الأحاديث الصحيحه: ٦٩٨/٢ برقم: ٩٩٨.

بکەن تا پەنجا شەو، هەتا وایان لێهات ئەو زەویە فراوانەیان لەبەرچاو تەنگ بویەوەو توشی تەنگە نەفەسی بوون و لە خۆیان زۆر بێزار بوون، کەس قسەی لەگەڵ نەئەکردن و سلاٌویان لیٚ نەدەکردن و لەگەڵیان دانەئەنیشتن، هەتا خوای گەورە هات بە هانایانەوەو تەوبەو پەشیمانی لیٚ وەرگرتن و لیٚیان خۆشبوو.. [١].

* چەسپاوە لە پیٚغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم کە دەنگی لە هەندیٚ لە خیٚزانەکانی وەرگرتوە بۆ ماوەی مانگیٚ ئەوەش بۆ ئەدەب دادان و تەمیٚکردنیان بووە.

* عبدالله کوڕی عومەر رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەنگی لە کوڕیٚکی وەرگرت هەتاکو مرد, لەبەر ئەوەی ملکەچ نەبوو بۆ ئەو فەرمودەیەی کە باوکی لە پیٚغەمبەری صلی الله علیه وسلم گیٚڕایەوە, فەرمودەکەش ئەمە بوو: پیٚغەمبەری صلی الله علیه وسلم قەدەغەکردبوو لە پیاوان کە نەهیٚڵن ئافرەتان بچن بۆ مزگەوتەکان[٢].

ئەمە بۆ ئەوەیە ئەگەر تاوان و گوناهی کرد بەلاٌم لەسەر ئیمان و ئیسلام بوو، بەلاٌم ئەگەر کافر بوو یان لە ئیسلام دەرچوو, یا باوەری بەخوای گەورە نەبوو ئینکاری بوونی دەکرد ئەوا دەنگ وەرگرتن و خۆ بەریکردن و پشت لیٚ هەڵکردنی یەکیٚکە لە ئاسایی ترین پیٚویستیەکانی ئیمان و, ئاراستە دیارو ئاشکراکانی قورئانی پیرۆز.

ئەوەش ئیٚوەو ئەو دەقانە کە بەڵگەی چەسپاون لەسەر ئەو حەقیقەتانەی سەرەوە: **﴿لَا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾. المجادلة ٢٢.** واتە: کەسانیٚکت دەست ناکەویٚت بەڕاستی ئیمانیان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبیٚت، لە هەمان کاتدا خۆشەویستی دۆستایەتیان لەگەڵ کەسانێك یان کۆمەڵیٚکدا ببەستن، کە دوژمنایەتی خواو پیٚغەمبەری خوا بکەن، بائەو کەسانە باوکیشیان بن، یان کوڕەکانیان بن، یا برایان بن، یاخود لە هۆزو عەشیرەتی خۆیان بن.

خوای گەورە لەسەر زمانی نوح سلاٌوی خوای لەسەر بیٚ دەفەرمویٚت: **﴿وَنَادَى نُوحٌ**

---

[1] - البخاري: ٤٤١٨, ومسلم: ٢٧٦٩.

[٢] قال الشيخ الألباني صحيح في غاية المرام: ٤١١.

رَبَّهُ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ابُنِي مِنْ أَهْلِي وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ* قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ فَلاَ تَسْأَلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنِّي أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ﴾**. هود: ٤٥ – ٤٦.** واته: نوح له خودا پارایەوەو وتی: ئەی پەروەردگارم! کوڕەکەم یەکێکە لە ئەندامانی خێزانەکەم، تۆش بەڵێنی رزگار کردنیت پێدام کە فەرمانت کرد بەکەشتیەکە هەڵیانگرم، بەڵێنی تۆش حەق و راستەو دێتەدی، تۆ خاوەنی چاکترین حوکم و فەرمانیت. خوای گەورەش فەرموی: ئەی نوح ئەو کوڕەت لە ئێوە نیە، ئەو بێباوەڕ بوو، کردەوەی بێ باوەڕانی ئەنجام دەدا, تۆ داوای شتێکم لێ مەکە کەچاکی و خراپیەکەی نازانی و زانیاریت دەربارەی نیە، من ئامۆژگاریت دەکەم کە کارێك نەکەیت خۆت بخەیتە ریزی نەفام و نەزانانەوە.

وە خوای گەورە لەسەر زمانی ئیبراهیم سلاوی خوای لەسەر بێ دەفەرموێت: **﴿وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَاماً قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ﴾. البقرة:١٢٤.** واتە: فەرمانماندا بە ئیبراهیم کە چەند شتێك ئەنجام بدات، ئەویش زۆر بە جوانی ئەنجامیدان, ئینجا بە پێغەمبەریێتی کردمانە پێشەوای خەڵك, تا بیانبات بەرەو ئیمان و رێبازی خودا.. ئیبراهیم فەرموی: حەز دەکەم نەوەکانیشم لەو کارە پیرۆزە بێ بەهرە نەبن, خودا فەرموی: پێشەوایەتی بە خزمایەتی و بە باوك و کوڕ نیە, تەنها بۆ ئەو کەسانە دەسدەکەوێت کە بۆ خوا سوڵحاون, بەستەمکاران نادرێ, هەرگیز ئەوان شایەنی ئەو پلەو پایە مەزنە نین.

هەروەها خوای گەورە دەربارەی هەڵوێستی ئیبراهیم لە بەرامبەر باوکیدا دەفەرموێ: **﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلاَّ عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لأَوَّاهٌ حَلِيمٌ ﴾. التوبة: ١١٤.** واتە: داوای لێ خۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوکی لەبەر بەڵێنێ بوو کە پێی دابوو, کاتێ بۆی دەرکەوت باوکی بەراستی دوژمنی خوایە, ئیتر خۆی لێ بەری کردوو حاشای لێکرد, بەراستی ئیبراهیم زۆر بەسۆزو دڵنەرم بوو زۆر خاوەن حیلم بوو.

دەقی ئەم ئایەتانەی سەرەوە و چەندەها ئایەتی تری لەو بابەتە روونی دەکەنەوە کە ئەگەر منداڵ و خزمان سوربوون لەسەر بێباوەڕی, ئەوا بێگومان دەنگ وەرگرتن و

خۆ بەریکردن لێیان یەکێکە لە پێویستیەکانی عەقیدەو ئیمان, چونکە بەراستی ئیسلام پەیوەندی برایەتی ئیسلامی لەسەرووی پەیوەندی خزمایەتی و هاو نیشتمانی و پەیوەندی رەگەزایەتی و هاوزمانی و بەرژەوەندی بازرگانیەوە داناوە.. دروشمیشی لەمەدا ئەم ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ**﴾. **التوبة:٢٤**. واتە: ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەگەر باوك و کوڕ براو, ژن و خێزان وکۆمەڵ و خێڵ و خزمانتان, ماڵ و سامانێك پەیداتان کردووەو بازرگانیەك دەترسن رەواجی نەمێنێت, ئەو خانو بەرەو کۆشك و تەلارانەی کە بەلاتانەوە خۆش و جوان و دڵگیرن, هەر یەك لەمانەتان لە خواو پێغەمبەرەکەی لاخۆشەویستر بێت, خۆتان بگرن و چاوەڕێ بن هەتا فەرمان لە خواوە دێت و سزای سەختتان دەدات, خوایش رێنمایی لەشەرع دەرچووان ناکات بۆ هیچ خێرو چاکەیەك.

وەك ئاشکرایە بنەمای ئیسلام ناگۆڕێت: ﴿**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ..**﴾. **الحجرات:١٠**. واتە: بەراستی هەر ئیمانداران برای یەکن..

ئەم دروشمەش کە گۆڕانکاری تێدا ناکرێ: ﴿**إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ**﴾. **الحجرات:١٣**. واتە: بەراستی بەڕێز ترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لە خوا دەترسن و پارێزکارن. جا ئیتر بەچ قسەیەك لە پاش قورئان بڕوا دێنن؟

لە پاشان: ئەوەی لەم بەندەدا روونمان کردەوە گرنگترین هەست و سۆزی دڵ و دەروونی بوون کە پێویستە رەگ داکوتێ لە دەروونی پەروەردەکاراندا, بێگومان بینیت کە ئەم هەست و سۆزانە هەیانە شتێکی فیتریەو دڵ و دەروونی دایك و باوك پەیوەستە پێیەوە وەك هەست و سۆزی دڵ ناسکی و خۆشەویستی و بەزەیی و رەحمەت, کە ئەگەر وەها نەبوایە سوننەتی گەردوون بەو شێوەیە رێکو پێك نەدەبوو لە پارێزگاری کردنی جۆری مرۆڤەکاندا, وە هیچ پاڵنەرێك نەدەبوو بۆ باوك ودایك تاکو گرنگی بدەن بەمنداڵەکانیان, سەرپەرشتی و چاودێریان بکەن, خەرجیان بکێشن, هەستن پەروەردەکردن و فێرکردنیان.. وە ئەگەر وەها نەبوایە هیچ خێزانێکت نەدەدی کۆك بن

لەناو یەکداو ناکۆك نەبن, کیانیان یەکگرتوو بێ و, دیواری بیناکەیان جێگیرو دامەزراو بێ.

بێگومان هەروەك بینیت ئەو هەست و سۆزانە هەیانبوو هەست و سۆزی نەفامی بوو وەك رق بوونەوە لە کچان.. بەراستی ئەوەی رابوورد دەری دەخات کە ئیسلام چارەسەری داب و نەریتی خراپ و نارەوای نەفامی کردووە بەئیمانی راست و دروست, بە بیروباوەڕی خوا پەرستی جێگیر, بە پەروەردەیەکی ئیسلامی چاك, بۆ ئەوەی باوك و دایك وەك یەك سەیری کچان و کوڕان بکەن, هیچ جیاوازیەك نەکەن لە نێوانیاندا, وە بۆ سەلماندن و بەدیهاتنی بیرو باوەڕی دادپەروەری.

بێگومان هەروەك بینیت ئەو هەست و سۆزانە هەیانبوو هەست و سۆزی بەرژەوەندی بوون وەك سەرخستن و زاڵ بوونی خۆشەویستی بۆ جیهاد و تێکۆشان و بانگەواز بۆ لای خوا, بەسەر خۆشەویستی خانەوادەو ماڵ و منداڵدا.. بێگومان لەوەی رابوورد دەرکەوت کە پێویستە بەرژەوەندی ئیسلام بخرێتە پێش بەرژەوەندی و ئیعتیباراتی کەسێتیەوە, هەرگیز ناگونجێ ئومەتی ئیسلام بگاتە پلەی بەرزی سەرکەوتن و بەهێزی و شکۆمەندی, تاکو خۆشەویستی خواو پیەیامبەرەکەی و جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی ئەودا, نەخاتە پێش خۆشەویستی خانەوادەو ماڵ و منداڵ و هۆزەکەیەوە.

بێگومان هەروەك بینیت ئەو هەست و سۆزانە هەیانبوو هەست و سۆزی پەروەردەیی و ئەدەب دادان بوون وەك ئامۆژگاری منداڵ و قەدەغەکردن و دەنگ لێ وەرگرتن و سزادانی.. بەراستی لەوەی رابوورد دەرکەوت کە ئایینی ئیسلام رێگەی داناوە بۆ ئەدەب دادان پلە بەپلەو هەنگاو بەهەنگاو, لە ئامۆژگاریەوە بۆدەنگ لێ وەرگرتن تا دەگاتە لێدانێکی سوك, دروست نیە بۆ پەروەردەکار پەنا بباتەبەر توندوتیژی ئەگەر کاری ئاسانتر سودی هەبوو, ئەمە مورادو مەبەستی ئیسلامە کە هەوڵی بۆ دەدات بۆ پەروەردەکردنی منداڵ و ئەدەب دادان و چاکسازی دەروونی.

ئاگادارین و بزانن ئەی پەروەردەکاران و بانگخوازانی چاکسازی بەرنامەی پەروەردەیی و رێگای چاکسازی لە ئیسلامدا, بۆ ئەوەیە رێگاو بەرنامەیەکی راست و

دروست بگرنەبەر, لەسەر رێگای چاکسازی کۆمەڵایەتی هەنگاو هەڵگرن بەشێوەیەیەکی رێکوپێك.. ئەوەش گوێزانەوەی نەوەیە لە ژینگەی تاوانکاری و لادانەوە بۆ ژیانی پاکێتی و رێزو کەرامەت و رەوشت بەرزی.. ئاگاداربن بەو شێوەیە کار بکەن ئەی ئەوانەی ئیش و کاردەکەن!!.

## بەندی سێیەم: یاسا گشتیەکانی منداڵی تازە لە دایك بوو

### باسی یەکەم- کاری یەکەم رۆژی لە دایك بوون:

یەکێکی تر لە گەورەیی و پیرۆزی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەسەر نەتەوەی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم ئەوەیە هەموو ئەو ئەحکام و یاسایانەی پەیوەندیان هەیە بە کۆرپەی تازە بووەوە بەجوانی روونکردۆتەوە, تاکو دایك و باوك و پەروەردەکاران بە جوانی پێی هەستن و پەیڕەوی بکەن.

**١ـ موژدەدان و پیرۆزبایی کۆرپەی تازەبوو:**

شتێکی باشە بۆ موسڵمان دەست پێشکەری لەخۆشی و شادی برا موسڵمانەکەیدا بکات کاتێ کە کۆرپەیەکی تازەیان لەدایك دەبێ، خۆشی بخاتە دڵ و دەروونیانەوەو موژدەیان بداتێ، چونکە ئەو موژدە دانە پەیوەندی برایەتی بەهێز دەکات و باڵی خۆشەویستی و بەزەیی و هۆگری لە نێوان خێزانەکاندا بڵاودەکاتەوە, ئەگەر بۆی نەکرا ئەوە سوننەتە دوعای پیرۆزباییان بۆ بکا, بەڵکو خوای گەورە چاودێری بکاو دوعاکەی گیرا بکا.

بۆ رێنمایی و فێرکردنی نەتەوەی ئیسلام, قورئانی پیرۆز لە چەندەها شوێندا ئاماژەی داوە بە موژدەدان, چونکە موژدەدان کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر بەهێزکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە نێوان موسڵماناندا.

خوای گەورە لە بەسەرهاتی ئیبراهیم پێغەمبەردا سڵاوی خوای لەسەر بێ دەفەرموێت:﴿**وَلَقَدْ جَاءتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُـشْرَى قَالُواْ سَلاَماً قَالَ سَلاَمٌ فَمَا لَبِثَ أَن جَاء بِعِجْلٍ حَنِيذٍ* فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لاَ تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُواْ لاَ تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ* وَامْرَأَتُهُ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِن وَرَاء إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ..**﴾. **هود:٦٩-٧١**. واتە بەڕاستی مەلائیکەکانمان هاتنە لای ئیبراهیم بەموژدەوە وتیان: سڵاوی خودات لەسەر بێ! ئەویش وتی: سڵاوی خودا لەسەر ئێوەش بێت! هێندەی پێ نەچوو ئیبراهیم گوێرەکەیەکی برژاوی بۆ هێنان, جا کاتێ بینی

دەستیان درێژ ناکەن بۆی نائاسایی هاتنە بەرچاوی و لە دەروونی خۆیدا مەترسی لێکردن, وتیان مەترسە بەراستی ئێمە نێرراوین بۆسەر گەلی لووت, لەو کاتەدا خێزانەکەی وەستا بوو پێکەنی ئێمەش مزگێنی و مژدەمان پێدا بە ئیسحاق و لە دوای ئیسحاقیش مژدەمان پێدا بە یەعقوب. .

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ﴾. **الذاريات:٢٨**. واتە: مژدەمان دا بە ئیبراهیم بە رۆڵەیەکی زاناو خوێندەوار.

لە بەسەرهاتی زەکەریاشدا خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿فَنَادَتْهُ الْمَلآئِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَـى..﴾**. **آل عمران:٣٩**. واتە: مەلائیکە بانگی لێکرد لە کاتێکدا کە زەکەریا لە میحرابەکەدا وەستا بوو نوێژی دەکرد, بەراستی خودا موژدەت دەداتێ بە یەحیا..

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: **﴿يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَل لَّهُ مِن قَبْلُ سَمِيّاً﴾**. **مريم:٧**. واتە: ئەی زەکەریا! بەراستی ئێمە مژدەت دەدەینێ بەوەی کە منداڵێکت ئەدەینێ ناوی یەحیایە پێشتر ئەم ناوەمان لەکەس نەناوە.

* لە کتێبەکانی سیرەدا دەگێڕنەوە کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەدایك بوو کەنیزەکی ئەبو لەهەب کە ناوی سووەیبە بوو مژدەی لەدایك بوونی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم دا بە ئەبو لەهەب و وتی: ئەمشەو خوا کوڕێکی بەخشیوە بە عبدالله, ئەبو لەهەبیش لە خۆشیاندا سووەیبەی ئازاد کرد, خوای گەورە پاداشتی ئەو ئازادکردنەی سووەیبەی لێ بەزایە نەدا, ئەوە بوو لە دوای مردنی ئەبو لەهەب خوای پەروەردگار لە چاڵایی بن پەنجە گەورەکەیەوە ئاویدا بە ئەبو لەهەب [١].

سوهەیلی گێڕاویەتیەوە کە ئیبن عەباس فەرمویەتی: لە دوای مردنی ئەبو لەهەب لە خەودا بینیم لە حاڵێتێکی خراپدا بوو, گوتی: لە دوای ئێوە هیچ خۆشیم نەدیوە تەنها ئەوە نەبێ هەموو رۆژێکی دووشەمان ئازارو ئەشکەنجەم سوك دەبێ, ئەو رۆژەش ئەو رۆژە بوو کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تێیدا لەدایك بووە, سووەیبە

---

[1] - رواه البخاري:٥١٠١.

مژدەی پێداو ئەبو لەهەبیش دڵخۆش بوو بە لە دایك بوونی [1].

ئەبوبەکری کوڕی **(مونذر)** لە پێشەوا حەسەنی بەصریەوە دەگێڕێتەوە: کابرایەك لای دانیشتبوو, خوای گەورە کوڕێکی پێ بەخشیبوو, پیاوێك هات مژدەی دایە کە کوڕێکیان بووە, پیاوەکە وتی بە شێخ حەسەن لە پیرۆزبایی ئەو منداڵەدا چی بڵێم باشە؟ فەرمووی: بڵێ: **(بورك لك في الموهوب, وشكرت الواهب, ورُزقت برّة, وبلغ أشدّة)** [2] . واتە: بەخشراوەکەتان خوا پیرۆزی بکا, سوپاسی بەخشەرەکەشت کرد, ئەو منداڵەتان بۆ پێ بگا, وە خوا بۆتان چاك بکا.

بەڵام پێویستە ئەو مژدەدان و دوعاو پیرۆزباییە کوڕو کچ بگرێتەوە بەبێ جیاوازی.. چەند شایستەو جێگەی خۆیەتی کە موسڵمانان لەناو کۆمەڵگەی خۆیاندا ئەو سوننەت و ڕێبازە پیرۆزە جێبەجێ بکەن, بۆ ئەوەی پەیوەندیەکانی نێوانیان ڕۆژ بەرۆژ پتەوتر بێ, خۆشەویستی و برایەتی باڵ بکێشێ بەسەر ماڵ و خانەوادەکانیاندا, وە چەند شایستەیە هەموویان لەو ڕێگەیەوە بڕۆن کە بیانگەیەنێ بەخۆشەویستی و بەبرایەتی و یەك ریزی, تاکو هەمیشە ببنە بەندەی خواو برای یەکتر, وەك دیواری بەهێزو پتەو یەکتری بگرن و پێکەوە جۆشدراوبن.

**٢ - بانگدان بەگوێی ڕاستی منداڵدا:**

یەکێك لەو ئەحکامانەی شەریعەتی پاکی ئیسلام بۆ منداڵی تازەبووی داناوە ڕاستەوخۆ لەدوای لەدایك بوونیەوە بانگ و قامەتە بەگوێی دا.

* ئەبو رافع لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوەو فەرمویەتی: **(رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَذَّنَ فِي أُذُنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ حِينَ وَلَدَتْهُ فَاطِمَةُ)** [3]. واتە: من پێغەمبەری خوام صلی اللہ علیه وسلم بینی بانگیدا بەگوێی ڕاستی حەسەنی کوڕی عەلیدا لەو کاتەدا کە فاتمە بووی.

---

[1] - فتح الباري شرح صحيح البخاري: ٩/ ١٤٥ -١٤٦.

[2] - إبن قيم في كتاب (تحفة المودود بأحكام المولود).

[3] - حسنه الألباني في سنن أبو داود: ٤/٣٢٨ برقم: ٥١٠٥, والترمذي: ١٥٥٣.

* حەسەنی کوڕی عەلی ڕەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(مَن ولِدَ لَه فأذن في أذنه اليُمنى وأقامَ في اليُسرى لمَ تَضره أُم الصبيان)**[1]. واتە: هەرکەسێ منداڵی ببێ و بانگ بدات بەگوێچکەی ڕاستیداو قامەت بەگوێی چەپیدا(أم الصبيان) زیانی پێ ناگەیەنێنێ.

* هەروەها ئیبن عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بانگیدا بە بەگوێی ڕاستی حەسەنی کوڕی عەلیدا لەو ڕۆژەدا کە لە دایك بوو, قامەتیشی کرد بەگوێی چەپیدا [2].

نهێنی و حیکمەتەکانی بانگ و قامەت وەك ئیبن قەیم ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرموێت: ئەوەیە بایەکەمین دەنگ و ئاوازێك کە گوێچکەی مرۆڤ بزرنگێنێ دەنگ و ئاوازی(الله اکبر)و بانگ بێ کەناوەڕۆکەکەی گەورەیی و بەرزی خوای بێ هاوتا دەگەیەنێ, بایەکەمین شت کەبچێ بە گوێچکەی ئینساندا وشەی گەواهی(لا اله الا الله) بێ چونکە وەکو چۆن لەکاتی دەرچوونی ئینسان لە دونیادا بە وشەی(لا اله الا الله) تەلْقین دەکرێ با لەکاتی هاتنە دونیاشدا وشەی گەواهی شایەتی(لا اله الا الله) بدرێ بە گوێچکەیدا, ئینکاری ئەوە ناکرێ کە ئەو بانگە چەندە کاریگەری هەیە بۆ سەر دڵی منداڵ با هەستیشی پێ نەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سودانەی تریشی هەیە: بەبیستنی بانگ شەیتان لەلای منداڵەکەو لەو شوێنەدا نامێنێ و هەڵدێ, شەیتان خۆی لەکەمیندا مات دەکا تا منداڵ لەدایك دەبێ ئەوکاتە خۆی دەکات بە هاوشانی بۆ مەینەتی و دەردی سەری منداڵەکە و ناڕەحەت کردنی.

مانایەکی تری تێدایە: ئەویش ئەوەیە بانگکردنی منداڵ بۆ لای خواو ئایینی ئیسلام و خوا پەرستی, پێش بانگکردنی شەیتان بکەوێ, هەروەك چۆن فیترەتی

---

[1] - رواه إبن السنى و البيهقي, قال الألباني موضوع في الإرواء الغليل: ١١٧٤/٤.

[2] - رواه البيهقي في شعب الإيمان: والألباني في الكلم الطيب: ١١١, والأرائؤوط في وابل الصيب: ١٧٦ وهو حديث حسن.

خوایی کە خەڵکی لەسەر دروستکردووە , پێشکەوتووە لەسەر گۆڕینی شەیتان بۆ ئەو فیترەتەو لادانی خەڵك و لابردنیان لەو فیترەتە، چەندەها حیکمەتی تر.. [1].

بەڕاستی ئەم واتا و حیکمەتانەی ئیبن قەیم باسی کردوون گەورەترین بەڵگەن لەسەر ئەوە کە پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم زۆر گرنگی داوە بە بیروبڕواو یەکتاپەرستی منداڵ، زۆر هەوڵی داوە بۆ دەرکردن و دورخستنەوەی شەیتان و هەواو ئارەزوو لە منداڵ هەر لەوکاتەوە کە دێتە سەر دونیاو هەوای ژیان و شنەو سروەی بوون هەڵدەمژێ.

**٣- شیرینکردنی دەم و مەلاشوی منداڵ:**

یەکێك لەو ئەحکامانەی شەریعەتی پاکی ئیسلام بۆ منداڵی تازەبووی داناوە شیرینکردنی دەم و مەلاشوی منداڵە لە سەرەتای لەدایك بوونیەوە.

بەلام با بزانین شیرینی لە دەم وەردانی منداڵ چییە؟ حیکمەتەکانی چییە؟ شیرینکرنی دەم مەلاشو بریتیە لە مژینی دەنکە خورمایەك و بەنەرم و نیانی هێنانی بەلای راست و چەپی ناودەم و مەلاشوی منالی تازەبوودا بەپەنجەی دەست بۆ ئەوەی هەموو ناو دەم بگرێتەوە, ئەگەر خورما دەست نەکەوت هەر ماددەیەکی شیرینی تر هەبوو واباشە پێی بکرێ وەك هەنگوین کە لەدوای خورما باشترین شتە, لەبەر شوێنکەوتنی کارو کردەوەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و پەیڕەوی سوننەتەکانی.

حیکمەتەکانی شیرینی لەدەم وەردان ئەبێتە هۆی بەهێزکردنی ماسولکەکانی دەم و هەردوو شەویلاگ بەجوولانی زمان و مژینی شیرینیەکە, ئەو کاتە ئامادەیی باشی دەبێ بۆ گرتنی مەمکی دایکی و هەڵمژینی شیرەکەی بە ئاسانی.. چاکتر وایە ئەو کەسەی ئەو کارە ئەکات خوا ناس و پارێزکار بێ, دوعای خێر بکات بۆ منالەکە بەڵکو تەمەن درێژو بۆ خوا سوڵحاو بێ.

---

[1] - بڕوانە کتێبی (تحفة المودود بأحكام المولود) دانراوی: (ابن قيم الجوزية) لێکۆڵینەوەی محمد صبحی حسن حلاق. ل٤٨ ـ ٤٩.

ئەو فەرمودانەی سوننەتن و لەو بارەوە هاتوون ئەمانەن:

* ئەبو بەردە لە ئەبو موساوە رەزای خوایان لیّ بیّ دەگیّڕیّتەوەو دەلّیّت: خوای گەورە کوڕیّکی پیّ بەخشین منیش بردم بۆ خزمەتی پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناوی نا ئیبراهیم و, بەدەنکە خورمایەك دەم و مەلاّشوی منداڵەکەی شیرینکردو دوعای خیّرو بەرەکەتی بۆکردو دایەوە دەستم[١].

* ئەنەسی کوڕی مالیك رەزای خوای لیّ بیّ فەرمویەتی: ئەبو تەڵحە کوڕیّکی هەبوو زۆر نەخۆش بوو, ئەبو تەڵحە چوو بووە دەرەوەو کوڕەکەشی وەفاتی کرد, کاتیّ ئەبو تەڵحە گەڕایەوە وتی: کوڕەکەمان چۆنە؟. ئوم سولەیم وتی: زۆر باشە, ئەمجا نانی بۆ ئامادەکردو تیّری خوارد, خۆی بۆ رازاندەوە لەجاران چاکتر, ئەویش جووتبوو لەگەڵی, ئوم سولەیم پیّی وت: ئەی ئەبو تەڵحە کوڕەکە مردووە بچۆ ئەسپەردەی بکەو بیشارەوە, بەیانی ئەبو تەڵحە رۆشت بۆ لای پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵەکەی بۆ گیّڕایەوە. ئەویش فەرموی: (**أَعْرَسْتُمْ اللَّيْلَةَ**). ئەمشەوتان کرد بە شایی و زەماوەند؟. ئەبو تەڵحە وتی بەڵیّ. پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: (**بَارَكَ الله لَيْلَتَكُما**) خوایە فەڕو بەرەکەتی خۆتیان بۆ بنیّری, ئوم سولەیم کوڕیّکی تری بوو گوتی: ئەبو تەڵحە پیّی گوتم: هەستە ئەم مناڵە بەرە بۆلای پیّغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەهەندیّ خورماوە. پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مناڵەکەی لیّ وەرگرت و فەرموی: ( **أَمَعَهُ شَيءٌ ؟**).کوا هیچی لەگەڵدایە, گوتیان بەڵیّ هەندیّ خورمای لە گەڵدایە, ئەمجا پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەنکە خورمایەکی وەرگرت و خستیە ناو دەمی و دەم و مەلاّشوی مناڵەکەی شیرینکردو ناوی نا عبدالله[٢].

ئەبوبەکری خەلال فەرموی: موحەممەدی کوڕی عەلی بۆی گیّڕامەوەو فەرموی: بیستم لە دایکی کوڕیّکی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەیگوت: کاتیّ ژان گرتمی مەولای

[1] - رواه البخاري: ٥٤٦٧, ومسلم: ٥٥٨٠.

[2] - متفقٌ عَلَيْهِ: البخاري: ١٣٥/٣, ومسلم: ٢١٤٤.

خەوتبوو گوتم: ئەی مەولای هەستە وا خەریکە دەمردم لەتاو ژان, ئەویش گوتی: خوای گەورە دەروی خێرت لیّ بکاتەوەو خۆشی بخاتە دلّتەوە, ئەو هەر ئەوەی دەگوت, منیش سەعیدم بوو, گوتی ئا ئەوە خورمایە, خورمای مەککەمان هەبوو, گوتی بەدایکی عەلی: ئەم خورمایە بجاوەو دەم و مەلاّشوی پیّ شیرین بکە ئەویش کردی.

**٤- سەرتاشینی مندالّ:**

یەکێك لەو ئەحکامانەی شەریعەتی پاکی ئیسلام بۆ مندالّی تازەبووی داناوە سوننەتە لە حەوتەم رۆژی لەدایك بوونیدا سەری بتاشریّ و مووەکەشی کێشانە بکریّ بەزیو, زیوەکەش بکریّ بەخێرو ببەخشریّ بە هەژارو نەدارەکان.

حیکمەت لەوەدا دوو شتە:

یەکەم- حیکمەتی تەندروستی: لابردنی ئەو مووە سەری کۆرپەی تازە بوو دەبێتە هۆی بەهێزکردن و کردنەوەی کونی مووەکانی سەرو, بەهێزکردنی هەستیاری بینین و بیستن [1].

دووەم- حیکمەتی کۆمەلاّیەتی: بەقەد کێشی ئەو مووە زیو بەخشین سەرچاوەو کانیاوێکی ترە لەسەر چەشمەی کانیاوەکانی تری هاوبەرپرسێتی کۆمەلاّیەتی, ئەوەش بۆ سەرکەوتن بەسەر هەژاریداو, سەلماندن و بەدیهێنانی دیاردەی یارمەتیدان و بەزەیی و پتەوکردنی رۆحی برایەتی و هاو بەرپرسیاریە لەناو کۆمەلّگەدا.

ئەو فەرمودانەی کە شەرعزانەکان کردویانە بەبەلّگە لەسەر ئەوەی کە سوننەتە سەری مندالّ بتاشریّ و بکێشریّ بەزیوو, زیوەکەش بکریّ بەخێر ئەمانەی لای خوارەوەن:

جەعفەری کوڕی موحەممەد رەزای خوای لیّ بیّ لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوەو فەرمویەتی: فاتمەی کچی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مووی سەری حەسەن و حوسەین و زەینەب و ئوم کەلسومی بەزیو کێشانە کردوو دوایی کردی بەخێرو صەدەقە [2].

---

[1] - تحفة المودود لإبن قيم.

[2] - أخرجه الإمام مالك في الموطأ: ٥٠١/٢.

* عبدالله كوڕى ئەبوبەكر رەزاى خوايان لىٰ بىٰ گێڕاويەتيەوە كە موحەممەدى كوڕى عەلى كوڕى حوسەين رەزاى خوايان لىٰ بىٰ فەرمويەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم مەرێكى بۆ حەسەن كرد بەگوێزەبانەو فەرموى: **(يَا فَاطِمَةُ احْلِقِي رَأْسَهُ وَتَصَدَّقِي بِزِنَةِ شَعْرِهِ فِضَّةً قَالَ فَوَزَنَتْهُ فَكَانَ وَزْنُهُ دِرْهَمًا أَوْ بَعْضَ دِرْهَمٍ)**[١]. واتە: ئەى فاتمە سەرى حەسەن بتاشەو بەقەد كێشانەى مووەكەى زيو ببەخشە بە هەژاران, ئەوە بوو فاتمە مووەكەى كێشاو ئەندازەى درهەمێك يان لە درهەمێك زياتر دەبوو.

* يەحياى كوڕى بەكير گێڕاويەتيەوە كە ئەنەسى كوڕى ماليك رەزاى خواى لىٰ بىٰ فەرمويەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانيدا سەرى حەسەن و حوسەين بتاشن لە رۆژى حەوتەمى لە دايك بونياندا, وە بەقەد كێشانەى مووەكانيان زيو ببەخشن.

بەڵام نابێت بەشێك لەسەرى منداڵ بتاشرىٰ و بەشيكى بهێڵرێتەوە ئەوەش لەزمانى عەرەبيدا پێى دەوترىٰ(القزع) چونكە ئەوە بەدەقى فەرمودە قەدەغەكراوە:

* ئيبن عومەر رەزاى خوايان لىٰ بىٰ گێڕاويەتيەوەو فەرمويەتى: **(أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ الْقَزَعِ)**[٢]. واتە: بێگوان پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم تاشينى هەندێكى سەرى منداڵ و نەتاشينى هەندێكى ترى قەدەغەكردووە.

ئەو قەدەغەكردنەش ئەم چوار جۆرانە دەگرێتەوە:

١- سەرى لێرە لەوىٰ بتاشرىٰ و پەڵە پەڵەى پێوە بمێنێتەوە.

٢- ناوەڕاستى بتاشرىٰ و ئەم لاولاى بهێڵرێتەوە.

٣- ئەم لاولاى بتاشرىٰ و ناوەڕاستەكەى بهێڵرێتەوە.

٤- پێشى سەرى بتاشرىٰ و بەشى دواوەى بهێڵرێتەوە.

ئيبن قەيم رەحمەتى خواى لىٰ بىٰ دەفەرموىٰ: ئەمانە هەموويان ئەوپەڕى

---

[1]- تحقيق الألباني: (صحيح) انظر حديث رقم: ٧٩٦٠ في صحيح الجامع., الجامع الترمذي: ٩٩/٤برقم: ١٥١٩, وفي الإرواء: ١١٧٥.

[2]-رواه البخاري: ٥٩٢٠, ومسلم: ١١٣.

خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەیەتی بۆ عەدالەت و دادپەروەری، چونکە خوای پەروەردگار فەرمانی بە دادپەروەری کردووە هەتا بە موسڵمان بەرامبەر بەخودی خۆی, ئەوەتە خوای پەروەردگار قەدەغەیکردووە کە ئینسان بەشێك لەسەری خۆی بتاشێ و بەشێکی تری بهێڵێتەوە, چونکە ئەوە ستەمە لە سەری مرۆڤ دەکرێ هەندێکی سەری پۆشتەیەو هەنێکی تری رووت و قوتە.. وێنەی ئەمەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانیشتنی ئینسان لایەکی لە سێبەردا بێ و لاکەی تریشی لەبەر هەتاو بێ قەدەغەکردووە [1], چونکە ئەمەش ستەمە بۆ لایەکی جەستەی.. هەروەها وێنەی ئەمەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوەی قەدەغەکردووە کە ئینسان بەتاکێ پێڵاوەوە هاتوچۆ بکات, بەڵکو دەبێ هەردوو پێڵاوەکەی لەپێ بکا ئەوکاتە بڕوات, یان هەردوو پێڵاوەکەی داکەنێ و بەپێی پەتی بڕوات [2].

لێرەدا هەندێ حیکمەتی تر هەیە: بەراستی پێغەمبەری خۆشەویست صلی الله علیه وسلم زۆر سوربووە لەسەر ئەوەی کە موسڵمان لە کۆمەڵگەدا بەدیاردەیەکی جوان و رێکوپێك دەربکەوێ, هەموو جەستەی پاك و خاوێن بێ و بەهەیبەت بێ..

تاشینی بەشێك لە مووی سەرو نەتاشینی هەندێکی لەگەڵ ویقارو جوانی و کەسایەتی موسڵماندا ناگونجێ, چونکە کەسایەتی و بیروباوەڕی موسڵمان جیاوازە لە کەسایەتی و بیروباوەڕی نەتەوەو خەڵکانی گوناحکارو گومڕای میلەتانی تر.

بەڵام بەداخەوە زۆر لە باوکان و دایکان و پەروەردەکاران ئەو یاسایانەی ئیسلام نازانن و لێی بێ ئاگان, ئەگەر پێشیان بڵێی یان بۆیان باس بکەیت زۆر سەیر ئەبێ بەلایانەوە, چونکە پێیان نەگەیشتووە یان کەسیان نەدیوە جێبەجێی بکاو پەیڕەوی لێ بکا, مەگەر کەسێ کە پەروەردگار میهرەبانی لەگەڵ کردبێ.

ئەمەوێ بچپێنم بەگوێی ئەو جۆرە باوکانەداو بڵێم: نەزانی بەهانە نیە لە

---

[1] - أخرجه أحمد في المسند: ٤١٣/٢ - ٤١٤, والحاكم في المستدرك: ٢٧١/٤.

[2] - البخاري: ٢٠٩/٧, ومسلم: ١٦٦٠/٣.

شەریعەتی ئیسلامدا, پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێ کە شارەزای ئەحکامەکانی ئایین بێ و منداڵەکانی لەسەر پەروەردە بکات, ئەگینا لەو بەرپرسێتیە رزگاری نابێ لەو رۆژەدا کە خەڵك لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیاندا دەوەستن.

ئەو ئەحکام و یاسایانەی کە باسمانکردن هەیانە سوننەتەو هەشیانە موستەحەبە, پێویستە کاریان پێ بکرێ و پەیڕەویان لێ بکرێت بەگشتی لەناو ماڵ و منداڵ و کەس و کارو خێزانەکاندا.. چونکە بەراستی ئەگەر نەرمیمان نواند لە سوننەت و موستەحەبەکانداو جێبەجێمان نەکردن, ئەو کاتە ئاسایی دەبێت بەلامانەوە فەرزەکانیش ئەنجام نەدەین, بەڵکو پەیڕەوی ئیسلامیش ناکەین بەگشتی. لە کۆتاییدا موسڵمانی رووکەش دەکەوێتە ناو داوی کوفرو گومڕایی و بێ باوەڕیەوەو, دادەماڵرێت لە ئیسلام و ئایینەکەی!.

ئاگاداربن ئەی پەروەردەکاران دەسبگرن بەو ئەحکامانەوەو جێبەجێیان بکەن بەسەر منداڵەکانتاندا یەك لەدوای یەك, بۆ ئەوەی رەزامەندی خوا بەدەسبێنن و, بۆ سەلماندنی ئیسلام و بەدیهاتنی بەگوفتارو بەکردەوە بەڵکو خوای پەروەردگار سەرکەوتووتان بکات بەسەر دوژمنانداو, ئەو شکۆمەنی و رێزەی کە زەوتکراوە لە موسڵمانان بیگێڕنەوە, ئەوەش لای خوای پەروەردگار زۆر ئاسانەو قورس و گران نیە.

## باسی دووەم: ئەحکامەکانی ناونانی منداڵ

یەکێ لەداب و نەریتەکانی کۆمەڵایەتیەکان ئەوەیە کاتێ منداڵ لە دایك دەبێ باوك و دایك ناوێکی چاك و ناوێکی جوان و نازناوێکی چاکی لێ دەنێن بۆ ئەوەی لای چاك و خراپ پێی بناسرێ.. ئیسلام بەو شەریعەتە گشتی و تەواوەی کە هەیەتی گرنگی زۆری داوە بەو دیاردەیە, چەندەها ئەحکام و یاسای داناوە بۆ ئەو مەبەستە کە گرنگی پێدانی هەستی پێ دەکرێ, تاکو گەلی ئیسلامی ئەو ئەحکامانە بزانن کە پەیوەندی هەیە بەپەروەردەی منداڵەکانیانەوە, وە شرەزای هەموو ئەو شتانە بن کە دەبنە هۆی بەرزی پلەو پایەیان و پەیوەندی هەیە بە کارو باریانەوە.

**ئەوەش ئێوەو ئەو یاساو ئەحکامانەی کە ئیسلام دایناون بۆ ناونانی منالی تازە لە**

دایك بوو:

**١ - منداڵ کەی ناوی لێ دەنرێت؟**

* سەمورە رەزای خوای لێ بێ فەرموی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**كُل غُلَامُ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ يُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ وَيُسَمَّى وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ**)[1]. واتە: هەموو منداڵێکی تازە لەدایك بوو گەردن بەندی ئەو گوێزەبانەیە کە لەرۆژی حەوتەمی تەمەنیدا بۆی سەردەبڕیێ, هەر لەو رۆژەشدا ناو دەنرێ و سەریشی دەتاشرێ.

ئەم فەرموودە پیرۆزە ئەوە دەگەیەنێ کە ناونان لە رۆژی حەوتەمدا دەبێ.

هەروەها چەندها فەرموودەی تر هەن بەڵگەن لەسەر ناونانی منداڵ لە رۆژی لە دایك بوونیدا:

* سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی رەزای خوای لێ بێ فەرموی: خوای پەروەردگار کوڕێکی بەخشی بە ئەبو ئوسەید رەزای خوای لێ بێ ئەویش خێرا بردی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و خستیە سەر کۆشی, ئەبو ئوسەید دانیشت, لەو کاتەدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەشتێکەوە سەرقاڵ بوو فەرمانیدا بە ئەبو ئوسەید کە منداڵەکەی لێ بگرێ, ئەویش لێی گرت, پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموی: (**أَيْنَ الصَّبِيُّ**). کوا منداڵەکە؟ ئەبو ئوسەید گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گەڕاندمانەوە بۆ ماڵەوە, فەرموی: (**مَا اسْمُهُ**). ناوی چییە؟ گوتم: فلان, فەرموی: (**وَلَكِنْ أَسْمِهِ الْمُنْذِرَ**)[2]. نا ناوی مونزیرە.

* ئەنەس رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**وُلِدَ لِي اللَّيْلَةَ غُلَامٌ فَسَمَّيْتُهُ بِاسْمِ أَبِي إِبْرَاهِيمَ**)[3]. واتە: ئەمشەو کوڕێکمان بوو, بەناوی باوکمەوە ناوم نا ئیبرهیم.

---

[1] - روه أصحاب السنن, وصححه الألباني في صحيح الجامع : ٢٥٦٣, وجامع الترمذي: ١٠١/٤ برقم ١٥٢٢.

[2] -البخاري: ٦١٩١, ومسلم: ٢١٤٩..

[3] - صحيح البخاري: ٥٨٧/٩, ومسلم: ٥٩٦٩, سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٦٥٠/٥برقم: ٢٤٩٣.

لەم فەرمودانەوە ئەوە وەردەگیرێ کە فەرمانەکە بەرفراوانەو ئاسانکاری تێدا کراوە, دروستە منداڵ لەیەکەم ڕۆژی لەدایك بوونیەوە ناو بنرێ, یان لە سێیەم ڕۆژدا, یا لە ڕۆژی گوێزەبانەدا کە حەوتەم ڕۆژە, هەروەها دروستە پێشتر یان دواتر ناوی لێ بنرێ.

**٢- هەڵبژاردنی ناوی چاك و ناوی ناپەسەند:**

ئەوەی زۆر پێویستە لەسەر پەروەردەکار گرنگی پێ بدات لە کاتی ناونانی منداڵدا ئەوەیە هەوڵ بدا کام ناوی چاك و جوان و باشە ئەوە بۆ منداڵەکەی هەڵبژێرێ, لەبەر بەجێهێنانی ئەو بڕیارەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێکردووەو, خەڵکی شارەزا کردووە لێی.

* ئەبو دەرداء ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَسْمَائِكُمْ وَأَسْمَاءِ آبَائِكُمْ فَأَحْسِنُوا أَسْمَاءَكُمْ)**[1]. واتە: ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا بەناوی خۆتان و باوکتانەوە بانگ دەکرێن, کەواتە با ناوەکانتان چاك و خۆش بێ.

* ئیبن عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ إِلَى اللَّهِ عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ)**[2]. واتە: خۆشەویسترین ناو بەلای خواوە ناوی (عبدالله و عبدالرحمن)ە.

هەروەها پێویستە لەسەر پەروەردەکار دوور بکەوێتەوە لەو ناوانەی ناپەسەندو ناشەرعین و, دەبنە هۆی سوکایەتی و گاڵتە پێکردنی منداڵ لەلایەن کەسانی ترەوە, ئەوەتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناوی خراپ و ناشیرینی گۆڕیوە: **(كَانَ يُغَيِّرُ الِاسْمَ الْقَبِيحَ)**[3].

---

[1] - رواه أبوداود بإسناد حسن في السنن: ٥/٢٣٦, وأحمد في مسند: ٥/١٩٤, وضعفة الألباني في تحقيق الكلم الطيب ص١١٢ رقم تعليقه: ١٥٩.

[2] - صحيح, رواه مسلم:٢١٣٢, سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٣/٣٣ برقم:١٠٤٠.

[3] - صحيح الجامع الترمذي: ٨/ ١٢٤-١٢٥, وفي صحيح الجامع: ٤٩٩٤.

* ئیبن عومەر رەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە کچێکی عومەر ناوی عاصیە بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گۆڕی بە جەمیلە.

هەروا ئەبو داود فەرمویەتی: (**غَيَّرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْمَ الْعَاصِ وَعَزِيزٍ وَعَتَلَةَ وَشَيْطَانٍ وَالْحَكَمِ وَغُرَابٍ وَحُبَابٍ وَشِهَابٍ فَسَمَّاهُ هِشَامًا وَسَمَّى حَرْبًا سَلْمًا وَسَمَّى الْمُضْطَجِعَ الْمُنْبَعِثَ وَأَرْضًا تُسَمَّى عَفِرَةَ سَمَّاهَا خَضِرَةَ وَشَعْبَ الضَّلَالَةِ سَمَّاهُ شَعْبَ الْهُدَى وَبَنُو الزِّنْيَةِ سَمَّاهُمْ بَنِي الرِّشْدَةِ وَسَمَّى بَنِي مُغْوِيَةَ بَنِي رِشْدَةَ**)[1]. واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناوی (**الْعَاصِ وَعَزِيزٍ وَعَتَلَةَ وَشَيْطَانٍ وَالْحَكَمِ وَغُرَابٍ وَحُبَاب وَشِهَاب**)ی گۆڕیوە، شیهاب و حوبابی گۆڕی و کردی بە هاشم، ناوی حەربی گۆڕی و کردی بە (**سَلْم**)ئاشتی، ناوی (**الْمُضْطَجِع**) واتە پاڵکەوتوی گۆڕی بە (**الْمُنْبَعِثَ**) واتە دەرکەوتوو, زەویەك ناوی (**عَفِرَة**) بوو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گۆڕی و کردی بە (**خَضِرة**) واتە سەوزایی، هەروا ناوی (**شَعْبَ الضَّلَالَة**)ی گۆڕی و کردی بە (**شَعْبَ الْهُدَى**)، (**بَنِي مُغْوِيَةَ**) گۆڕی و کردی بە (**بَنِي رِشْدَةَ**). ئەبو داود فەرموی: لەبەر درێژی فەرمودەکە سەنەدەکانم واز لێ هێناوەو کورتم کردەوە.

هەروەها پێویستە لەسەر پەروەردەکار دوور بکەوێتەوە لەو ناوانەی کە مانای رەشبینی دەبەخشێ, تاکو منداڵ سەلامەت بێ لە رەشبینی ئەو ناوە.

* لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموم: (**مَا اسْمُكَ**) ناوت چییە؟ منیش گوتم: ناوم (حزن)ە, پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: (**أَنْتَ سَهْلٌ**). نەخێر باناوت سەهل بێ منیش گوتم: ئەو ناوەی باوکم لێی ناوم نایگۆڕم. ئیبن موسەییب فەرموی: ئەو نەگۆڕینەی ناوی باپیرەم بوو بەهۆی مانەوەی توندو تیژی لەناو نەوەکانی باپیرمدا[2].

* ئیمام مالیك لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە دەگێڕێتەوە کە پێشەوا عومەری

---

[1] - صحيح سنن ابي داود: ٢٨٩/٤ برقم: ٤٩٥٦.

[2] - صحيح البخاري: ٥٧٤/١٠, صحيح سنن أبوداود: ٢٨٩/٤برقم:٤٩٥٦.

کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لێ بێ فەرموی بە پیاوێك: تۆ ناوت چییە؟ وتی: **(جَمْرَةُ)** ناوم پشکۆیە, پێشەوا فەرموی: کوڕی کێی؟ وتی: **(ابْنُ شِهَابٍ)** کوڕی بڵێسەم, فەرموی: لە کوێوە هاتوی؟ وتی: **(مِنْ الْحُرَقَةِ)** لە سوتاوەوە, پێشەوا عومەر فەرموی: ئەی ماڵتان لە کوێیە؟ کابرا گوتی: **(بِحَرَّةِ النَّارِ)** ماڵمان لە گەرمی ئاگرە, پێشەوا فەرموی: **(أَدْرِكْ أَهْلَكَ فَقَدْ احْتَرَقُوا)**. کاکە پشکۆ بڕۆ بگە ماڵ و منداڵەکەت هەموو سوتان. دوایی کە پرسیاریان کرد قسەکەی عومەر ڕاست دەرچوو[١].

هەروەها پێویستە لەسەر پەروەردەکار دوور بکەوێتەوە لەو ناوانەی کە تایبەتن بە خواوە دروست نیە ئەم ناوانە لە منداڵ بنرێ: (الاحد, الصمد, الخالق, الرزاق).. بێجگە لە مانەش.

❊ ئەبو داود لە سونەنەکەیدا ریوایەتی کردووە کە **(هَانِئ)** لەگەڵ هۆزەکەیدا بەوەفد چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم, پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گوێی لێ بوو خەڵکەکە بە(**بِأَبِي الْحَكَمِ**) ناویان دەبرد, پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: **(إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ فَلِمَ تُكْنَى أَبَا الْحَكَمِ)** خوای گەورە تەنها خۆی دادوەرەو, حوکم تەنها هەر بۆلای ئەو دەگەڕێتەوە, بۆچی ئەو نازناوەت هەڵبژاردووە بۆ خۆت, ئەویش وتی: هۆزو قەومەکەم هەرکاتێ ناکۆکی و کێشەیان ببوایە دەهاتنە لای من منیش دادوەریم دەکرد لە نێوانیاندا, ئەوانیش رازی دەبوون, پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: **(مَا أَحْسَنَ هَذَا فَمَا لَكَ مِنْ الْوَلَدِ)**.ئەوە شتێکی چاکە, ئایا تۆ کوڕت هەیە؟ گوتی بەڵێ **(شُرَيْحٌ وَمُسْلِمٌ وَعَبْدُ اللَّه)**م هەیە. پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: **(فَمَنْ أَكْبَرُهُمْ)**.کامیان گەورەکەیانە؟ گوتی: شورەیح, پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: **(فَأَنْتَ أَبُو شُرَيْحٍ)**[٢].کەوابوو تۆ ئەبو شورەیحی.

❊ ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله

---

[1] - رواه الإمام مالك في الموطأ: ٨٠/٦ برقم: ١٥٤١.

[2] - قال الشيخ الألباني صحيح في سنن أبوداود: ٢٨٩/٤برقم:٤٩٥٥.

علیه وسلم فەرمویەتی: خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا گەورەترین رق و تورەیی لە پیاوێکە کە پێی دەڵێن شاهی شاهان: **(أَغْيَظُ رَجُلٍ عَلَى اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَخْبَثُهُ وَأَغْيَظُهُ عَلَيْهِ رَجُلٍ كَانَ يُسَمَّى مَلِكَ الْأَمْلَاكِ)**[1].

هەروەها پێویستە لەسەر پەروەردەکار دووربکەوێتەوە لەو ناوانە کە نا بخرێتە سەریان ببێتە هۆی وەڕسبوونیان لە کاتی بانگ کردنناندا وەك ناوەکانی: یسار واتە دەوڵەمەند, نافع واتە قازانج, رباح و أفلح واتە سەرکەوتوو, چونکە ئەگەر وانەبوو لە وەڵامدا دەڵێن نەخێر دەوڵەمەند نیە, نەخێر قازانجی نەکردووە, نەخێر سەرکەوتوو نیە بەهەمان شێوە..

* سەمورە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیه وسلم فەرمویەتی: **(أَحَبُّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ أَرْبَعٌ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ لَا يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْتَ وَلَا تُسَمِّيَنَّ غُلَامَكَ يَسَارًا وَلَا رَبَاحًا وَلَا نَجِيحًا وَلَا أَفْلَحَ)**[2]. واتە: خۆشەویسترین وشە لای خوای گەورە ئەم چوارەن**(سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ)**, منداڵەکەت ناو مەنێ یەسار, رەباح , نەجاح و ئەفلەح.

* ئیبن ماجە ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیه وسلم قەدەغەی کردووە منداڵ ناو بنێن **(أَفْلَحَ وَرَبَاحٍ وَيَسَارٍ وَنَافِعٍ)**[3].

هەروەها پێویستە لەسەر پەروەردەکار دووربکەوێتەوە لەو ناوانەی کە(عبد)یان پێوەیەو دەدرێنە پاڵ جگە لە خودا وەك: عبد العزى, عبد الكعبه, عبد النبى, وێنەی ئەوانە, چونکە بە کۆی یەکدەنگی زانایان ئەو ناوانە حەرامن.

بەڵام ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیه وسلم لە جەنگی ئوحددا فەرموی: **(أَنَا النَّبِيّ لا أَكْذِب أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ)** واتە من پێغەمبەری خوام و درۆ ناکەم من نەوەی عەبدول موتتەلیبم, ئەوە وەك ئیبن قەیم دەڵێت: تەنها بۆ ئەوە بوو کە هەواڵ بدات بەو ناوەی کە کەسی تر ناوی لەو جۆرەی نەبووە, تا باوەڕی پێ بکەن,

---

[1] - صحيح البخاري: ٥٨٨/١٠ , ومسام: ١٢١/١٤-١٢٢, مشكاة المصابيح: ٣/ ٤٧٥٥.

[2] - قال الشيخ الألباني : صحيح, صحيح سنن أبوداود : ٢٩٠/٤برقم:٤٩٥٨.

[3] - قال الشيخ الألباني : صحيح, صحيح سنن أبن ماجة: ٢/ ١٢٢٩.

بۆ ئینشا نەبووە, بە تایبەتی لە کاتی ئەو جەنگە ناخۆشەدا, هاوەڵان لەبەردەم پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ناوی هۆزەکانیان دەبرد وەك هۆزی (عبد مناف, عبد شمس, عبد الدار), پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەی نەدەکردن.

پوختەی قسە ئەوەیە بۆ هەواڵ دروستە بەڵام بۆ ئینشا دروست نیە.

لە کۆتایدا پێویستە لەسەر پەروەردەکار دووربکەوێتەوە لە ناوی خۆشەویستی و خۆ شوبهاندنن وەك: هەیام, هەیفا, سەوسەن, نەریمان, غادە, ئەحلام و, وێنەی ئەوانە, بۆچی؟ لەبەر ئەوەی نەتەوەی ئیسلام جیابکرێتەوە لە گەلانی تر بە کەسێتی خۆی, ئەو ناوانە دەبنە هۆی نەمانی کیان و ئیعتیبار, ونکردنی کەسایەتی.. رۆژێك نەتەوەی ئیسلام گەیشتە ئەو ئاستە نزمەو هەڵوەشایەوەو پچڕ پچڕ بوو, ئەو کاتە بۆ هەموو دوژمنێکی داگیرکەر ئاسانە زەویەکەی زەوت بکا, دەسەڵاتدارەکانی سەرشۆڕو ریسوا دەکا, وەك چۆن ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبیبینین کە ئێمەی موسڵمان حاڵمان چۆنە وە هیچ گۆڕان و توانایەك نیە مەگەر بە خوای گەورەوە.

بەلاتەوە سەیر نەبێ چەندە پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم سور بووە لەسەر ئەوەی کە ئومەتی ئیسلام ناوی پێغەمبەران و عبدالله و عبدالرحمن و وێنەی ئەوانە بنێن لە منداڵەکانیان, تاکو نەتەوەی موحەممەد جیابکرێتەوە لە گەلانی تر, لە هەموو روویەکی ژیانەوە بۆ ئەوەی بە هەمیشەیی چاکترین و باشترین گەلێك بن بۆ خەڵك هێنرا بێتنە بوون, هیدایەت دەری مرۆڤایەتی بن بۆ نورو روناکی و حەق و راستی بیروباوەڕی ئیسلام.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(تَسَمَّوْا بِأَسْمَاءِ الْأَنْبِيَاءِ وَأَحَبُّ الْأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ وَأَصْدَقُهَا حَارِثٌ وَهَمَّامٌ وَأَقْبَحُهَا حَرْبٌ وَمُرَّةُ)**[1]. واتە: ناوی پێغەمبەران بگرنەوە, خۆشەویسترین ناو لای خوای گەورە ناوی عبدالله و عبدول رەحمانە, راسترین ناویش حارس و هومامە, ناشیرین ترین ناویش ناوی جەنگ و ناوی تاڵە.

---

[1] - قال الشيخ الألباني : صحيح, صحيح سنن أبوداود : ٢٨٧/٤ برقم: ٤٩٥٠.

**٣- سوننەتە نازناوی چاك بۆ منداڵ دابنرێ و باوكی بەو ناوەوە بانگ بكرێ:**

لەو دروشم و بنەما پەروەردەییانەی كە ئیسلام دایناوە بۆ پەروەردەی منداڵی تازە لە دایك بوو ئەوەیە كە نازناوی چاك بۆ منداڵ دابنرێ و باوكی بەو ناوەوە بناسرێ و بانگ بكرێ, ئەو نازناوەش كاریگەری باشی دەبێ بۆسەر دەروون, سودێكی پەروەردەیی چاك و گەورەی دەبێت وەك ئەمانەی لای خوارەوە :

- گەشەكردنی هەست و نەستی رێزو رەسەنیە لە دەروونی منداڵدا وەك شاعیر دەڵێ:

**أكنّيه حين أناديه لأكرمه**

**ولا ألقّبه والسوءة اللقب.**

- گەشەسەندنی كەسایەتی كۆمەڵایەتیەو, منداڵ هەست بەوە دەكات كە گەیشتۆتە پلەی گەورەكان و, تەمەنی رێز لێگیراوان.

- راهێنانی منداڵە لەسەر ئەدەبی گفت و گۆكردن و دواندن لەگەڵ گەورەكان و ئەوانەشی لە خۆی منداڵ ترن.

هەر لەبەر ئەو سودە بەرزانەو, ئەو ئیعتیباراتە گەورانە بووە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نازناوی داناوە بۆ منداڵان و بەو ناوەشەوە بانگی كردوون, بۆ ئەوەی ببێتە رێنمایی بۆ پەروەردەكاران و, لەسەر ئەو رێبازە هەنگاو هەڵگرن, نازناو دابنێن بۆ منداڵەكانیان و, بەو نازناوەشەوە بانگیان بكەن.

* ئەنەسی كوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ فەرموی: پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم خاوەنی جوانترین رەوشتی بەرز بوو, برایەكی بچوكم هەبوو پێیان دەوت(**أبو عُمَيْرٍ**) باڵندەیەكی بچوكی هەبوو یاری پێدەكرد ناوی (**النُّغَيْرُ**) بوو, پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەمەبەستی گاڵتەكردن لەگەڵیدا بانگی دەكرد: (**يا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟**)[1]. واتە: ئەی ئەبو عومەیر باڵندە بچوكەكە چیكرد ؟.

دروستە نازناو دانان بۆ هەمو كەسێك با منداڵیشی بەو ناوەوە نەبێ.. ئەوەتە

---

[1] - متفق عليه, مشكاة المصابيح: ٣/٤٨٨٤.

ئەبوبەکر رەزای خوای لێ بێ کە کوڕی نەبووە ناوی بەکر بێ کەچی نازناوی ئەبوبەکرە, عومەری کوڕی خەتابیش بەناوی ئەبو حەفص کە منداڵشی بەو ناوەوە نەبووە, **(أبوذر)** هیچ منداڵێکی بەو ناوەوە نەبووە کەچی نازناوی **(أبوذر)** بووە, هەروەها خالیدی کوڕی وەلید هیچ منداڵێکی بەو ناوەوە نەبووە کەچی نازناوی ئەبو سولەیمان بووە.. وێنەی ئەمانە کە ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن.

پوختەی قسە لەسەر ئەوەی رابورد ئەوەیە: نازناو بۆ منداڵ شتێکی چاکە هەروەها بۆ گەورەکانیش, با منداڵیشیان نەبێت بەو ناوەوە.

هەندێ حاڵەت پەیوەندی هەیە بە ناونان و نازناوەوە کە ئەمانەی لای خوارەوەن:

أ- ئەگەر باوك و دایك رێك نەکەوتن لەسەر ناوێك بۆ منالەکەیان ئەوە لەو کاتەدا بێگومان هەقی باوکە ناوێکی چاك بنێ لە منالەکەیان, بە بەلگەی ئەو فەرمودانەی کە لەپێشەوە باسکران.

قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا رایگەیاندووە کە منداڵ بەناوی باوکیەوە بانگ بکرێ نەك بەناوی دایکیەوە, پێی بلێین فلانی کوڕی فلان: ﴿**ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ..**﴾. **الأحزاب:٥.** واتە: بەناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن, ئەوە راسترە بەلای خواوە..

* ئەنەسی کوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(وُلِدَ لِي اللَّيْلَةَ غُلَامٌ فَسَمَّيْتُهُ بِاسْمِ أَبِي إِبْرَاهِيمَ)**[1]. واتە: ئەمشەو کوڕێکمان بوو, بەناوی باوکمەوە ناوم نا ئیبرهیم.

ب- دروست نیە بۆ باوك یان هەر کەسێکی تر نازناوی ناپەسەند و خراپ بنێ لە منداڵ وەك: کوێر, کەڕو لاڵ, کورتە بالا, قالۆنچەو, وێنەی ئەوانە.. بە گشتی ئەم ئایەتە کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە ناوو ناتۆرەی خراب و ناشیرین لەیەکتر بنێن: ﴿**وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ..**﴾. **الحجرات: ١١.**

نازناوی ناپەسەند و خراپکاریگەری گەورەی خراپی هەیە لەسەر لادانی منداڵ لە

[1]- صحيح البخاري: ٥٨٧/٩, ومسلم: ٥٩٦٩.

رووی دەروونی و کۆمەڵایەتیەوە, بەویستی خوا لە باسی (بەرپرسیاریێتی پەروەردەی دەروونی)دا بەدریێژی باسی دەکەین.

ج- ئایا نازناوی ئەبو قاسم دروستە؟:

زانایانی ئیسلام یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ناوی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بنرێت لە منداڵان, بە بەڵگە ئەم فەرموودەیە کە جابر ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوەو فەرمویەتی: پیاوێك لە ئێمە کوڕێکی بوو ناوی نا موحەممەد, کەس و کارەکەی پێیان وت: ڕێگەت پێنادەین بەناوی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم ناوی بنێی, ئەویش منداڵەکەی دا بە کۆڵێداو بردی بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و پێی وت: ئەم منداڵەم ناو ناوە موحەممەد, بەڵام کەس و کارەکەم پێم دەڵێن: لێ ناگەڕێین بەناوی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم ناوی بنێی, پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم فەرموی: (**تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلَا تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي فَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ أَقْسِمُ بَيْنَكُمْ**)[١]. واتە: بەناوی منەوە منداڵ ناوبنێن, بەڵام کونیەو نازناوی من دامەنێن, چونکە من (قاسم)و دابەشکەری نێوانتانم.

بەڵام کونیەو نازناوی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دانان بۆ منداڵان شەرعزان و پێشەوا تێکۆشەرەکان ڕایان لەسەری جیاوازە, چەند وتەیەکیان هەیە لەسەری لەوانە:

یەکەم: کەراهەتی هەیەو هەرگیزاو هەرگیز باش نیە نازناوی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دانان بۆ منداڵان, بەڵگەشیان ئەو فەرمودەیە کە ئێستا باسمانکرد, وە ئەم فەرمودەیەش کە ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلَا تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي**)[٢]. واتە: بەناوی منەوە منداڵ ناوبنێن, بەڵام کونیەو نازناوی من دامەنێن. ئیمام شافیعی ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ ئەم ڕایەی پەسندکردووە.

دووەم: (موستەحەب) شتێکی باشە بەڵگەشیان ئەم فەرمودەیە کە عائیشە ڕەزای

---

[1] - صحيح : متفق عليه, مشكاة المصابيح: ٤٨٨٤/٣.

[2] - صحيح : متفق عليه, مشكاة المصابيح: ٤٨٨٤/٣.

خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوەو فەرمویەتی: ئافرەتێ هات بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! من منداڵێکم بووە ناوم ناوە موحەممەد, کونیەو نازناوی ئەبا قاسمم بۆ داناوە کەچی پێم گەیشتووە کە تۆ پێت ناخۆشە, فەرموی: (**مَا الَّذِي أَحَلَّ اسْمِي وَحَرَّمَ كُنْيَتِي أَوْ مَا الَّذِي حَرَّمَ كُنْيَتِي وَأَحَلَّ اسْمِي**)[١]. واتە: ئەوە کێیە ناوەکەم حەڵاڵ دەکاو, نازناوەکەم حەرام دەکا لەسەر خەڵك؟.

* ئیبن ئەبی شەیبە گوتی: موحەممەدی کوڕی حەسەن لە ئەبو عەوانەوە ئەویش لە موغیرەوە ئەویش لە ئیبراهیمەوە گێڕاویەتیەوەو فەرمویەتی: موحەممەدی کوڕی(**الأشعث**)ی خوشکەزای عائیشە کونیەو نازناوەکەی ئەبا قاسم بووە [٢].

زوهری گێڕاویەتیەوەو فەرمویەتی: ئەوەی من بیزانم چوار کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناویان موحەممەد بووەو کونیەو نازناوەکەشیان ئەبا قاسم بووە: (**محمد بن طلحة بن عبد الله، ومحمد بن أبي بكر، ومحمد بن علي بن أبي طالب، ومحمد بن سعد بن أبي وقاص**) [٣].

پرسیاریان کرد لە ئیمام مالیك دەربارەی ئەو کەسانەی ناویان موحەممەدەو کونیەو نازناوەکەشیان ئەبا قاسمە؟ ئەویش وەڵامی دایەوەو فەرموی: قەدەغەنەکراوەو هیچ شتێکی تێدا نیە.

ئەو زانایانەی دەڵێن دروستەو ئەمە رایانە دەڵێن: ئەو فەرموودانەی ناو و نازناوی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم قەدەغەکردووە هەڵوەشاونەتەوە کاریان پێ ناکرێ.

سێیەم: ئەو زانایانەی دەڵێن کونیەو نازناوی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دروست نیە کۆبکرێتەوە لە یەك کاتدا, بەڵام تەنها یەکێکیان دروستە بەڵگەشیان ئەم فەرمودەیە کە جابر رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوەو فەرمویەتی: (**مَنْ تَسَمَّى بِاسْمِي**

---

1 - رواه أبي داود: ٤٣١٧, قال الشيخ الألباني : ضعيف, ضعيف سنن أبي داود: ٢٩٢/٤ برقم: ٤٩٦٨.
2 - رواه ابن أبي شيبة.
3 - رواه ابن أبي خيثمة.

**فَلَا يَتَكَنَّى بِكُنْيَتِي وَمَنْ تَكَنَّى بِكُنْيَتِي فَلَا يَتَسَمَّى بِاسْمِي)** [١]. ئەوەی ناوی من دەگرێتەوە با نازناوی من لە خۆی نەنێ, ئەوەی نازناوی من دەگرێتەوە با ناوی من لەخۆی نەنێ.

* عبد الرحمن لە ئەبی عەمرەوە ئەویش لە مامیەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(لا تجمعوا بین اسمي وکنیتي)** [٢]. واتە: لە یەك کاتدا ناو و نازناوی من پێکەوە کۆمەکەنەوە.

* موحەممەدی کوڕی تەڵحە کوڕێکیان بوو هێنای بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوتی: ناوی موحەممەدە, کونیەو نازناوەکەی ئەبا قاسمە, پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(لا تجمعها له, هو أبو سلیمان)** [٣]. واتە: لە یەك کاتدا ناوو نازناوی من پێکەوە کۆمەکەرەوە, ئەوە ئەبو سولەیمانە.

چوارەم: هەندێ لە زانایان دەڵێن: قەدەغەکردنی نازناوی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تایبەت بووە بە ژیانی خۆیەوە, بەڵام دوای وەفاتی ئاساییەو هیچی تێدا نیە.

ئەمانەش بەڵگەیان ئەم فەرمودەیە کە موحەممەدی کوڕی حەنەفیە ئەویش لە عەلی دەیگێڕێتەوە کە مۆڵەتی لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەرگرت ئەگەر لەدوای ئەو کوڕێکی بوو بەناوی ئەوەوە ناوی بنێ و هەمان نازناوی لێ بنێت؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مۆڵەتی پێدا [٤].

(حمید کوڕی زنجویە) لە کتێبی**(الأدب)**دا دەڵێ: پرسیارم لە ئیبن أبی وەیس کرد مالیك چی دەوت دەربارەی ئەو کەسەی لە یەك کاتدا ناو و نازناوی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەگرێتەوە؟ ئەویش ئاماژەی کرد بۆ پیاوێکی بەتەمەن کە لە کۆڕەکەدا دانیشتبوو فەرموی: ئەوە موحەممەدی کوڕی مالیکە باوکی ناوی ناوە موحەممەدو کونیکەشی ئەبا قاسمە.

---

1 - رواه أبي داود في سننه: ٤٣١٥.

2 - رواه ابن أبي شيبة: ٧٠/٢ برقم: ٥٢٧.

3 - رواه ابن أبي خيثمة.

4 - رواه أبي داود في سننه: ٤٣١٦, وأبو يعلى.

ئیمام مالیك فەرموی: ئەو قەدەغەکردنە لە کاتێکدا بووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ژیاندا بوو, بەڵام لە دوای وەفاتی دروستە.

لەوانەیە وتەی چوارەم( راجح) بەهێز بێت بە بەڵگەی ئەو فەرمودانەی پێشەوە, وتەکەی ئیمام مالیك کە خۆشی هەمان رای هەیە.

هەر لەبەر ئەمانە دروستە ناوو نازناوی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بنرێ لە منداڵ, ئەو فەرمودانەی قەدەغەی دەکەن تایبەتن بە ژیانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چونکە ناوی ئەو کەسە تێکەڵ دەبوو لەگەڵ ناوی ئەودا, بەڵام لە دوای وەفاتی ئاساییەو هیچی تێدا نیە.

ئەوەی پشتگیری ئەم رایە دەکات ئەو فەرمودەیەیە کە زوهری گێراویەتیەوەو فەرمویەتی: ئەوەی من بیزانم چوار کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناویان موحەممەد بووەو کونیەو نازناوەکەشیان ئەبا قاسم بووە. خواش دەیزانێ.

لەدوای ئەم باسەوە ئیتر هیچ نەماوەتەوە بۆ پەروەردەکاران و دایك و باوك تەنها ئەوەندە نەبێ بەرنامەو رێگای راست و دروست بگرنەبەر بۆ ناونانی منداڵەکانیان و, دووربکەونەوە لەو ناوانەی کە دەبنە هۆی بێ رێزی و روشاندنی کەرامەت و شکاندنی کەسێتی و هورەی بەرزیان.. هەروەها لەسەریانە شوێن بەرنامەکەی پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم بکەون و ئەو بکەنە سەرمەشقی خۆیان, نازناوێك دابنێن بۆ منداڵەکانیان دڵیان پێی خۆشبێ و هەست بە کەسێتی خۆیان بکەن, رۆحی خۆشەویستی و برایەتی و ئیحتیرام لە دەروونیاندا گەشەبکا, وە هەتا رابێن لەسەر ئەدەب و رەوشتی جوان لەبەرامبەر ئەو کەسانەی لە دەورو بەریاندا دەژین و تیکەڵاوی و هاورێیەتیان دەکەن.

چەند چاك و بەجێیە بۆمان کە دەسبگرین بەو بنەما پەروەردەییە چاکەوە, لەسەر بیروباوەڕی ئەو بەرنامە گەورەی ئیسلام بڕۆین, ئەگەر بمانەوێ بۆ خۆمان و گەلەکەمان شکۆمەندی فەوتاوو, کیانی گەورە بگەڕێنینەوە, ئەوەش لای خوای گەورە ئاسانە, ئەگەر ئێمە دڵسۆز بین بۆ ئیسلام و وەك شەرع و بەرنامەو پەروەردە پەیوەست پێوەی بین.

## باسی سێیەم: ئەحکامەکانی گوێزەبانەی منداڵ

**١ - گوێزەبانە(العقیقە)مانای چییە؟**

گوێزەبانە(العقیقە) لە زمانەوەنیدا: بەمانای بڕین دێت. شاعیر دەڵێت:

**بلاد بها عقّ الشباب تمائمي**

**وأول أرضٍ مسَّ جلدي ترابها.**

گوێزەبانە(العقیقە) لە زاراوەی شەرعیدا: بەو مەڕو بزنە دەوترێ لە ڕۆژی حەوتەمی لەدایك بوونی منداڵدا سەردەبڕێن.

**٢ - بەڵگە شەرعیەکانی گوێزەبانە:**

فەرموودەی زۆر هەیە دەربارەی سوننەت و مەشروعیەتی گوێزەبانە لەوانە:

* سەلمانی کوڕی عەمار ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمویەتی: **(مَعَ الْغُلَامِ عَقِيقَةٌ فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا وَأَمِيطُوا عَنْهُ الْأَذَى)**[1]. واتە: کوڕ گوێزەبانەی هەیە دەبێ خوێنێك بڕێژن و سەریشی بتاشن.

* سەمورە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمویەتی: **(كُل غُلَامُ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ يُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ وَيُسَمَّى وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ)**[2]. واتە: هەموو منداڵێکی تازە لەدایك بوو گەردن بەندی ئەو گوێزەبانەیە کە لەڕۆژی حەوتەمی تەمەنیدا بۆی سەردەبڕێ, هەر لەو ڕۆژەشدا ناو دەنرێ و سەریشی دەتاشرێ.

* عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمویەتی: **(عَنْ الْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ وَعَنْ الْجَارِيَةِ شَاةٌ)**[3]. واتە: بۆ کوڕ دوو مەڕی وەك یەك سەر ببڕن و بۆ کچیش یەك مەڕ.

---

[1] - صحيح رواه البخاري: ١٢١/١٧ برقم: ٥٠٤٩, مشكاة المصابيح: ٤١٤٩/٢.

[2] - رواه أصحاب السنن, وصححه الألباني في صحيح الجامع : ٢٥٦٣, جامع الترمذي: ١٠١/٤ برقم ١٥٢٢.

[3] - رواه الإمام أحمد وقال الشيخ الألباني صحيح, جامع الترمذي: ٩٦/٤ برقم١٥١٣.

* ئوم کورزی کەعبیە رەزای خوای لیٚ بیٚ لە بارەی گویٚزەبانەوە(عقیقە) پرسیاری لە پیٚغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم کرد ئەویش لەوەلاٚمدا فەرمووی: **(عَنْ الْغُلَامِ شَاتَانِ وَعَنْ الْجَارِيَةِ شَاةٌ لَا يَضُرُّكُمْ أَذُكْرَانًا كُنَّ أَمْ إِنَاثًا)** [1]. واتە: بۆ کورِ دوو مەرِ ، بۆ کچ یەك مەرِ ، مەرِەکە نیٚر بیٚ یان میٚ گرنگ نیەو وەك یەکە.

* حەسەن لە سەمورەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیٚریٚتەوەو دەلیٚ: پیٚغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمویەتی: **(كُل غُلَامُ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِه وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ وَيُسَمَّى)** [2]. واتە: هەموو کورِیٚك بەندە بە گویٚزەبانە کەیەوە، لە رِۆژی حەوتەمی دا گویٚزەبانەکەی بۆ سەر دەبرِیٚ و ناویشی لیٚ دەنریٚ ، سەریش دەتاشریٚ .

**٣- راو بۆچوونی شەرعزان و زانایان لەبارەی مەشروعیەتی گویٚزەبانەوە:**

یەکەم: هەندیٚك لە شەرعزان و پیٚشەوا تیٚکۆشەرەکان رایان وایە گویٚزەبانە سوننەتیٚکی پیٚغەمبەری خوایە صلی اللە علیە وسلم و موستەحەبە لەوانە: ئیمام مالیك, خەلٚکی مەدینە, ئیمام شافیعی و هاوەلاٚنی, ئیمام ئەحمەد, ئیمام ئیسحاق, ئیمام **(أبو ثور)**، کۆمەلیٚکی زۆر لە فوقەهاو زانایان و پیٚشەوا تیٚکۆشەرەکان, بەلٚگەشیان ئەو فەرموودانەیە کە پیٚشتر باسمانکردن, رای ئەوانەیان رەتکردۆتەوە کە دەلیٚن واجبە بە چەند وتەیەك:

- ئەگەر واجب بوایە بەئاشکرا لە ئاییندا واجب دەبوو, ئەگەر پیٚویست بوایە پیٚغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم روونی دەکردەوە بەتەواوی و, بەهانەی بۆ کەس نەدەهیٚشتەوە وەك واجبەکانی تر.

- پیٚغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمانی گویٚزەبانەی بەستۆتەوە بە خۆشەویستی ئەو کەسەوە بۆ گویٚزەبانە, پیٚغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم دەفەرمویٚت: **(مَنْ وُلد لَه ولَد فأحب أن يُنسك عَنه فَلَيَفْعَل)** [3]. واتە: هەرکەسیٚك کورِیٚکی بوو حەزیکرد گویٚزەبانەی بۆ بکا با بۆی بکات.

1- رواه الإمام أحمد وقال الشيخ الألباني صحيح , صحيح سنن أبوداود: ١٠٥/٣برقم: ٢٨٣٥.

2- رواه ابو داود: ٣ /٢٦٠، والترمذى: ١٠١/٤، وابن ماجة: ٢/, ١٠٥٦, وقال الشيخ الألباني: صحيح, صحيح النسائى : ١٦٦/٧ برقم: ٣٦٦٥،.

3- قال الشيخ الألباني صحيح في سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٢١٣/٤ برقم: ١٦٥٥.

بوو حەزیکرد گوێزەبانەی بۆ بکا با بۆی بکات.

- ئەو کارەی پێغەمبەر بەڵگە نیە بۆ واجب بوون بەڵکو بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە شتێکی چاك و موستەحەبە.

دووەم: هەندێ لە زانایان وەکو شێخ حەسەنی بەصری و **(لیث)**ی کوڕی سەعد پێیان وایە کە گوێزەبانە بۆ منداڵ واجبە و دەبێ بکرێ بەڵگەشیان ئەو فەرمودەیە کە بورەیدەو ئیسحاقی کوری راهویە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(أنّ الناس يُعرضون يوم القيامة على العقيقة كما يُعرضون على الصلوات الخمس)** واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵك دەهێننە سەر گوێزەبانەکەیان، هەروەکو چۆن دەیان هێننە سەر پێنج نوێژەکانیان.

هەروەها بەڵگەیان ئەو فەرمودە بوو کە حەسەن لە سەمورەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(كُل غُلَامُ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ)**. واتە: هەموو منداڵێك ڕادەگیرێ بە گوێزەبانەکەیەوە، مەبەست ئەوەیە کە منداڵ ناتوانێ تکا بکات بۆ دایك و باوکی هەتا گوێزەبانەی بۆ نەکرێ ، ئەمەش واجب بوون نیشان دەدا.

سێیەم: ئەوانەی رایان وایە سوننەت نیە, ئەوانە شەرعزانە حەنەفیەکانن.

بەڵگەیان ئەم فەرموودەیە کە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە گێڕاویەتیەوەو گوتویەتی: پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرد دەربارەی گوێزەبانە, ئەویش فەرموی: **(لا أُحِبُ العقوق)**[1]. واتە: من گوێزەبانەم خۆشناوێت.

هەروەها بەڵگەیان ئەم فەرموودەیە ئەبو رافع رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوەو فەرمویەتی: فاتمەی کچی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ویستی دوو مەڕ سەربڕێ بۆ حەسەنی کوڕی, پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: **(لَا تَعُقِّي عَنْهُ وَلَكِنْ احْلِقِي شَعْرَ رَأْسِهِ ثُمَّ تَصَدَّقِي بِوَزْنِهِ مِنْ الْوَرِقِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ وُلِدَ حُسَيْنٌ بَعْدَ ذَلِكَ**

[1] - رواه البيهقي: ٩/٣٠٠.

**فَصَنَعَتْ مِثْلَ ذَلِكَ)**[1]. واتە: سەریان مەبڕە, بەڵام سەری بتاشەو بەقەد کێشانەی مووەکە زیو بکە بەخێر, کاتێك حسەینیشی بوو بەهەمان شێوەی کرد.

ئەم فەرمووودەیە ئەوە دەگەیەنێ کە گوێزەبانە سوننەتێکی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم و موستەحەبە, کۆمەڵی شەرعزانەکان و زۆربەی خاوەن زانیاری و پێشەوا تێکۆشەرەکان رایان لەسەر ئەوەیە.

بێگومان ئەو فەرمودانەی کە فوقەها حەنەفیەکان کردویانە بە بەڵگە بەهێز نین و مەشروعیەتی گوێزەبانە رەتناکەنەوە, ئەو فەرمودەیە کە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە گێڕاویەتیەوەو گوتویەتی: پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرد دەربارەی گوێزەبانە, ئەویش فەرموی: **(لا أُحِبُ العقوق)** من گوێزەبانەم خۆشناوێت. دەری دەخات کە گوێزەبانە سوننەت و موستەحەبە, چونکە مەبەستی بەکارهێنانی وشەی **(العقیقة)** بووە لە جیاتی سەربڕین.

پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرد, وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر یەکێ لە ئێمە منداڵی بوو گوێزەبانەی بۆ بکا؟ فەرموی: **(مَنْ وُلِد له ولد فأحب أن يُنسك عنه فليفعل, عَنْ الْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ وَعَنْ الْجَارِيَةِ شَاةٌ)**[2]. واتە: هەرکەسێك لە ئێوە منداڵی بوو حەزیکرد گوێزەبانەی بۆ بکا با بۆی بکات, بۆ کوڕ دوو مەڕی وەك یەك سەر ببڕێ و بۆ کچیش یەك مەڕ.

هەروەها ئەو فەرموودەیەی ئەبو رافع گێڕاویەتیەوەو فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە فاتمەی کچی فەرموو: **(لَا تَعُقِّي عَنْهُ وَلَكِنْ احْلِقِي شَعْرَ رَأْسِهِ..)**[3]. واتە: گوێزەبانەی بۆ مەکە, بەڵام سەری بتاشە.. لەبەر ئەوە بوو خۆی پێشتر گوێزەبانەی بۆ حەسەن کردبوو, ئەوەی زیاتر دڵنیامان دەکاتەوە ئەوەیە کە فەرمودەی زۆر لەو بارەوە هاتووە:

---

1- رواه الإمام أحمد: ١١٧/٥٥ برقم: ٢٥٩٤١ .

2- قال الشيخ الألباني صحيح في سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٢١٣/٤ برقم: ١٦٥٥.

3- رواه الإمام أحمد: ١١٧/٥٥ برقم: ٢٥٩٤١ .

* ئەبو داود لە ئیبن عەباسەوە رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێڕێتەوە: **(أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَقَّ عَنْ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ كَبْشًا كَبْشًا)** [1]. واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گوێزەبانەی کرد بۆ حەسەن و حوسەین هەریەکەی بەرانێك.

* قەتادە لە ئەنەسەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕێتەوە: **(انّ النبي صلي الله عليه وسلم عَقَّ عَنْ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ كَبْشَين)** [2]. واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دوو بەرانی کرد بە گوێزەبانە بۆ حەسەن و حوسەین.

* عائیشە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕێتەوە : **(عَقّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ يَوْمَ السَّابِع)** [3]. واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گوێزەبانەی کرد بۆ حەسەن و حوسەین لە رۆژی حەوتەمی تەمەنیاندا

پالفتەی قسە ئەوەیە: گوێزەبانەکردن بۆ منداڵ چ کوڕبیٚ یان کچ سوننەتێکی چاك و باشە بەلای تێکڕای پێشەوایان و شەرع زانەکانەوە، کەوابوو پێویستە لەسەر باوك کە خوا منداڵی پیٚ بەخشی، ئەگەر توانای هەبوو ئەو سوننەتەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم زیندوو بکاتەوە, تاکو فەزڵ و پاداشتی گەورەی لەلای خوا دەست بکەویٚ, وە تا خۆشەویستی و هۆگری و پەیوەندییەکانی نێوان خزم و کەسوکارو دراوسیٚ و دۆستان زیاتر و بەهێزتر بیٚ, لەکاتێکدا ئامادەی ئەو گوێزەبانەیە دەبن, بەخۆشی و شادی هاتنە دنیای ئەو کۆرپە تازە لە دایك بووە, بۆ بەدیهاتنی هاوبەرپرسێتی کۆمەڵایەتی و, بەوەی کە هەنیٚ لە هەژارو نەدارەکان سوود لە گۆشتی ئەو گوێزەبانە وەردەگرن.

ئیسلام چەندە گەورەیە, دروشم و بنەماکانی شەریعەتەکەی چەند بەرزە لە چاندنی رێزو خۆشەویستی و برایەتی لە کۆمەڵگەدا, وە لە بونیاتنانی دادپەروەری کۆمەڵایەتیدا لەناو چینە هەژارو نەدارو بیٚ بەشەکاندا.

---

[1] - رواه أبوداود في السنن ب٣ ل٢٦١ ، رقم ٢٨٤١ ، و رواة النسائي في السنن ب٧ ل ١٦٥ـ ١٦٦. و صححه عبدالحق و ابن دقيق العيد، كماذكره ابن حجر في تلخيص الجير ب٤ ل١٤٧.

[2] - صحيح رواه أبن الجرير, وقال الشيخ الألباني صحيح , صحيح سنن النسائي: ١٦٥/٧ برقم:٤٢١٩.

[3] - رواه يحيى بن سعيد.

**٤ - کاتی گوێزەبانەکردن:**

لە پێشەوە باسی فەرمودەکەی سەمورەمان کرد: **((کُل غُلَامُ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِه وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ وَيُسَمَّى)**[1]. واتە: هەموو کوڕێك بەندە بە گوێزەبانەکەیەوە، لە ڕۆژی حەوتەمی دا گوێزەبانەکەی بۆ سەر دەبڕێ و ناویشی لێ دەنرێ.

ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باشتر وایە لە رۆژی حەوتەمدا گوێزەبانە بکرێت, ئەوەی زیاتر دڵنیامان دەکاتەوە فەرمودەکەی عائیشەیە: **(عَقّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ يَوْمَ السَّابِعِ, وسَماهُما , وَأَمَر أن يماط عَن رؤوسِهمَا الأذى)**[2]. واتە: پێغەمبەری خۆشەویست صلى الله عليه وسلم گوێزەبانەی کرد بۆ حەسەن و حوسەین لە رۆژی حەوتەمی تەمەنیانداو, ناوی لێنان و, فەرمانیشی کرد سەریان بتاشن.

لێرەدا چەند قسەیەکی زانایان هەیە ئەوە دەگەیەنن کەوا پابەند بوون بە ڕۆژی حەوتەمەوە بۆ گوێزەبانە کردن بەشێوەیەکی حەتمی واجب نیە چونکە ئەگەر لەڕۆژی حەوتەمدا گوێزەبانە نەکرا بەڵکو لەڕۆژی چوارەمدا بوو یان لەڕۆژی هەشتەمی دا بوو یان لەڕۆژی دەیەمی دا بوو یان ڕۆژێکی دیکە بوو ئەوە گوێزەبانەکە هەر دروستەو ئەوەش دیاردەترینی ئەو فەرموودانەیە:

- **(الميموني)** دەڵێ: گوتم بە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە چ کاتێکدا گوێزەبانە بۆ منداڵ دەکرێ، ئەویش فەرموی : عائشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمویەتی: رۆژی حەوتەی منداڵەکە یان ڕۆژی چواردەی یان ڕۆژی بیست و یەکی.

- صاڵحی کوڕی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرمویەتی: باوکم فەرموی: گوێزەبانە دروستە بکرێ جا لەڕۆژی حەوتەمی لە دایك بوونی منالْدا, ئەگەر نەکرا دەتوانن لەڕۆژی چواردەهەمدا بیکەن, ئەگەر بۆیان نەکرا با لەڕۆژی بیست و یەکدا گوێزەبانەی بۆی بکەن.

---

[1] - رواه ابو داود: ٣ /٢٦٠، والترمذي: ١٠١/٤، وابن ماجة: ٢/, ١٠٥٦, وقال الشيخ الألباني: صحيح, صحيح النسائي : ١٦٦/٧ برقم: ٣٦٦٥،.

[2] - رواه عبدالله بن وهب , و حاكم في مستدرك عن الصحيحين: ٤٤٧/١٧ برقم: ٧٦٩٥.

- ئیمام مالك فەرمویەتی: گوێزەبانە کردن لە ڕۆژی حەوتەم دا و پاپەند بوون پێیەوە شتێکی باشە(مستجب)ە ئەگینا ئەگەر لەڕۆژی چوارەمدا یان لە هەشتەمدا یان لە دەیەمدا یان دواتر گوێزەبانەکە بکرێ هەر دروستە.

- قسەی بەهێز (راجح): قسەی بەهێز لێرەدا ئەوەیە : گوێزەبانەکە لەڕۆژی حەوتەی منداڵەکەدا سوننەتە و شتێکی باشە چونکە ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم، ئەگەر باوك لەم ڕۆژەدا بۆی بکرێ و بیکا ئەوە بەڕاستی زۆر شتێکی چاکە و پیرۆزە، ئەگەر بۆی نەکرا بیکا ئەوە لە هەر ڕۆژێکی تردا بیکا هەر دروستە وەکو ئیمام مایلك ڕەحمەتی خوای لێ بێ فەرموی.

کەواتە کاتی گوێزەبانەکردن زۆر فراوانە، لە سەربڕینی مەڕو بزنەکەدا ئاسان کاری هەیە وەکو قورئان فەرمویەتی: ﴿**يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ**﴾. **البقرة: ١٨٥.** واتە : خوا ئاسانی دەوێ بۆ ئێوە, وە گرانی ناوێت بۆتان..

هەروەها فەرمویەتی: ﴿**وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ..** ﴾. **الحج: ٧٨** . واتە: لە ئاییندا هیچ کارێکی قورس و گرانی لەسەر دانەناون..

**٥- ئایا گوێزەبانە بۆ کچ و کوڕ وەك یەکە:**

وەك لە پێشەوە باسمان کرد کە گوێزەبانە(عقیقە) سوننەتێکی باشەو پیرۆزە بۆ کوڕ و بۆ کچ بەیەکسانی ئەمەش راو بۆچوونی تێکڕای ئەهلی عیلم و شەرعزان و پێشەوا تێکۆشەرەکانە, سوننەتێکی باشەو بۆ کچ و کوڕ دەبێ وەك یەك بێ, لەبەر ئەو فەرمودەی ئوم کورزی کەعبیە رەزای خوای لێ بێ لە بارەی گوێزەبانەوە(عقیقە) پرسیاری لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کرد ئەویش لەوەڵامدا فەرموی: (**عَنْ الْغُلَامِ شَاتَانِ وَعَنْ الْجَارِيَةِ شَاةٌ لَا يَضُرُّكُمْ أَذُكْرَانًا كُنَّ أَمْ إِنَاثًا**)[1]. واتە: بۆ کوڕ دوو مەڕ ، بۆ کچ یەك مەڕ ، مەڕەکە نێر بێ یان مێ گرنگ نیەو وەك یەکە.

وە هەم لەبەر ئەو فەرمودەیەی کەئیبن ئەبی شەیبە لە عائیشەوە دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: (**أَمَرَنا رسولُ الله صلي الله عليه وسلم أن نعقّ عَنْ الْغُلَامِ بشَاتَين، وَعَنْ**

[1] - رواه الإمام أحمد وقال الشيخ الألباني صحيح , صحيح سنن أبوداود: ١٠٥/٣برقم: ٢٨٣٥.

**الْجَارِيَةِ بشَاة).** واته: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، فەرمانی پێکردین بۆ کوڕ دوو مەڕ بکەینە گوێزەبانە و بۆ کچ یەك مەڕ، هەم لەبەر ئەو فەرمودانەی تر کە لە پێشەوە باسکران و هێنانمانەوە بە بەڵگە بۆ مەشروعیەتی گوێزەبانە پێویست ناکا دووبارەیان بکەینەوە.

ئەم فەرمودانە دوو شتیان لێ وەردەگیرێ:

یەکەم: ئەوەیە کە کوڕ و کچ وەکو یەك وان لەوەدا گوێزەبانە بۆ هەردووکیان ڕەوایە و سونەتێکی پیرۆزی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم.

دووەم: ئەوەیە کە گوێزەبانەی کوڕ لە گوێزەبانەی کچ زیاترە، وە ئەمەش ڕاو بۆچوونی ئیبن عەباس و عائیشەو کۆمەڵێك لە ئەهلی عیلم و فەرموودەیە.

بەڵام ڕاو بۆچوونی ئیمام مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەوەیە کە گوێزەبانەی کوڕ و کچ وەکو یەك وایەو هیچ جیاوازیان نیە، لە کاتێکدا پرسیار کرا لە ئیمام مالیك و گوتیان : بۆ کوڕ و کچ چەند مەڕ و بزن سەر ببڕین، ئیمام مالیك لەوەڵامدا فەرموی: بۆ کوڕ یەك سەرو بۆ کچیش هەر یەك سەر ، واتە کوڕ و کچ جیاوازیان نیە و بۆ هەریەکێکیان یەك مەڕ یان یەك بزن سەردەبڕێت. ئەو ئیمامە بەڕێزە ئەم فەرمودە پیرۆزانەی بە بەڵگە هێناوەتەوە کە کوڕو کچ لە گوێزەبانەدا جیاوازیان نیە.

* ئەبو داود لە ئیبن عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕێتەوە: **(أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَقَّ عَنْ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ كَبْشًا كَبْشًا)** [1]. واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گوێزەبانەی کرد بۆ حەسەن و حوسەین هەریەکەی بەرانێك.

* جەعفەری کوڕی موحەممەد لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە فاتمەی کچی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ هەر یەکە حسن و حسین هەر یەکەیان مەڕێکی بۆ سەر بڕین.

* ئیمام مالیك فەرمویەتی: عبداللە ی کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە کە فاتمەی کچی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گوێزەبانەی کرد بۆ حەسەن و حوسەین و بۆ

[1] - رواه أبوداود في السنن ب٣ ل٢٦١ ، رقم ٢٨٤١ ، و رواة النسائي في السنن ب٧ ل ١٦٥ـ ١٦٦. و صححه عبدالحق و ابن دقيق العيد، كماذكره ابن حجر في تلخيص الجير ب٤ ل١٤٧.

هەریەکەیان مەڕێکی سەربڕی.

پاڵفتەی قسە: پاڵفتەی قسە لێرەدا ئەوەیە: ئەو دایك و باوکەی کە خوای پەروەردگار ژیانێکی خۆش و باشی پێداون و توانایان هەیە ئەوە بۆ کوڕ دوو سەر بکا بە گوێزەبانە بۆ کچیش یەك سەر, چونکە چەسپاوە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم, بەڵام ئەو دایك و باوکەی کە خوای پەروەردگار ژیانێکی مامناوەندی پێداوە و توانای زۆر باشی نیە ئەوە بابۆ کوڕ و کچ هەریەکەیان یەك سەر بکا بە گوێزەبانە، ئەگەر دایکان و باوکان بەم شێوەی کە باسمانکرد کاریان کرد ئەوە بەڕاستی هەم پاداشتی باشیان دەست دەکەوێ، وە هەم کاریان بە سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کردووە, خوا بۆ خۆی دەیزانێت.

ڕەتکردنەوەی ئەو ڕەخنەیەی کە هەندێ ڕەخنەگر دەیڵێن: بۆ ئیسلام جیاوازی دەکات لە نێوان کچ و کوڕدا ؟ ئەو ڕەخنەیە لە چەند ڕوویەکەوە دەدرێتەدواوە:

١ - پێویستە موسڵمان ملکەچی فەرمان و بڕیارەکانی خوای گەورە بێ, بۆ سەلماندن و بەدیهێنانی ئەم ئایەتە: ﴿**فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً**﴾. **النساء٦٥.** واتە: سوێد بەپەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوەو دووبەرەکیەکی نێوانیاندا, لە پاشان هەست نەکەن لە دەروونیاندا بەهیچ بێزاریەك لەو بڕیارەی تۆ داوتە, وە ملکەچ نەکەن بە ملکەچیەکی تەواو. چەسپاوە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە دەبێ موسڵمان ملکەچ بێ و پەیڕەوکار بێ.

٢ - ڕەنگە ئەو جیاوازیە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پیاو خوای گەورە هێزیکی زیاتری بەخشیوە بە جەستەی پیاو, حەقی سەرپەرشتیاری و بەرپرسێتی خێزانی لەسەرە, وە هەست و سۆزی تایبەتمەند کردووە, خوای گەورە راستی فەرمووە: ﴿**الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ ..**﴾.**النساء٣٤.**
واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ئافرەتانەوە بەهۆی ئەوەوە خوا باوی هەندێکیانی داوە بەسەر هەندێکیاندا, هەروەها بەهۆی ئەوەوە کە پیاوان لە سامانەکانیان خەرج دەکەن..

٣- بۆ چاندنی سۆزو خۆشەویستی و برایەتیە لە دڵی ئەو کەسانەدا کە کۆدەبنەوە بۆ گوێزەبانەکە, پاشان بەهێزکردنی رۆحی هاوبەرپرسیاری کۆمەڵایەتیە لە نێوان چینەکانی خێزانە بێ بەشەو هەژارەکاندا.

**٦- شکاندنی ئێسقانی گوێزەبانە ناپەسەندە (مکروه).**

یەکێك لەو کارانەی دەبێت گرنگی پێ بدرێ ئەوەیە نابێ بەهیچ شێوەیەك ئێسقانی گوێزەبانەی منداڵ بشکێندرێ بەڵکو گۆشتەکەی ئەندام ئەندام لێی دەکرێتەوە بەبێ ئەوە کە ئێسقانەکەی بشکێ.

بە بەڵگەی ئەو فەرمودەیەی کە ئەبو داود لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەو گوێزەبانەدا کە فاتمە بۆ حەسەن و حوسێنی کرد فەرموی: **(أن ابْعثوا الى القابِلة منها برِجْلٍ، وكلُوا وأطِعموا ولا تكسرُوا منها عظماً)** [1]. واتە: لەو گوێزەبانە قاچێکی بۆ مامانەکە بنێرن، خۆتان لێی بخۆن و بیشیدەن بە خەڵك، بەڵام نەکەن ئێسقانی بشکێنن.

عەتای کوڕی ئەبو رەباح و ئیبن جورەیج و عائیشە رەزای خوایان لێ بێ هەرسێکیان فەرمویانە: گۆشتی گوێزەبانە ئەندام ئەندام لێی دەکرێتەوە ئێسقانی ناشکێنرێ, ئەمەش دوو حیکمەتی تێدایە:

یەکەم: دەرخستنی رێزو گەورەیی میوانداری و بەخشینی گۆشتی ئەو گوێزەبانەیە لە دەروونی دراوسێ و هەژارەکاندا, بەوەی ئەو پارچە گۆشتەی بەتەواوی دەدرێتێ و ئیسقانەکەی ناشکێنرێ و هیچی لێ کەم ناکرێتەوە, گومانی تێدا نیە ئەمەش هەڵوێستێکی بەرزو گەورەیە لەبەشی بەخشندەیی و رێزدا لە دەروونی ئەو کەسەدا کە گۆشتەکەی پێ دەبەخشرێ.

دووەم: گەشبینیە بەرامبەر بەهێزی و ساغ و سەلامەتی ئەندامەکانی جەستەی منداڵ, بۆ ئەوەی ئەو گوێزەبانەیە جێگای قوربانی بگرێتەوە بۆ منداڵەکە, خوا خۆی دەیزانێ.

---

[1] - ابو داود في(كتاب المراسيل) ص ٢٧٨ ورجالة ثقات رجال الشيخين، واخرجة البيهقى في السنن الكبرىب٩ ل٣٠٢ .

**٧- ئەو ئەحکامە گشتیانەی پەیوەندیان هەیە بەگوێزەبانەوە:**

ئەمانەی لای خوارەوە چەند ئەحکامێکی گشتین دەبێ چاودێری بکرێن:

أ- زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەو ئاژەڵەی بۆ قوربانی دروست نیە بۆ گوێزەبانەش دروست نیە, ئەوەی بۆ قوربانی دروستە بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە[1]:

١- ئەو مەڕو بزنەی کە سەردەبڕێ دەبێ ساڵێکی تەواو کرد بێ و پێی نابێتە ساڵی دووەمی تەمەنیەوە, ئەگەر مەڕ گەورەو قەڵەو بوو تەمەنی گەیشتە شەش مانگ ئەوە دروستە, بەمەرجێ ئەگەر کرایە ناو چەند مەڕێکی تەمەن یەك ساڵەوە جیانەکرێتەوە لەناویاندا, بەڵام بۆ بزن دروست نیە, لە هەموو حاڵەتێکدا تا نەگاتە تەمەنی یەك ساڵی و بەرەو سەرتر.

٢- پێویستە ئەو قوربانیەی کە سەردەبڕێ بەدوور بێ لە هەموو عەیب و کەموکوڕیەك, هەر لەبەر ئەوەیە کە دروست نیە ئاژەڵی کوێرو نەخۆش و لەڕو لاواز و شەلی تەواو بکرێتە قوربانی و گوێزەبانە, هەروەها دروست نیە گوێ و کلکی بڕابێ یان هەر ئەندامێکی تری کە زیاتر لە سێیەکی بڕابێ, هەروەها دروست نیە زۆربەی ددانەکانی کەوتبن, گوێی هەر لە زگماکیەوە نەبێ, ئەوەندە شێت نەبێ شێتیەکەی ببێتە رێگر لەوەی بچێت لەگەڵ راندا.

بەڵام جگە لەو عەیبانە دروستە, وەك ئەوەی گوێی کونی تێدا بێ یان قڵیشاو بێ, یا شاخەکانی شکا بێ, یاخود توشی شەلیەك بووبێ بتوانێ بچێت بەڕێوە بە ئاساییی و, شێتیەکەی نەبێتە رێگر لەوەی بچێت لەگەڵ ئاژەڵەکانی تردا, هەندێ لە دانەکانی کەوتبێ, بەڵام زۆربەیان مابن و نەکەوتبن, هەروەها کەمتر لە سێیەکی کلك و گوێی بڕابێ, زاپاتر لە سێیەکی کلك و گوێی مابێ, ئەمانە هەموو نابنە رێگری گوێزەبانەو قوربانی.

٣- مانگاو گامێش تا نەگەنە تەمەنی دوو ساڵی بەرەو سەرتر دروست نیە بکرێنە گوێزەبانەو قوربانی, بەڵام حوشتر دەبێ بگاتە تەمەنی پێنج ساڵی و بەرەو سەرترو پێ بخاتە تەمەنی شەش ساڵیەوە ئەوسا دروستە.

---

[1]- ئەم ئەحکامانە بەپێی مەزهەبی ئیمام ئەبو حەنیفەیە.

ب- دروست نیە یەك گوێزەبانە بۆ چەند منداڵێك، بۆ نمونە دروست نیە حوشترێك بكرێتە گوێزەبانە بۆ حەوت منداڵ, چونكە ئەگەر دروست بێ مەبەستی خوێن رشتنی ئاژەڵەكە بۆ گوێزەبانەی منداڵ نایەتەدی, هەروەها نابێتە هۆی كڕینەوەی منداڵەكە كەواتە هاوبەشی تێیدا دروست نیە و نابێ .

ج- زانایان تێكڕا بەلایانەوە دروستە حوشتر و مانگاو مەڕ بكرێتە گوێزەبانە, بەمەرجێ دەبێ ئەو حوشترە یان ئەو مانگایە بۆ یەك نەفەر بێ و بۆ زیاتر دروست نیە و نابێ. بە بەڵگەی ئەوەی ئیبن قەیم دەگێڕێتەوە كە ئەنەسی كوڕی مالیك حوشترێكی بۆ منداڵێكی كردووە بە گوێزەبانە.. هەروا(أبوبكرە) بۆ عبدالرحمن كوڕی خۆی حوشترێكی سەر بڕی و كردی بە خواردن بۆ خەڵكی شاری بصرە..

هەندێ لە ئەهلی عیلم دەڵێن تەنها مەڕ نەبێ هیچ ئاژەڵێكی تر دروست نیە بۆ گوێزەبانە بە بەڵگەی ئەو فەرمودانەی كە هاتوون. بەڵام بەڵگە لەسەر ئەوەی مانگاو حوشتر دروستە ئەو فەرمودەیە كە **(ابن المنذر)** گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(مَعَ الْغُلَامِ عَقِيقَةٌ فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا..)** [١]. واتە: كوڕ گوێزەبانەی هەیە و خوێنێكی بۆ بڕێژن, ئەوەتە لێرەدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمان دەكا بە خوێنێك، كەوا بوو هەر ئاژەلێكی دیكە جگە لەمەڕ بكرێتە گوێزەبانەی منداڵ ئەوە دروستە و گرفتی نیە، ئیتر ئەو سەربڕاوە مەڕبێ یان مانگا بێ یا حوشتر.

د- گۆشتی گوێزەبانە وەكو گۆشتی قوربانی وایە لە خواردن و هەڵگرتن و كردنە دیاری و كردنە خێردا. كەوابوو دروستە خاوەنەكەی لێی بخوا و لێی هەڵبگرێ و بیكا بە خێر و صەدەقە و دیاری، وەكو گۆشتی قوربانی، تەنها گوێزەبانە ئەوەی زیاترە لە قوربانی كە سوننەتە بەشێكی لێ بدرێ بەمامانی منداڵەكە تاكو خۆشحاڵ بێ بەو دیاریە لەبەر ئەو فەرمودە پیرۆزەی كە بەیهەقی لە ئیمامی عەلیەوە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی بە فاتمەی كچی كرد و فەرموی: **( زِني شعر الحسين، و تصدّقي بوزنه فضةً وأعطى القابلة رِجْل العقيقة)** [٢] . واتە: مووی سەری

---

[1]- صحيح رواه البخاري: ١٢١/١٧ برقم: ٥٠٤٩, مشكاة المصابيح: ٤١٤٩/٢.

[٢] في السنن الكبرى ب٩ ل٣٠٤ ، و الحاكم ب٣ل ١٧٩ ، وقال صحيح الاسناد ، و تعقبة الذهبي ب (لا)،

حوسەین بکێشەو کێشانەکەی بە زیو بکە بەخێر, قاچی گوێزەبانەکە بدە بە مامانەکەی.

ئەگەر کەسێك ویستی گوێزەبانەکە بکا بەنان و چێشت و کێی خۆش ویست بانگی بکا ئەوە هیچ خراپەی تێدا نیە و زۆرێك لە زانایان ڕێگەیان داوە, چونکە ئەم کارە بەم شێوەیە باڵی خۆشەویستی وهۆگری و برایەتی لەناو کۆمەڵگەی موسڵمانانداو, هاوڕێ و دراوسێکاندا بلاودەکاتەوە.. ئەمەش کارێکە ئایینی ئیسلام زۆر سوورە لەسەری بۆ یەکپارچەیی ریزەکانی خەڵك تاکو خەڵکەکە وەکو چینی دیوار یەکتر بگرن و یەکتر بەهێز بکەن.

هـ- سوننەتە گوێزەبانەکە بە ناوی منداڵەکەوە سەر ببڕێ:

* **(ابن المنذر)** لە عائشەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(اذبَحوا على إِسمِهِ ، فقولوا، بسم الله اللهم لك و اليك، هذه عقيقة فلانٍ )**[1]. واتە: لەسەر ناوی منداڵەکە ئاژەڵەکە سەر ببڕن و بڵێن: بەناوی خواوە ، خوایە بۆ تۆیە و بۆلای تۆیە، ئەوە گوێزەبانەی فلانە کەسە، ئەگەر ئەو کەسەی کە گوێزەبانەکە دەکا هەر ناوی گوێزەبانەی هێنا و ناوی منداڵەکەی نەهێنا ئەوە هەر دروستە ئەو گوێزەبانەیە و مەبەستەکەش دێتە دی.

**٨- حیکمەت و سوودەکانی گوێزەبانە:**

ئەوەندە بەسە کە گوێزەبانە ئەم حیکمەتانەی هەیە:

- قوربانیەکە منداڵ لە خواوە نزیك دەکاتەوە, لە یەکەم ساتی ژیانیدا.

- هەڵوەشانەوەی بارمتەگیری کۆرپەی تازە لەدایك بووە تا تکا بکات بۆ دایك و باوکی.

- دەربڕینی خۆشی و شادیە بەزۆر بوونی نەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەویش پێی خۆشە نەوەکانی ژمارەیان زۆرتر بێ لە نەوەکانی تر.

---

و ضعفه الالباني في ضعيف الجامع رقم ٣١٧٥.

[1]- اوردة صاحب كنز العمال ب ١٦ ل ٤٣٤ ، رقم ٤٥٢٩٧ .

- رزگارکردنی منداڵه له بەڵاو ناخۆشیەکانی هەروەك چۆن خوای گەورە ئیسماعیل پێغەمبەری رزگارکرد سلاّوی خوای لەسەر بێ.

- جۆریکە لەجۆرەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی, خۆشەویستی دەخاتە نێوان تاکەکانی کۆمەڵەوە, بە کۆبوونەوەیان لەسەر سفرەی نان خواردن و خۆشی دەربڕین بەهاتنە دنیای کۆرپەی تازە بوو.

- یەکێکە لە سەرچاوەکانی هاوبەرپرسییێتی کۆمەڵایەتی و, هاتنەدی بنەمای دادپەروەری کۆمەڵایەتی بۆ ئوممەتی ئیسلام, سڕینەوەی دیاردەی هەژاری و بێ بەشی و نەداریە, جگە لەمانەش چەندەها سوودو حیکمەتی تری هەیە.

بەم بۆنەیەوە پێم چاکە ئەی خوێنەری بەڕێز ناوی ئەو خواردنانە بزانیت کە ئیسلام دایناوە لە بۆنەو رۆژە تایبەتیەکاندا, ئەمانەش ناوی هەندێ لەو خواردەمەنیانەن:

١- **(القِرى)**: واتە خواردنی میوان.

٢- **(التُحْفة)**: واتە خواردنی ئەو کەسانەی سەردان دەکەن.

٣- **(الخُرْس)**: واتە خواردنی منداڵ لەدایك بوون غەیری گوێزەبانە .

٤- **(المأدُبة)**: واتە خواردنی خەڵك بانگ کردن (دعوە) .

٥- **(الوليمة)**: واتە خواردنی ژنهێنان و ژن گواستنەوە و شایی کردن .

٦- **(العقيقة)**: واتە سەربڕینی مەڕ و بزن لە ڕۆژی سەرتاشینی منداڵدا و لەڕۆژی حەوتەی منداڵەکەدا.

٧- **(الغديرة)**: واتە خواردن بەبۆنەی منداڵ خەتەنەکردنەوە .

٨- **(الوضيمة)**: واتە خواردنی کاتی پرسەو ماتەمینە.

٩- **(النقيعة)**: خواردنی هاتنەوە لەسەفەر.

١٠- **(الوكيرة)**: واتە دروستکردنی خواردن بەبۆنەی دروستکردنی خانوو بەرەوە .

## باسی چوارەم: ئەحکامەکانی خەتەنەکردن (الختان):

**١- مانای خەتەنەکردن لە زمانەوانی و لەزاراوەی شەریعەتدا:**

مانای خەتەنەکردن لە زمانەوانیدا: بریتیە لە بڕینی قوڵفە یان ئەو پێستەی کە بەسەری زەکەرەوەیە.

خەتەنەکردن لە زاراوەی شەریعەتدا: بەو پێستە دەڵێن کە دەوری خوارەوەی ئالەتی نێرینەی داوە و دەبڕدرێ و ئەحکامی شەرعی لەسەر تەرتیب دەبێ, هەروەك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: **(إِذَا الْتَقَى الْخِتَانَانِ فقد وجب الغسل)** [1]. واتە: ئەگەر شوێنی خەتەنەکردنی ژن و پیاو بەیەك گەیشتن ئەوا خۆشتن واجب دەبێت.

* لە ریوایەتێکی تردا فەرمویەتی: **(إِذَا الْتَقَى الْخِتَانَانِ وغابت الحشفة فقد وجب الغسل, أنزل أو لم ينزل)** [2]. واتە: ئەگەر شوێنی خەتەنەکردنی ژن و پیاو بەیەك گەیشتن ئەوا خۆشتن واجب دەبێت, ئیتر ئاویان بێتەوە یان نەیەتەوە.

**٢- ئەو فەرمودانەی دەبنە بەڵگەی (مشروعيه) ڕەوایەتی خەتەنەکردن:**

ئەو فەرمودانەی دەبنە بەڵگەی ڕەوایەتی خەتەنەکردن زۆرن بەڵام بەکورتی ئەمانەی لای خوارەوە چەند بەڵگەیەکن:

* ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا لە عەماری کوڕی یاسرەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **( مِن الفِطرَة: الْمَضْمَضَةَ، وَالإِسْتِنْشَاقُ ، قَصُّ الشَّارِبِ ، وَالسِّوَاكُ، و تقليم الْأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ ، وَالِاسْتِحْدَادُ ، والإختتان)** [3]. واتە: ئەمانە لە ڕێبازی پێغەمبەرانن سڵاوی خوایان لێ بێ: ئاو لەدەم و ددان وەردان، ئاو لە لووت وەردان، بەرسمێڵ کردن، سیواك کردن،

---

[1] - رواه الطبراني في الأوسط: ١٠/٢٠١ برقم: ٤٦٤٧, صحيح أنظر سلسلة الأحاديث صحيحة:١٢٦١.

[2] - رواه الطبراني في الأوسط:١٥ /٣٩٩ برقم: ٧٣٢٣ , تحقيق الألباني: (صحيح) انظر حديث رقم: ٣٨٥ في صحيح الجامع.

[3] - مسند امام احمد ب٤ ل٢٦٤ و اخرجة ابوداود ب١ ل٤٥ وابن ماجة ب١ ل١٠٧.

نینۆك كردن، شۆرینی لۆیچ و پێچەكان، دەرهێنانی مووی بن باڵ ، بەرتاشین، خەتەنەكردن.

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمویەتی: (الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الْخِتَانُ وَالِاسْتِحْدَادُ وَنَتْفُ الْإِبْطِ وَتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ وَقَصُّ الشَّارِبِ)[1]. واتە: ئەم پێنجە لە فیترەت و رێبازی پێغەمبەرانن سلاوی خوایان لێ بێ: خەتەنەكردن, بەرتاشین, دەرهێنانی مووی بن باڵ , نینۆككردن, بەرسمێڵ كردن.

**٣- ئایا خەتەنەكردن واجبە یان سوننەتە؟**

لەبارەی خەتەنەكردنی منداڵەوە زانایانی شەرع ڕاو بۆچوونی جیا جیایان هەیە لەسەر ئەوەی كە ئایا خەتەنەكردن واجبە یان سوننەتە؟

ئیمام ابو حنیفەو شێخ حەسەنی بەصری و هەندێ لەزانایانی تر فەرمویانە: خەتەنەكردن سوننەتە واجب نیە بەڵگەشیان ئەمانەیە كە باسیان دەكەین.

ئیمام ئەحمەد لە شەدادی كوڕی ئەوسەوە رەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم دەگێڕێتـــەوە كە فەرمویەتی: (الْخِتَانُ سُنَّةٌ لِلرِّجَالِ مَكْرُمَةٌ لِلنِّسَاءِ) [2]. واتە: خەتەنەكردن بۆ پیاوان سوننەتە و بۆ ژنان ڕێزە .

ئەو زانا بەڕێزانە بەڵگەیەكی تریان ئەوەیە كە پێغەمبەری خۆشەویست صلی الله علیە وسلم خەتەنەكردنی لەگەڵ بەرسمێڵ كردن و نینۆك كردن و بن هەنگڵ كردندا باسكردووە كە ئەمانەش هەموویان سوننەتن واجب نین، دیارە خەتەنەكردنیش هەر سوننەتە واجب نیە.

هەروەها بەڵگەیەكی تریان ئەوەیە شێخ حەسەنی بەصری گوتویەتی: خەڵكی ڕەش و سپی و ڕۆمی و فارس و حەبەشی لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیە وسلم موسڵمان دەبوون لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم هیچ كەس لەو

---

[1] - متفق علیه: صحیح البخاري:٥٦/٧, ومسلم: ٢٢٢/١ .

[2] - ضعیف رواه إمام أحمد في المسند: ٧٥/٥, سلسلة الأحادیث الضعیفة: ٤٠٧/٤ برقم: ١٩٣٥, .

خەڵکەی نەپشکنیوە تا بزانێ ئایا ئەو خەڵکە خەتەنەکراون یان نا, خۆ ئەگەر خەتەنەکردن واجب بوایە ئەوە هەتا خەڵکەکە خەتەنە نەکرانایە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم موسڵمان بوونەکەیانی وەرنەدەگرت، بەڵام ئاشکرایە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هیچ کەسی نەپشکنیوە کەوابوو خەتەنەکردن واجب نیە.

ئەوانەی دەڵێن خەتەنەکردن واجبە ئەمانەن: ئیمام شەعبی و, ڕەبیعەو، ئەوزاعی و، یحیای کوڕی سەعدی ئەنصاری و، ئیمام مالیك و ئیمامی شافعی و ئیمامی ئەحمەد ئەمانە هەموویان فەرمویانە خەتەنەکردن واجبە، بەتایبەت ئیمام مالیك لەبارەی خەتەنەکردنەوە زۆر توند بووە هەتا گوتویەتی: هەرکەس خەتەنەی نەکردبێ پێش نوێژی دروست نیە و شایەتیشی لێ وەرناگیرێ, ئەم زانا بەڕێزانە بەڵگەیان هێناوەتەوە بەکورتی ئەمانەی لای خوارەوە چەند بەڵگەیەکیانن:

أ- ئیمام ئەحمد و ئەبو داود لە **(عثیم)**ی کوڕی کلیب لە باوکی لە باپیریەوە دەگێڕنەوە کە باپیری هاتووە بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و گوتی: من مسوڵمان بووم پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: **(أَلْقِ عَنْكَ شَعْرَ الْكُفْرِ وَاخْتَتِنْ)**[1]. واتە: سەرت بتاشە و خەتەنەش بکە.

ب- حەرب لە زوهریەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(مَنْ اَسْلم فليختتنْ وان كان كبيراً)**. واتە: هەر کەسێك موسڵمان بوو خەتەنە بکات با تەمەنیشی گەورەبێ. ئەم فەرمودە هەرچەندە فەرمودەیەکی لاوازە(مرسله) بەڵام بۆ پشتگیری دەگونجێ و باشە.

ج- ئیبن عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمویەتی: کەسێك کە خەتەنە نەکرابێ نوێژەکانی لێ وەرناگیرێ و سەربڕاویشی ناخورێ.

د- بەیهەقی لە موسای کوڕی ئیسماعیلەوە ئەویش لە ئیمام عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕێتەوە: لەناو صەحیفەکەی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوسرا بوو: **(انّ الأقْلَف لا يُترك في الإسلام حَتى يَختَتن)**. واتە: خەتەنە نەکراو لە ئیسلامدا هەتا خەتەنە نەکا وازی لێ ناهێنرێ.

---

[1] -سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٦/ ١١٨٠ برقم: ٢٩٧٧.

هـ- پێشەوا خەتتابی دەڵێ: ئەگەر چی خەتەنەکردن لە کۆی سوننەتەکاندا باسکراوە, بەڵام لای زۆربەی زانایان واجبە چونکە دروشمێکی ئاییینیە, بەهۆی ئەوەشەوە موسڵمان لە کافر جیادەکرێتەوە, ئەگەر لەناو کوژراوانی گۆڕەپانی جەنگدا خەتەنەکراو دۆزرایەوە نوێژی لەسەر دەکرێ و لە گۆڕستانی موسڵماناندا دەنێژرێ.

و- ئەو زاناو شەرعزانانەی کە ڕایان وایە خەتەنەکردن واجبە بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوەو دەڵێن: خەتەنە نەکراو چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێ کە نوێژ و دەست نوێژەکەی بەتاڵ ببێتەوە، چونکە ئەو پێستەی هەموو عەورەتی پیاو دادەپۆشێ و بەئاسانی پاك نابێتەوە لە پاشماوەی میزەکەی, لەبەر ئەوە دروستبوونی نوێژو دەسنوێژو خۆشتن لەسەر خەتەنەکردن وەستاوە، لەبەر ئەوەیە کە زۆرێك لە زانایانی پێشین و دوایین قەدەغەیان کردووە کە خەتەنە نەکراو پێش نوێژی بۆ خەڵك بکا, بەڵام نوێژەکەی خۆی دروستە چونکە بەخاوەن عوزر دادەنرێ، وەکو ئینسانی خاوەن میزە چرکە وایەو نوێژەکەی خۆی دروستە.

ز- خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿**ثم أوحَيْنا اليك أنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ ابراهيمَ حنيفاً..**﴾. **النحل: ١٢٣.** واتە: پاشان نیگامان بۆ کردی کە پەیڕەوی ئایینی ئیبراهیم بکە, چونکە پاك و ڕاست بوو..

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و نەتەوەکەی فەرمانیان پێکراوە کە شوێنی بەرنامەو شەریعەتی ئیبراهیم بکەون, بێگومان خەتەنەکردنیش لەبەرنامە و شەریعەتی ئیبراهیم بووە ئەوەی بەڵگەیە لەسەری ئەم فەرمودەیە کە ئیمام بوخاری و موسلیم لە ئەبوهریرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە: (**اخْتَتَنَ إِبْرَاهِيمُ النَّبِيُّ عَلَيْهِ السَّلَام وَهُوَ ابْنُ ثَمَانِينَ سَنَةً**)[1]. واتە: ئیبراهیم سڵاوی خوای لەسەر بێ لەتەمەنی هەشتاساڵیدا خەتەنەکرا. لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: ئیبراهیم سڵاوی خوای لەسەر بێ یەکەم کەس بووە کە میوانداری کردووە, وە یەکەم کەس بووە شەرواڵی لەبەرکردووە, یەکەم کەسیش بووە خەتەنەکراوە, لەدوای ئەو خەتەنەکردن لای شوێنکەوتوانی و پەیامبەران مایەوە بە بەردەوامی تا هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

[1] - متفق عليه: صحيح البخاري:٦٢٨٩/١١, ومسلم:٣١٨.

* ئەبو ئەیوب گێڕاویوتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(أَرْبَعٌ مِنْ سُنَنِ الْمُرْسَلِينَ الْحَيَاءُ وَالتَّعَطُّرُ وَالسِّوَاكُ وَالنِّكَاحُ)** [1]. واتە: چوار خەسڵەت هەیە لەسوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرانن سلاوی خوایان لەسەر بێ: خەتەنەکردن, بۆن لەخۆدان, سیواك کردن و دەم پاك کردنەوە, ژن هێنان.

ئەم فەرموودانە ئاشکراترین بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خەتەنەکردن واجبە بۆ منداڵ, بەڵام ئەوانەی بەڵگەی ئەوانە ڕەتدەکەنەوە کە دەڵێن خەتەنەکردن سوننەتە, بەم بەڵگانەی لای خوارەوەیە:

* ئەو فەرمودەی دەیکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خەتەنەکردن سوننەتە: **(الْخِتَانُ سُنَّةٌ لِلرِّجَالِ مَكْرُمَةٌ لِلنِّسَاءِ)** [2]. واتە: خەتەنەکردن بۆ پیاوان سوننەتە و بۆ ژنان ڕێزە. زانایانی فەرمودەناس دەڵێن: ئەم فەرمودەیە لە رووی سەنەدەوە لاوازە, وەك ئاشکرایە لای شەرعزانەکان فەرمودەی لاواز نابێتە بەڵگە بۆ هەڵهێنجانی ئەحکامی شەرعی.

ئەگەر فەرموودەکەش راست بێ ئەوە هەر ئەوە دەگەیەنێ کە خەتەنەکردن بۆ ئافرەتان سوننەتەو ریزە نەك واجب بێ کەوابوو مانای وایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەتەنەکردنی بە سوننەت داناوەو فەرمانی پێکردووە کەواتە واجبە, سوننەتیش واتە ریگاو بەرنامە, دەڵێن: ئەو سوننەتەم بۆ دانا واتە ریگەو بەرنامەم بۆ دانا, ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(الْخِتَانُ سُنَّةٌ لِلرِّجَالِ..)**. واتە: خەتەنەکردن رەوایە بۆیان.

* ئەو فەرمودەی دەیکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خەتەنەکردن سوننەتە ئەوەی گوایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەتەنەکردنی خستۆتە ریزی سوننەتەکانی تر وەك نینۆك کردن, کەوابوو سوننەتە وەك سوننەتەکانی تر, ئەوە راست نیە, چونکە ئەو سوننەتانە هەیانە واجبە وەك ئاو لەدەم و لوت وەردان لە کاتی دەستنوێژدا, یان

---

[1] - جامع الترمذی ب٣ ل ٣٩١ رقم ١٠٨٠ وقال الترمذی هذا حديثٌ حسن غريب .ومسند الامام احمد ب٥ ل ٤٢١.

[2] - ضعيف رواه إمام أحمد في المسند: ٧٥/٥, سلسلة الأحاديث الضعيفة: ٤٠٧/٤ برقم: ١٩٣٥, .

هەیانە شتێکی باشە وەك سیواك کردن, بەڵام نینۆك کردن هەرچەندە سوننەتە بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا واجبە چونکە چڵك و پیسی لەژێریاندا کۆدەبێتەوەو کەڵەکەدەبێ کەواتە لابردنی دەبێتە هۆی دروستی پاك و خاوێنی, هەروەها ئەو فەرمودەیە کە کردویانە بەبەڵگە خەسڵەتەکانی تێاندایە واجبە, هەشیانە سوننەت و موستەحەبە.

* ئەو بەڵگەیەشیان کە گوایە شێخ حەسەنی بەصری گوتویەتی: خەڵکی ڕەش و سپی و ڕۆمی و فارس و حەبەشی لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم موسڵمان دەبوون لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هیچ کەس لەو خەڵکەی نەپشکنیوە تا بزانێ ئایا ئەو خەڵکە خەتەنەکراون یان نا, وەڵامەکەی ئەوەیە: عەرەب و جولەکەکان هەموویان خەتەنەیان دەکرد پێشتر, تەنها دەمێنێتەوە گاورەکان ئەوانیش دوو دەستە بوون دەستەیەکیان خەتەنەیان دەکرد, بەڵام دەستەیەکیان خەتەنەیان نەدەکرد, بێگومان ئەو کەسانەی دەهاتن بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و موسڵمان دەبوون عەرەب بوون یان جولەکە بوون, یا گاور, ئەوانەی دەهاتنە ناو ئیسلامەوە جگە لەوانیش هەموویان دەیانزانی کە دروشمی ئیسلام خەتەنەکردنە, لەبەر ئەوە دوای ئەوەی دەهاتنە ناو ئیسلامەوە دەسپێشکەریان بۆ خەتەنەکردن دەکرد وەك چۆن دەسپێشکەریان بۆ خۆشتن دەکرد.

ئەو فەرمودەیەی کە ئیبن قەیم گێڕاویەتیەوە پشتگیری ئەم رایە دەکات کە دەڵێ: خەڵك لەدوای ئەوەی دەهاتنە ناو ئیسلامەوە دەسپێشکەریان بۆ خەتەنەکردن دەکرد وەك چۆن دەسپێشکەریان بۆ خۆشتن دەکرد, ئەویش فەرمودەکەی(**عثيم**)ە کە پێشتر باسکراوە باپیری کاتێ چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و گوتی: من موسڵمان بووم پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (**أَلْقِ عَنْكَ شَعْرَ الْكُفْرِ وَاخْتَتِنْ**). سەرت بتاشە و خەتەنەش بکە.

هەروەها فەرمودەکەی ئیمام زوهریە پێشتر باسکراوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**مَنْ أَسْلم فليختتنْ وان كان كبيراً**). واتە: هەر کەسێك موسڵمان بوو خەتەنە بکات با بەتەمەنیش بێ.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەمیشەو دایم رێنمایی نەتەوەکەی دەکرد

بۆ ئەوەی کە خێرو چاکەو بەختەوەری تێدا بوایە بۆیان, ئەوەی جیای کردنایەتەوە لە گەلانی تر, بەڵام فەرمانی پێ نەکرابوو هەستێ بە پشکنین و لێکۆڵینەوە, بەرنامەی لەوەدا ئەوە بوو موسڵمان بوونی ئاشکرایان لێ وەرگرێ و, نهێنیەکانیان بگەڕێنێتەوە بۆ لای خوای گەورە.

پوختەی قسە لەوەی رابوورد ئەوەیە: بەراستی خەتەنەکردن سەردارو سەرتۆپی خەسڵەتەکانی فیترەتی ئادەمیزادە, دروشمی ئیسلامە, ناونیشان و پێناسەی شەریعەتە.. واجبە لەسەر نێرینە.. ئەوەی کاتێ موسڵمان دەبێ دەستپێشخەری نەکاو خۆی خەتەنە نەکا ئەوە پێی گوناهبار دەبێ و, تاوانی کردووەو کەوتۆتە ناو حەرام و کاری ناپەسەندەوە, چونکە خەتەنەکردن دروشمێکە لە دروشمەکانی ئیسلام, بە خەتەنەکردن موسڵمان لە کافرو بێ باوەڕەکان جیادەکرێتەوە, دەبێتە هۆی تەندروستیەکی باش بۆ خاوەنەکەی و لە نەخۆشی کوشندە رزگاری دەبێ.. بەویستی خوا لە باسی حیکمەت و سوودەکانی خەتەنەکردندا بۆتان ڕووندەکەینەوە!!.

**٤- ئایا ئافرەت خەتەنە دەکرێ؟**

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە دەڵێین : پێشەواو زانایانی شەرعی خوا یەك دەنگن لەسەر ئەوە کە خەتەنەکردن بۆ ئافرەت سوننەتەو واجب نیە, تەنها ئیمام ئەحمەد نەبێ لە ریوایەتێکدا فەرمویەتی: خەتەنەکردن بۆ ئافرەت و پیاو واجبە, بەڵام لە ریوایەتەکەی تریدا لەگەڵ زانایاندایەو راوبۆچونی وەکو ئەوان وایەو فەرمویەتی: خەتەنەکردن هەر بۆ پیاوان واجبە، بۆ ئافرەتان سوننەتە.

بەڵگەی زانایان لەوەدا کە خەتەنەکردن تەنها بۆ پیاوان واجبە بۆ ئافرەتان سوننەتە ئەوەیە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەو کاتەوە کە یاسای خەتەنەکردنی بۆ نەوەی ئیسلام دانا تەنها پیاوانی پێیەوە تایبەت کردووە نەك ئافرەتان، ڕووی نەداوە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی بە ئافرەتێك کردبێ بەوە کە خەتەنە بکا تەنها ئەو فەرموودە نەبێ کە شدادی کوڕی ئەوس گێڕایەوە ئەویش ئەو فەرموودە بوو کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموی: **(الْخِتَانُ سُنَّةٌ لِلرِّجَالِ مَكْرُمَةٌ لِلنِّسَاءِ)** [1].

[1] - ضعيف رواه إمام أحمد في المسند: ٧٥/٥, سلسلة الأحاديث الضعيفة: ٤٠٧/٤ برقم: ١٩٣٥, .

واتە: خەتەنەکردن بۆ پیاوان سوننەتە و بۆ ژنان ڕێزە. بەڵام لەپێشەوە باسی لاوازی ئەم فەرموودەمان کرد و ئەگەر فەرمودەکەش سەحیح بێ ئەوە هەر ئەوە دەگەیەنێ کە خەتەنەکردن بۆ ئافرەتان سوننەتەو ڕێزە نەك واجب بێ چونکە وشەی (**مَكْرُمَةٌ لِلنِّسَاءِ**) ئەوە دەگەیەنێ، خوا دەیزانێ.

خەتەنەکردنی پیاوان جیاوازی هەیە لەگەڵ خەتەنەکردنی ئافرەتاندا هەم لە شێوەکەیاندا هەم لە حوکم و یاساکەیان، وە هەم لە سوودو قازانجەکەیاندا وەکو دەردەکەێ و تێبینی کراوە.

ئاگاداربن شەریعەتی ئیسلام چەندە گەورەیە, بنەما هەیشەیی و بەردەوامەکانی چەندە بەرزو بڵندن بەدرێژایی کات و ڕۆژگار!!.

**٥ - خەتەنەکردن کەی واجب دەبێ؟**

زۆرینەی ئەهلی علم لە زانایان راوبۆچونیان ئەوەیە کە خەتەنەکردن کاتێك واجب دەبێ کە منداڵەکە نزیك ببێتەوە لەکاتی باڵغ بوون کەوابوو پێش باڵغ بوونی منداڵەکە, بە ئیعتیباری ئەوەی کە موکەلەف دەبێ بۆ پەیڕەوکردنی ئەحکامی شەرعی و فەرمانەکانی خوای گەورە, تاکو منداڵەکە فامی کردەوەو گەیشتە قۆناغی تەمیز بوون خەتەنەکراو بێ, خوا پەرستیەکەی بەو شێوە راستە بێ کە خوای گەورە وێنەو نەخشەی بۆ کێشاوە, شەرعی پاکی ئیسلام روونیکردۆتەوە.

بەڵام چاکترو باشتر بۆ ئەو کەسەی کە(ولی) سەرپەرشتیاری منداڵ ئەوەیە کە هەر لەڕۆژانی یەکەمی لەدایك بوونی منداڵەکەوە هەستێ بە خەتەنەکردنی منداڵەکەی بۆ ئەوەی کاتێ منداڵەکە فامیکردەوەو گەیشتە قۆناغی تەمیز بوون خەتەنەکراوبێ, هیچ غەم و پەژارەیەکی خەتەنەکردنی نەمابێ, لە داهاتوودا هیچ حسابێکی بۆ نەکات, چەندە دڵی خۆشە ئەو منداڵ کاتێ ئەقڵی پێگەیشت و حەقیقەتی شتەکانی بۆ دەرکەوت خۆی ببینێتەوە کاتی خەتەنەکردنی تێپەڕاندووە.

بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەو فەرمودە پیرۆزەیە کە بەیهەقی لە جابری کوڕی عبدالله وە دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (**عَقّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ وخَتنهُما لِسَبعة أيام**)[1]. واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەڕۆژی

[1] - رواة البيهقى في السُنن الكبرى ب٨ ل٣٢٤ ، و اوردة الهيتمى في (مجمع الزوائد) ب٤ ل٩٥.

حەوتەی حەسەن و حوسەین دا گوێزەبانەی بۆ کردن و خەتەنەشی کردن.

**٦- حیکمەت و سوودی خەتەنەکردن چییە ؟**

خەتەنەکردن چەند نهێنی و حیکمەتی ئایینی و چەند سوودو قازانجی گەورەی تەندروستی هەیە، کە زانایان و پزیشکەکان دەریان خستوەو پەیان پێ بردووە، ئەمانەی لای خوارەوە دیارترین و گرنگترینیانن کە باسیان دەکەین :

**لە حیکمەت و سوودە ئایینیە گەورەکانی:**

- خەتەنەکردن دروشمی ئایینی ئیسلامەو سەرداری خەسڵەتەکانی فیترەتی ئینسانە.

- خەتەنەکردن تەواوکەری ئەو ئایینە پاکەیە کە لەسەر زوبانی ابراهیم پێغەمبەرەوە سەلامی خوای لێ بێ خوا ناردویەتی بۆمان، ئەو ئاینە بوو کە دڵەکانی بە یەکتا پەرستی و باوەڕەوە ڕەنگ کرد, وە ئەو ئاینە بوو کە جەستەی بە خەسڵەتەکانی فیترەت ڕەنگ کرد وەك: خەتەنەکردن, بەرسمێڵ کردن, نینۆك کردن,دەرهێنانی موی بن باڵ, خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**ثم أوحَيْنا اليك أنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ ابراهيمَ حنيفاً..** ﴾. **النحل: ١٢٣**. واتە: پاشان نیگامان بۆ کردی کە پەیڕەوی ئایینی ئیبراهیم بکە, چونکە پاك و ڕاست بوو..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**صِبْغَةَ اللّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدونَ**﴾. **البقرة١٣٨**. واتە: ئەم ئاین و بەرنامەی خوایە, کە ئێستا تۆی لەسەرە رەنگ و نەخشەیەکە, خوای کارزان بەدەستووری خۆی دایڕشتووە, دەبێ کێ لە خوا جوانتر رەنگ و نەخشە بڕێژێ؟ ئێمەیش گشتمان تەنها ئەو دەپەرستین و تەسلیمی ئەو دەبین.

- خەتەنەکردن مسوڵمان لە غەیرە مسوڵمان و لە هەموو ئەو گەلانەی کە مسوڵمان نین و خەتەنە ناکەن جیا دەکاتەوە.

- خەتەنەکردن بڕیاردانە بۆ خوا پەرستی و, پەیڕەوکاری فەرمانەکانی خواو, ملکەچیە بۆ بڕیارو دەسەڵاتی.

**قازانج و سوودە تەندروستیەکانی خەتەنەکردن:**

پاك وخاوێنی و ڕازاندنەوەو جوانکردنی دەستکردی خوایی و هاوتاکردنی ئارەزوو دەهێنێ بۆ ئینسان.

خەتەنەكردن تەگبیرێكی تەندروستی گەورەی وایە كە خاوەنەكەی لە زۆرینەی نەخۆشیەكان دەپارێزێ. دكتۆر(صەبری قەبانی لە كتێبی(حیاتنـــا الجنسیە)دا گوتویەتی: لە خەتەنەكردندا هەندێ قازانج و سوود هەیە باسیان دەكەین بەم شێوەیە:

١- بەهۆی بڕینی ئەو پێستەوە ئینسان لە رژێنە چەوریەكان رزگاری دەبێ، هەروا لە شلاوە پیوییە قێزەونەكان ئینسان رزگاری دەبێ و, ناهێڵێ تووشی بۆگەن بوون ببێ.

٢- بەبڕینی ئەو پێستەیە ئینسان لەترسناكی ئالەت هەڵئەسان لەكاتی درێژ بوونەوەیدا رزگاری دەبێ.

٣- خەتەنەكردن ئەگەری تووش بوون بە نەخۆشی سەرەتان كەم دەكاتەوە, بەڕاستی دەركەوتووە كە ئەو سەرەتانە لەو كەسانە بەزۆری روودەدات كە ئەو پێستەیان تەنكە بەڵام لەو نەتەوانەی كە ئایینەكەیان خەتەنەكردنی لەسەر داناون ئەو تووش بوونە كەمتر روودەدا.

٤- بەخەتەنەكردن دەتوانین منداڵ لە میزەچركەی شەوانە بپارێزین و دووری بخەینەوە.

٥- خەتەنەكردن دەستپەڕ لەلای كوڕە باڵغەكان كەم دەكاتەوە.. چەندەها سوودی تر..

لە دەرخستنی ئەو ئەحكامانەی لە پێشەوە باسمانكردن, هەر لەو ئەحكامانەوە كە پەیوەندیان هەبوو بە مزگێنیدانەوە تادەگاتە بانگدان بەگوێی منداڵدا, شیرینی لەناو دەم وەردانی, گوێزەبانە بۆ كردنی, سەرتاشینی, ئەحكامەكانی ناونانی, واجب بوونی خەتەنەكردنی, هەموو ئەو ئەحكامانە ئەم حەقیقەتە گرنگانە دەردەخەن بۆ پەروەردەكاران ئەیش ئەوەیە كە شەریعەتی پاك و بێگەردی ئیسلام گرنگی زۆری داوە بە كۆرپەی تازە لە دایك بوو لەو كاتەوە كە لە دایك دەبێ و هەوای نەسیمی ژیان هەڵدەمژێ.

ئەو ئەحكامە گرنگانەن تەندروستی باش بۆ منداڵ بەدەسدەهێنن, هێزی پێ دەبەخشن..لەو كاتەوە چاوی بەژیان هەڵدەهێنێ و سەیری چواردەوری خۆی دەكات, تا ئەو كاتەی لە كارو بارەكان تێدەگات, حەقیقەتی شتەكانی بۆ دەردەكەوێ و خۆی

لەناو خانەوادەیەکی موسڵماندا دەبینێتەوە کە پەیڕەوی لە ئیسلام دەکەن و کار بە فەرمان و بڕیارەکانی شەریعەت دەکەن, بێگومان ئەو کاتە ئەویش بەهەموو پابەندبوونێکەوە دەڕوات بەرەو رووی ئەوەی کە شەریعەتی پاك و بێگەرد فەرمانی پێکردووەو, پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم بەسوننەتی داناوە.

هیچ گومانی تێدا نیە کاتێك منداڵ لەو پابەندبوونانە تێگەیشت و, بۆی دەرکەوت کە پەروەردەکارەکەی چ دایك بێ یان باوك هەڵدەسن بە ئەنجامدانی ئەو هەموو ئەرك و واجباتانە, ئەو کاتە دەروونی جێگیرو دامەزراو دەبێ لەسەر ئیسلام و, پەروەردە دەبێ لەسەر ئیمان, رادێت لەسەر ئەوپەڕی مانای جوامێری و رێزداری و ئاکاری جوان و رەوشتی بەرز.

وەك لە پێشەوە باسکراو بینیت ئەوە گەورەترین و بەرزترین گرنگیدان بوو کە ئیسلام داویەتی بە منداڵ هەر لەسەرەتای هاتنە دنیایەوە تا دەگاتە ئەو کاتەی فامدەکاتەوەو لە ژیان تێدەگات, دەرك بەهەموو حەقیقەتەکان دەکات.

خوێنەری بەڕێز لە بەندەکانی داهاتوودا گرنگترینی ئەو بەرپرسیارێتیە گشتیانەتان بۆ دەخەینەڕوو کە ئیسلام واجبی کردووە لەسەر پەروەردەکاران و دایك و باوك بەرامبەر بە منداڵەکانیان, تاکو چاك بزانن چۆن شەریعەتی بەرزی بە ئیسلام گرنگیداوە بە پەروەردەی جگەرگۆشەکان و, چۆن ئامادەیان دەکات تا هەستن بەراپەڕاندنی ئەرك و بەرپرسێتیەکانیان.

بەویستی خوا دەبێتە هۆی شیفای دەردەداران و , رونکردنەوەی بەرنامەو, رووناکی رێگا.

## بەندی چوارەم: هۆکارەکانی لادانی منداڵان و چارەسەری

### پێشەکیی:

چەندە زۆرن ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی لادانی منداڵان و, بەدڕەوشتی و لە ڕێی ڕاست لادان و, پەروەردەی چەوت لەناو ئەم کۆمەڵگە خراپەدا, وە دەبنە هۆی ئەو واقعە تاڵ و ژیانە بێ ئابڕوویی و بەرەڵاییە!!

وە چەندە زۆرن ئەو خراپەو تاوانانەی چواردەوری منداڵانی داوە لە هەموو لایەکەوە, لە هەموو شوێنێکدا توشی دەبن و منداڵان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبەن بەرەو لای بەدڕەوشتی!!..

جا ئەگەر پەروەدەکاران لە ئاستی ئەو بەرپرسیارێتی و ئەمانەتەدا نەبوون, زانیاری تەواویان نەبوو بە هۆکارەکانی لادانی منداڵان, لەسەر هیدایەت و بەرچاو ڕوونی دەستیان نەگرت بە هۆکارەکانی چارەسەری و ڕێگای خۆپاراستنەوە.. ئەوا بێگومان منداڵان لەناو کۆمەڵگەدا دەبنە نەوەیەکی تیاچوو بەدبەخت, دەستەیەکی خراپەکارو تاوانبار.

ئێمە بەویستی خوای گەورە لەم بەندەدا باسی هۆکارەکانی لادانی منداڵان و, چارەسەری سەرکەوتوو بۆ ئەو لادانە ڕووندەکەینەوە, بۆ ئەوەی بزانێت ئەو کەسەی دەیەوێت فێربێ و بزانێ کە ئیسلام بەو شەریعەتە حەکیمەو, ئەو بیروباوەڕە ڕاست و دروستە هەمیشەییەی خۆیەوە, چەند بنەمایەکی داناوە بۆ دەستەبەرکردن, بەرنامەیەکی حەکیمی داناوە بۆ چاودێری نەوەو وەچە لە لادان, پاریزگاری کۆمەڵگە لە دەربەدەری و عەوداڵی و تیاچوون.

ئەی پەروەدەکاران ئەوە ئێوەو گرنگترین هۆکانی لادانی منداڵان, دیارترین چارەسەری بۆ ئەو لادانە لەبەر ڕۆشنایی ئیسلامدا, بۆ ئەوەی ببێتە ڕێنمایی و هیدایەت لە کارو فەرمانی پەروەردەو بەرپرسێتیدا.

**أ- ئەو هەژاریەی باڵی کێشاوە بەسەر هەندێ لە ماڵەکاندا:**

شتێکی ئاشکرایە کاتێ منداڵ لەماڵەوە ئەوەندە خواردن و خواردنەوەی بۆ دەستەبەر نەکرێ پێی بژی, کاڵاو پۆشاکی پێویستی بۆ دابین نەکرا بیپۆشێ, سەیری چواردەوری خۆی کرد جگە لە برسێتی و ماندوبوون و بێبەش بوون لە خۆشیەکانی ژیان هیچی تری نەبینی.. ئەوا بێگومان ئەو کاتە ناچار دەبێ لەماڵ دەرچێ و بڕوات بەدوای بژێوی ژیاندا وێڵ و سەرگەردان بێ, هەوڵی پەیداکردنی سامان و دارایی بدات بەهەر هۆیەك بێ, گوێ نەداتە حەڵاڵ و حەرام , ئیتر دزی و راوڕووت بێ, یان بازرگانی کردن بێ بەتلیاك و ماددە بێهۆشکەرەکانەوە بێ, بێگومان ئەو کاتە توشی چەندەها تاوان و گیروگرفت و کوێرەوەری دێ لەو رێگایەدا, هەروەها دەبێتە مەترسی بۆ سەرو ماڵ و ناموسی خەڵك.

ئیسلام بەو شەریعەت و بەرنامە دادپەروەریەی خۆیەوە چارەسەری گونجاوی داناوە بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی هەژاری, بڕیاری حەقی ژیانێکی بەڕێزی بۆ هەموو تاکێکی مرۆڤەکان داناوە بەلانی کەمەوە لە ماڵ و خواردن و پۆشاك, بەرنامەیەکی کردەیی داڕشتووە بۆ کۆمەڵگەی موسڵمان بۆ ئەوەی سەرکەوێت بەسەر هەژاریداو بنەبڕی بکا بەتەواوەتی, وەك دۆزینەوەو دابینکردنی کار بۆ هەموو هاوڵاتیەك, بڕینەوەی موچەی مانگانە لە گەنجینەی دەوڵەت بۆ هەموو پەککەوتەیەك, دانانی یاسای قەرەبووکردنەوەی خێزانی بۆ هەموو باوکێك کە خاوەنی ماڵ و منداڵ بێ, چاودێری کۆمەڵی هەتیوان, پیرانە, بێوەژنانە, بەشێوەیەك رێزو کەرامەت مرۆڤانەیان پارێزراو بێ, ژیانێکی چاکیان بۆ فەراهەم بهێنرێ.. جگە لەمانەش هەر هۆو ئەحکامێکی تر کە ئەگەر بەدیهات و کەوتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە, ببێتە هۆی نەمان و لەناوبردنی گەورەترین هۆکانی تاوان و خراپەکاری و عەودالی و تیاچوون لەناو کۆمەڵگەدا, وە ببێتە هۆی سەرکەوتن بەسەر هەموو دیاردەیەکی هەژاری و بێ بەشبوون و داماوی و کلۆڵیداو بنەبڕی بکا بەتەواوەتی[1].

---

[1]- تكافل الإجتماعي في الإسلام للمؤلف.

**ب- دووبەرەکی و ناکۆکی نێوان دایکان و باوکان:**

یەکێك لەو هۆکارە هەرە سەرەکیانەی دەبێتە هۆی لادانی منداڵان, ئاژاوەو ناکۆکی نێوان دایك و باوکە بە بەردەوامی لە زۆربەی کاتەکانی کۆبوونەوەو بەیەك گەیشتنیاندا.. کاتێ منداڵ چاوی بە ژیانی ناو ماڵدا هەڵهێناو هۆشی کردەوە, دیاردەی ئاژاوەو دووبەرەکی بینی بەچاوی خۆی, بێگومان خۆی دەرباز دەکا لەو ژیانەو بۆی هەڵدێ, بەرەڵای کۆڵان و بازاڕەکان دەبێ, دەگەڕێ بەدوای هاوڕێدا تا لەگەڵیان کات بەسەر بەرێ و زۆربەی کاتەکانی بێکاری لەگەڵیان بەسەربەرێ, جا ئەگەر ئەوانە هاوڕێی خراپ بوون, ئەو کاتە ئەویش هێدی هێدی دەکەوێتە داوی هاوڕێکانی و توشی بەدڕەوشتی و لادان و چەندەها کێشەو دەردەسەری و ئاکاری خراپی دەکەن, سەرەنجام دەبێتە مەترسی و بەڵاو نەگبەتی بۆ وڵات و بەندەکان.

ئیسلام بەو شەریعەت و بەرنامە حەکیم و بەردەوامیەی خۆیەوە وێنەی بەرنامەیەکی راست و دروستی کێشاوە بۆ داواکار ئەو کەسەی دەیەوێت بچێتە ژیانی هاوسەریەوە, ئەویش ئەوەیە دەبێ ئافرەتی چاك و پەروەردەکراو هەڵبژێرێ, هەروەها وێنەی بەرنامەیەکی راستی کێشاوە بۆ سەرپەرشتیاریی داواکراو, ئەویش ئەوەیە ئەو کەسەی دەیەوێت کچەکەی بدات بەشوو ئەوا دەبێت مێردێکی چاك و خاوەن تەقوای بۆ دیاری بکات, ئەمەش بۆ بەدیهاتنی هاوسۆزی هاوخەمی رێزو خۆشەویستی و لێك حاڵی بوون و هاوکاری نێوان ژن و مێردە, ئەو کاتە بەدوور دەبن لە کێشەو ئاژاوەو دووبەرەکی ژیانی هاوسەرێتی.

لە بەندی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەروونی باسی بنەما راستەکانی هەڵبژاردنی هاوسەرمان کردووە.

ئەوەش بە بێگومان گەورەترین بنەمای جێگیرو دامەزراوە بۆ ئامادەکردنی خانەوادەیەکی بەختەوەر, فەراهەمهێنانی خێزانێکی نمونەیی و پڕ لە خۆشەویستی لێك حاڵی بوون.

**ج- روودانی تەڵاق و جیابوونەوەی ژن و مێرد لە یەکتر:**

یەکێکی تر لەو هۆکارە سەرەکیانەی زۆر جار دەبێتە هۆی لادانی منداڵ, حاڵەتی

رووداني تەلاق و جیابوونەوەی ژن و مێردە لە یەکتر, هاوڕێ لەگەڵ ئەو هەژاری و عەودالّی و سەرگەردانی و پچڕانی شیرازەی خێزاندا.

ئەوەی ئاشکرایەو دوو کەس جیاوازیان نیە لەسەری ئەوەیە بەراستی ئەگەر منداڵ و چاوی بە ژیاندا هەڵهێنا, دایکێ نەبێت بیلاوێنێتەوەو سۆزو خۆشەویستی بۆی هەبێ, باوکێ نەبێ چاودێری بکاو بژێوی ژیانی بۆ دابین کات, بێگومان ئەو منداڵە بەرەو تاوان و خراپەکاری هەنگاو هەڵدەگرێ, پەروەردە دەبێ لەسەر تاوان و خراپە و لادان.

ئەوەی زیاتر کاروبار دەبات بەرەو خراپەکاری ئافرەتی تەلاق دراوە لە مێردێکی تر, ئەو حاڵەتە زۆر جار منداڵان دەبات بەرەو سەرگەردانی و عەودالّی.

ئەوەی کێشەکە زیاتر ئاڵۆز دەکات هەژاری دایکە لەدوای تەلاق و جیابوونەوە, چونکە ئەو حاڵەتە ناچاری دەکات بچێتە دەرەوەی ماڵ کار بکا بۆ بژێوی خۆی و منداڵەکانی, ئەو کاتە منداڵەکانی کەس نابێ چاودێری و سەرپەرشتیان بکا بەرەلای شەقام و کۆلانان دەبن, لەوەوە منالەکانی پەرش و بلاودەبنەوەو بەرەو هەڵدێر ملی رێ دەگرن و تووشی چەندەها بەلاو مەینەتی رۆژگار دەبن. دەی ئیتر چی چاوەڕێ دەکرێ لە منداڵانێ باوکێ نەبێ بەبەزەیی بێ بۆیان و چاودێریان بکات و, بژێوی ژیانیان بۆ دابین بکا, دایکێ نەبێ سۆزو خۆشەویستی هەبێ بەرامبەریان و چاودێریان بکات و هەست بە بەرپرسێتیان بکا ؟!

وە چی چاوەڕێ دەکرێ لە منداڵانێ سەیری دەوروبەری خۆیان بکەن ئەوەندە خواردنیان دەستنەکەوێ تێری لێبخۆن و لە برسێتی رزگاریان بێ, ئەوەندە کاڵاو جل و بەرگیان نەبێ خۆیانی پێ پۆشتەکەنەوە عەورەتیان دەرنەکەوێ, ماڵێ نەبێ تێیدا بحەوێنەوە تا جەستەیان ساغ و تەندروست بێ؟!

لە راستیدا جگە لە بەدبەختی و سەرگەردانی و لادان و تاوانکاری هیچی تریان لێ چاوەڕوان ناکرێ, مەگەر ئەوانەی خوای گەورە بە بەزەیی خۆی بەزەیی بێتەوە پێیاندا کە ئەوانەش زۆر کەمن.

ئیسلام بەبیروباوەڕی راستی خۆی فەرمانیکردووە بە هەموو ژن و مێردێك کە ماف

و حەقی یەکتر بدەن و کەسیان مافی ئەوی تریان پێشێل نەکات, تا ئاکام و سەرەنجامێکی باشیان هەبێ کار نەگاتە ئەو ئاقارە پڕ مەترسیە.

**لەو حەق و مافانە:** گوێڕایەڵی ژنە بۆ مێردەکەی لە خێرو چاکەدا.

* ئیبن عەباس رەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە ئافرەتان لەسەردەمی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جارێك کۆبوونەوەو, یەکێکیان بە نوێنەری خۆیان ناردە خزمەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە پرسیاری لێ بکاو پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! من بە نوێنەری کۆمەڵێك لە ئافرەتان هاتوومەتە خزمەتت, ئەو جیهادو تێکۆشانە خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەر پیاوان, ئەگەر توشی بەڵاو ناخۆشی هاتن پاداشتی گەورەی لەسەر وەردەگرن, ئەگەر شەهیدیش بوون ئەوە زیندوون لای پەروەردگاری خۆیان رۆزی دەدرێن, ئێمەی کۆمەڵی ئافرەتان نیشتەجێی ناو ماڵەکانمانین و ئیش و کارەکانی ناو ماڵیان بۆ دەکەین ئایا ئێمە لە پداشتیاندا بەشدار دەبین؟! پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەڵامی دایەوەو فەرموی: **(أبلغي من لقيت من النساء أن طاعة الزوج واعترافا بحقه يعدل ذلك يعني الجهاد وقليل منكن من يفعله)**[1]. برۆ بەو ئافرەتانە بڵێ: گوێڕایەڵی هەر یەکێ لە ئێوە بۆ مێردەکەی و, داننانی بە حەق و مافیدا, هاوپاداشتی ئەوانە, واتە بەقەد ئەوانەی جیهاد دەکەن لە پێناوی خوادا پاداشتیان بۆ هەیە, هەرچەندە کەمێکیان ئەوە دەکەن.

**لەو حەق و مافانە:** ئافرەت دەبێ پارێزگاری لە سەرو ماڵی مێردەکەی بکا.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(ألا أخبرك بخير ما يكنز؟ المرأة الصالحة إذا نظر إليه سرته وإذا أمرها أطاعته وإذا غاب عنها حفظته بماله ونفسيها)**[2]. واتە: ئایا گەنجینەیەکت پێ بڵێم کە پیاو پاشەکەوتی بکات: ئافرەتی چاك ئەگەر سەیری بکات پێی دڵخۆش بێت, ئەگەر فەرمانی بەسەردا بدات گوێڕایەڵی بکات, ئەگەر لێی دوورکەوتەوە پارێزگاری لە سەرو ماڵی بکا.

---

1- ضعيف رواه الطبراني والبزار, ضعيف الترغيب والترهيب: ١٢١٣/٢.

2- رواه إبن ماجة.

* ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(خير النساء التي تسره إذا نظر وتطيعه إذا أمر ولا تخالفه..)**[١]. واتە: چاکترین ئافرەت ئەوەیە ئەگەر سەیری بکەیت پێی دڵخۆش بێت, ئەگەر فەرمانی بەسەردا بدەیت گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریت بکات, نافەرمانی مێردەکەی نەکا..

**لەو حەق و مافانە:** کاتێ پیاو داوای کاری سەرجێی لێکرد پێویستە بچێت بەدەم داواکەیەوە.

* ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَلَمْ تَأْتِهِ فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ)**[٢]. واتە: کاتێ پیاو داوای کاری سەرجێی لە ژنەکەی کرد نەچوو بەدەمیەوە, پیاوەکەی لێی تووڕە بوو, ئەوا مەلائیکە ئەو شەوە تا بەیانی نەفرەتی لێدەکەن.

**لەو حەق و مافانە:** پێویستە لەسەر پیاو بژێوی خاوو خێزانی دابین بکات.

خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا..﴾. البقرة:٢٣٣**. واتە: پێویستە لەسەر باوکی منداڵ(یان بەخێوکەری) رزق و ڕۆزی و پۆشاکی بەشێوەیەکی گونجاو بۆ ئامادە بکات, هیچ کەسێك لە توانای خۆی زیاتر داوای لێ ناکرێ..

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(اتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ, وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ)**[٣]. واتە: لە خوا بترسن لە بەرامبەر ئەو ئافرەتانەی خوای گەورە حەلاڵی کردوون بۆتان و, ئەمانەت و سپاردەن لای ئێوە, لەسەرتانە رزق و ڕۆزیان بۆ دابین

---

1- تحقيق الألباني : (صحيح) انظر حديث رقم: ٣٢٩٨ في صحيح الجامع.

2- مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجه البخاري ٣٩/٧ ( ٥١٩٣ ) و( ٥١٩٤ ) ، ومسلم ١٥٦/٤ ( ١٤٣٦ ) ( ١٢٠ ) و١٥٧ ( ١٤٣٦ ) ( ١٢١ ) و( ١٢٢ ).

3- صحيح رواه مسلم:٢١٣٧, مشكاة المصابيح: ٢/ ٢٥٥٥.

بکەن لەگەڵ پۆشاك بەشێوەیەکی گونجاو.

**لەو حەق و مافانە:** پیاو دەبێ پرس و را بکات بە خێزانی و رای لێ وەرگرێ دەربارەی کاروباری ناو ماڵ.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(أَمِّرُوا النِّسَاءَ فِي بَنَاتِهِنَّ)**[1]. واتە: با ئافرەتان پرس بکەن بە کچەکانیان پێش ئەوەی بیاندەن بەشوو.

**لەو حەق و مافانە:** پیاو دەبێ لە هەندێ کەموکوڕی خێزانی چاوپۆشی بکات بەتایبەتی ئەگەر ئەوەندە کردەوەو رەوشتی بەرزی هەبوو کەموکوڕیەکانی پێ داپۆشێت.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(لَا يَفْرَكُ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ)**[2]. واتە: پیاوی موسڵمان نابێ بێزار ببێ لە ژنی موسڵمان, چونکە ئەگەر خویەکی بەدڵی ئەو نەبێ خویەکی تری بەدڵیەتی!.

**لەو حەق و مافانە:** پیاو دەبێ سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ خێزانی دەربڕێ و بە چاکی مامەڵەو رەفتاری لەگەڵ بکاو, گاڵتەو گەپی لەگەڵ بکا.

خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: **﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾. النساء١٩.** واتە: رەفتاریان لەگەڵ بکەن بەچاکی, جا ئەگەر حەزتان لێیان نەبوو (تەڵاقیان مەدەن) چونکە لەوانەیە ئێوە حەزنەکەن لە شتێك خوا لەوەدا دابنابێ چاکەیەکی زۆر.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ وَأَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي)**[3]. واتە: چاکترین کەس لە ئێوە چاکترینتانە بۆ خانەوادەکەی, من چاکترین کەسم بۆ خانەوادەکەم.

---

[1] - ضعيف رواه أبو داود: ٢٠٩٥ , وأحمد, تحقيق الألباني: (ضعيف) انظر حديث رقم: ١٤ في ضعيف الجامع.

[2] - أخرجه مسلم: ١٧٨/٤ ( ١٤٦٩ ) ( ٦١ ), وأحمد: ٣٢٩/٢ .

[3] - رواه إبن ماجة و الحاكم, وقال الشيخ الألباني : صحيح , صحيح سنن إبن ماجة: ٦٣٦/١ برقم: ١٩٧٧.

* حەبەشیەکان لە مزگەوتدا یاریان دەکرد پێغەمبەری خوا صلی اللہ علیه وسلم دەستی رادابوو عائیشە دەم و چاوی دابوو بەسەر شانی پێغەمبەردا صلی اللہ علیه وسلم و سەیری یاریەکەیانی دەکرد, ئا لەو کاتەدا بوو فەرموی: **(أكْمَلُ المُؤمِنِينَ إيمَاناً أحْسَنُهُمْ خُلُقاً وألطَفهُم بِأَهْلِه)**[1]. واتە: ئەو موسڵمانانەی کە بەتەواوی باوەڕیان بە خوا تەواوە, ئەوانەن کە خوڕەوشتیان جوانەو, بەسۆزو بەبەزەین بەرامبەر بە هاوسەرو خانەوادەکانیان.

* پێغەمبەری خوا صلی اللہ علیه وسلم لەگەڵ عائیشەی خێزانی رەزای خوای لێ بێ پێشبڕکێی دەکرد جارێ پێشی ئەدایەوە, جارێکیش عائیشە پێشی ئەوی ئەدایەوە, ئەیفەرموو: ئەوە لە جیاتی ئەو جارە ئێستا وەك یەکین[2].

* عومەری کوڕی خەتاب رەزای خوای لێ بێ لەگەڵ ئەو هەموو هێزو توانایەدا فەرمویەتی: پیاو دەبێ لەماڵەوە وەك منداڵ هەڵس و کەوت بکات, مەبەستی ئەوەیە سانا بێ و رووخۆش بێ و توندوتیژ نەبێ, هەروەها لە دەرەوە پیاوی ناو پیاوان بێ.

**لەو حەق و مافانە:** پیاو دەبێ لە ماڵەوە یارمەتی خێزانی بدات ئیقتیدا بکا بە پێغەمبەری خواوە صلی اللہ علیه وسلم و بیکاتە پێشەنگی خۆی.

* عائیشەی رەزای خوای لێ بێ فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللہ علیه وسلم لە ماڵەوە وەك یەکێ لە ئێوە چۆن کاری ناوماڵ دەکات, ئاوەها کاری دەکرد, شتی هەڵدەگرت و دەیگواستەوە, گۆشتی بۆ لەت دەکردین, ماڵی پاك و خاوێن دەکرد, یارمەتی کارەکەرو خزمەتگوزاری دەدا لە کارەکەیاندا [3]..

ئەوانەی سەرەوە گرنگترین مافەکانی راستی و دادپەروەری بوون کە ئیسلام واجبی کردوون لەسەر ژن و مێرد, جا ئەگەر جێبەجێیانکردن ئەو کاتە رێکەوتن جێگای جیابوونەوە دەگرێتەوە, خۆشەویستی بەدیدێت لە جیاتی دووبەرەکی و کاری

---

[1] - متفق علیه: البخاري٣٢٣٧, ومسلم:٣٥٢٦.

[2] - صحيح رواه أبوداود والنسائي, مشكاة المصابيح: ٣٢٥١/٢.

[3] - رواه الطبراني وغيره .

ناپەسەند, ئەندامەکانی خانەوادە بەتەواوەتی خۆشگوزەران و ئارام و بەختەوەرو لێك حاڵی دەبن, هیچ شتێك نابێتە هۆی ئەوەی روونی خێزان لێڵ بکات, وە هیچ کامیان کاری خراپە بەرامبەر ئەوی تریان ناکات.

ئەگەر کەلێن کەوتە نێوان ژن و مێردو پێك نەهاتن ئافرەتەکە سەرپێچی کرد یان پیاوەکە رەوشتی باش نەبوو, ئەوا دبێ لەو حاڵەتەدا رەچاوی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بکرێ, پێش ئەوەی کار بگاتە رووداني تەلاق و جیابوونەوە:

١- رێنمایی و ئامۆژگاری چاك بەحیکمەت و قسەی خۆش: ئەوەش لە دەروازەی ئامۆژگاریان بکەو بیریان بخەرەوە چونکە بەراستی ئامۆژگاری سوود دەگەیەنێ بە بڕواداران.

٢- جیاکردنەوەی جێگای خەوتن لێی و پشت تێکردنی, کە ئەوەش سزای دەروونیە بۆی, بەڵکو ئافرەتەکە بگەڕێتەوە سەر رێگای راست.

٣- لێدانی بەسوکی, بەمەرجێ بەتوندی لێی نەدرێ و هیچ شوێنێکی نەشکێنرێ, هەروەها بەمەرجێ لەو شوێنانە نەدرێ جێگای مەترسین وەك رووخسارو سەرو سنگ و سکی. ئەگەر بەو سێوەیە بێ ئەو لە هەڕەشەوە نزیکتر تا لێدان و ئازاردانی, چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قودوەو پێشەنگە بۆ نەتەوەکەی ئەویش هەرگیز لە ئافرەتی نەداوە.

* عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمویەتی: **(مَا ضَرَبَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم شَيْئاً قَطُّ بِيَدِهِ ، وَلاَ امْرَأَةً وَلاَ خَادِماً ، إلاَّ أنْ يُجَاهِدَ فِي سَبيلِ اللهِ)**[1]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر خۆی هەرگیز لە ئافرەتی نەداوە, لە کارەکەری نەداوە..مەگەر لەپێناوی خوا.

* ئیبن سەعد فەرموی: ئافرەتێك شکاتی مێردەکەی لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردو گوتی: مێردەکەم لێی داوم, پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە مێردەکەی فەرموو: **(علام يضرب أحدكم امرأته ضرب العبد, ثم يظل يعنقها ولا**

---

[1]- أخرجه مسلم ٨٠/٧ ( ٢٣٢٨ ) ( ٧٩ ) ., مشكاة المصابيح:٥٨١٨/٣ .

**يستحي)**[1]. واتە: ئەوە بۆچی یەکێك لە ئێوە ئەدات لە ژنەکەی وەك کۆیلە, پاشان جووت دەبی لەگەڵی و شەرم ناکات.

٤- لە کۆتاییدا یەکێ لە خزمانی پیاوەکەو یەکێیش لەهی ژنەکە دەبێ بکرێنە ناوبژیوان لە نێوانیاندا, بۆ ئەوەی ئامۆژگاری چاکیان بکەن بەدڵسۆزانەو هەوڵی لابردنی کێشەکانیان بدەن و رێکیان بخەنەوە, تا کێشەکە نەگاتە ئەوەی لەیەکتر جیاببنەوەو حاڵەتی تەڵاق رووبدات.

ئەمەش کارکردنە بەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً* وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً**﴾. **النساء: ٣٤-٣٥**. واتە: ئەو ئافرەتانەش کە ئێوە دەترسن سەرپێچیتان بکەن ئەوە ئامۆژگاریان بکەن و جێگەیان لێ جیابکەنەوەو لێیان بدەن, جا ئەگەر گوێڕایەڵیان کردن ئەوە ئیتر هیچ ڕێگەیەکی تر مەگرنەبەر بەڕاستی خوا هەمیشە بەرزو بڵندی گەورەیە* ئەگەر ترسان لە تێکچوونی نێوانیان ئەوە ناوبژیوانێك بنێرن لە خزمی پیاوەکەو, ناوبژیوانێك لە خزمی ئافرەتەکە, ئەگەر ئەو دوو ناوبژیوانە دڵسۆز بن و ئاشتیان بوێ خوای گەورە نێوان ژن و مێردەکە چاك دەکاتەوە, بەڕاستی خوا هەمیشە زانای ئاگادارە.

ئەگەر هەموو ئەو ڕێگایانە سەریان نەگرت و ژن و مێردەکە یەك نەکەوتنەوە, ئەو کاتە پیاوەکە کاتێ خێزانەکەی پاك بوویەوە لە خوێنی حەیز کاری سەرجێی لەگەڵ نەکات و تەڵاقێکی بدات, بۆ ئەوەی ببێتە فرسەتێك بۆ گەڕانەوەی بۆ ناو ژیانی خێزانی, لەبەر ئەم ئایەتە قورئانیە : ﴿**فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ**﴾. **البقرة:٢٣٠**. واتە: خۆ ئەگەر پیاو دوای دووجار تەڵاقدان, جارێکی تر ژنەکەی تەڵاق دایەوە, ئیتر ئەو ژن و مێردە بەتەواوی لەیەکتر حەرام دەبن و, پیاوەکە جارێکی تر ناتوانێت ژنەکە بگێڕێتەوە بۆ ژێر رکێفی خۆی, مەگەر ژنەکەی شوو بکات بە یەکێکی ترو, مێردی دوای ئەو

---

[1] - صحيح غاية المرام: ٢٥٠.

بچێته لای و پاش چوونه لای ئەگەر مرد یان ئەویش لێی جیابوویەوەو تەڵاقیدا, ئەو کاته پاش تەواو بوونی ماوەی شەرعی ئەگەر زانیان له سنووری خوا دەرناچن, ئەتوانن بگەڕێنەوه بۆلای یەکتر بەمارەکردنێکی تازەوه, جا ئەوانەی باسکرا سنووری خوان و خوا روونی دەکاتەوه بۆ ئەو کەسانەی تێگەیشتوون و زانیاریان هەیەو بیرو هۆشیان دەخەنەکار.

ئیسلام ئەو هەموو رێ و شوێنانەی گرتۆتەبەر بۆ ئەوەی کار نەگاته روودانی تەڵاق و کاریگەری خراپی نەبێت بۆسەر خۆیان و پەروەردەی منداڵەکانیان و, ئاکام و سەرەنجامێکی ئاڵۆزو دژواریان نەبێ.

بەلاتانەوه سەیر نەبێ که پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەڵاقی به بێزراوترین حەڵاڵ داناوه, به بەڵگەی ئەم فەرموودەیە که ئیبن عومەر گێڕاویەتیەوه که پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(أَبْغَضُ الْحَلَالِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى الطَّلَاقُ)**[1]. واته: بێزراوترین حەڵاڵ لای خوای گەوره تەڵاقە.

له حاڵەتی جیابوونەوەدا ئیسلام واجبی کردووه لەسەر مێرد خەرجی ماوەی شەرعی بکێشێ بەهرەمەندی بکات, هەروەها خەرجی منداڵەکانیش بکێشێ تاکو تووشی کێشەو غەم و پەچاره نەبن و رووداوی تاڵ و دژواری لێ نەکەوێتەوه, خوای گەوره لەو بارەوه دەفەرموێت: **﴿وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعاً بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾. البقرة٢٣٦**. واته: بەهرەمەندیان بکەن و دەوڵەمەند بەپێی خۆی و هەژار بەپێی خۆیبەهرەو یارمەتی دانێك که باوو نەریت بێت, ئەوه پێویسته لەسەر چاکەکاران.

له حاڵەتێکدا ئەگەر مێرد توانای ئەوەی نەبوو خەرجی ژن و منداڵەکانی بکێشێ, ئەو کاتته پێویسته لەسەر دەوڵەت خەرجیان بکێشێ به شێوەیەکی گونجاو, ئەوەی پێویستیانه بۆیان دابین بکات تا گەوره دەبن و لوخەم دەرەخسێن, ئەمەش دەبێته هۆی بەدوور بوونیان له بەدبەختی و غەم و پەژارەو لادانیان.. ئەمه جگه لەوەی ئەوانەی دەزانن به حاڵ و گوزەرانیان ئیسلام ئاراستەیکردوون بۆ یارمەتیدان و

---

[1] - رواه أبوداود: ٢١٧٨, وإبن ماجة: ٢٠١٨.

هاوبەرپرسێتیان, بۆ بەدیهاتنی ئەم فەرمودەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە پێشەوا موسلیم ریوایەتی کردووە: **(مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لَا ظَهْرَ لَهُ وَمَنْ كَانَ لَهُ فَضْلٌ مِنْ زَادٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لَا زَادَ لَهُ)**[1]. واتە: هەر کەسێ وڵاغی سواری یان هەر شتێکی تر کە هاوڕێکانی پێویستیان پێیەتی زیاد لە پێویستی خۆی پێیە بابیدات بەو کەسەی پێویستیەتی, هەر کەسێ خواردنی زیادی پێیە بابیدات بەو کەسەی پێی نیە.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(فِي الْمَالِ حَقٌّ سِوَى الزَّكَاةِ)**[2]. واتە: سامان و دارایی جگە لە زەکات هەق و مافی تری بەسەرەوەیە.

* ئمام عەلی رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(إن الله فرض على أغنياء المسلمين في أموالهم بقدر الذي يسع فقراءهم ولن يجهد الفقراء إذا جاعوا وعروا إلا بما يصنع أغنياؤهم ألا وإن الله يحاسبهم حسابا شديدا ويعذبهم عذابا أليم)**[3]. واتە: خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەر دەوڵەمەندە موسڵمانەکان لەو سامان و داراییەی کە پێی بەخشیون ئەوەندە دەربکەن بەشی هەژارەکانیان بکات, بەهۆی بەخیلی و چروکی دەوڵەمەندەکانیانەوە نەبێت هەژارەکان ماندووی دەستی هەژاری و روت و رەجاڵی و برسێتی نابن, جا بابزانن خوای گەورە بە توندی لێیان ئەپرسێتەوەو سزای توندو تیژیان دەدات.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(ما آمن بي من بات شبعان وجاره جائع إلى جنبه وهو يعلم به)** [4]. واتە: ئیمانی بە من نیە ئەو کەسەی بە تێری شەو سەربنێتەوەو دراوسێکەی لە تەنیشتیەوە برسی بێ, ئەویش ئاگادار بێ کە برسیەتی.

---

[1] - صحيح رواه مسلم:١٢٥٨, مشكاة المصابيح: ٣٨٩٨/٢ .

[2] - رواه الطبراني وإبن ماجة, وقال الألباني ضعيف, جامع الترمذي: ٤٨/٣ برقم: ٦٦٠.

[3] - ضعيف رواه الطبراني في الأوسط: ٢٣٣/٨برقم: ٣٧١٧, ضعيف الترهيب والترغيب: ٤٦٢/١.

[4] - صحيح رواه الطبراني والبزار, أنظر حديث رقم ٥٥٠٥ في صحيح الجامع.

**د - کات بەفیڕۆدان لەلایەن منداڵان و گەنجانەوە:**

یەکێکی تر لەو هۆکارە سەرەکیانەی زۆرجار دەبێتە هۆی لادانی منداڵان و گەنج و لاوەکان, سوود وەرنەگرتنە لە کات و بەفیڕۆدانیەتی, وەك ئاشکرایە منداڵ هەر لەسەرەتاوە حەزو ئارەزووی لە لە جوڵان و یاریکردنە, چونکە ئارەزووی یاریکردن لای منداڵ سروشتێکی خۆڕسکە خوای گەورە کردوویەتی بەغەریزەیەك لە دەروونیدا, بۆیە دەبینی لەگەڵ منالانی هاوتەمەنی خۆیدا هەمیشە لە جوڵەدایە هەندێ جار خەریکی وەرزش و دووگۆڵی و بازدانە, هەندێ جار هەڵدەگەڕێ بەسەر دارو درەختدا..

جا بۆیە پەروەردەکاران دەبێت ئەو هەلە بقۆزنەوەو لەدەستی نەدەن, ئەویش بەکردنەوەی یانەی مەشقکردن, خولی یاری و پێش بڕکێ و راکردن, کردنەوەی مەلەوانگەی تایبەتی و گونجاو بۆ فێر بوونی مەلەوانی.. بۆ ئەوەی بۆشایی ژیانیان پڕکەنەوە, وە ببێتە هۆی چالاکی ماسولکەکانیان, جەستەیان گەشەبکاو بەهێز بێ..

بێگومان ئەگەر منداڵ شوێنێك نەبێ وەرزشی تێدا بکات, یانەیەکی گونجاو نەبێ مەشقی تێدا بکا, مەلەوانگەیەك نەبێ مەلەی تێدا بکات, ئەوکاتە بە بەتاڵی و سەرگەردانی بۆ خۆی دەسووڕێتەوە تا تووشی دەبێ بەتووشی هاوەڵی خراپ و چەقاوەسوو لاسارەوەو لەرێی راست لای دەدەن و بەدبەخت و چارە ڕەشی دەکەن.

ئیسلام بەو ئاراستەکردنە بەرزو بڵندەی خۆیەوە, چارەسەری گونجاوی بۆ ئەو بۆشاییەی ژیانی منداڵ و گەنج و لاوەکان داناوە, ئەویش بەدابینکردنی هۆکاری کردەیی بۆ ئەوەی جەستەیان تەندروست و چالاك و بەهێز بێ و گەشەبکات.

گەورەترین هۆکاریش راهێنانیانە لەسەر خوا پەرستی بەتایبەتی نوێژ کە کۆڵەکەی ئایینەو راگیرکەریەتی, یەکێکە لە روکنە سەرەکیەکانی ئیمان, قازانج و سوودی ئێجگار زۆری رۆحی و جەستەیی هەیە, ئاسەوارێکی چاکی رەوشتی و دەروونی هەیە.

ئەمانەی لای خوارەوە هەندێ لە قازانج و سوودەکانی جەستەیی نوێژکردنن بەکورتی بۆ ئەوەی بزانێ و فێربێ ئەو کەسەی کە دەیەوێت شێوەی رەوایەتی و گرنگی نوێژ بزانێ:

- وەرزشێکی ناچاریە بۆ موسڵمان چونکە لە نوێژدا هەموو ئەندام و جومگەکانی

دەجولێت, ئەو جولەیەش دەبێتە هۆی بەهێزی و چالاکی ماسولکەکان و سوڕی خوێن و هەموو ئەندامەکانی جەستە.

- پاك و خاوێنی ناچاریە, بەهۆی ئەو تارەت و دەسنوێژەی کە لە پێش نوێژەوە دەگیرێت کە دەبێتە هۆی خاوێنی ئەندامەکان و, ناو دەم و لوت و, مووەکانی سەر!.. ئەمەش جگە لەوەی لە هەندێ حاڵەتی وەك خۆشتن لە دوای لەشگرانی, پاك و خاوێنی جەستەو جل و بەرگ و جێگا نوێژەکەش.. ئەمانەی باسکران هەموویان مەرجن بۆ راست و دروستی نوێژ.

- مەشقکردن و راهێنانە لەسەر رۆشتن, موسڵمانان لە شەوو رۆژێدا پێنج جار دەڕۆن بۆ مزگەوتەکان بۆ نوێژی جەماعەت, بێگومان ئەو رۆشتن و هەنگاونانە بەرەو مزگەوتەکان دەبێتە هۆی چالاکی و بەهێزی جەستەو, پاراستنی لە تەمەڵی و تەوەزەلی.. لێکۆڵینەوە پزیشکیەکان دەریان خستووە رۆشتنی زۆرو مەشقکردن لەدوای نان خواردن ئەگەری توشبوون بەنەخۆشیەکانی گەدەو بەدهەرسی کەمدەکاتەوە, مرۆڤ دەپارێزێ لە نەخۆشیە کوشندەو پڕ مەترسییەکان.

بەلاتانەوە سەیر نەبێ و گوێ بگرن لەو کەسەی لە هەواو هەوەسەوە قسە ناکات بزانن چۆن هانی پەروەدەکاران و باوك و دایکی داوە لە حەوتساڵیدا نوێژ بکەن بە منداڵەکانیان تاکو رابێن لەسەری و بۆشایی ژیانیانی پێ پڕبکەنەوەو بە فێرکردنیان و مەشقکردن لەسەری.

گوێ بگرن بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەو بارەوە چی دەفەرموێت: : **(مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ)**[1]. واتە: فەرمان بکەن بەمنداڵەکانتان لەحەوت ساڵیدا نوێژ بکەن, لە دە ساڵیدا بەلێدانێکی سوك لێیان بدەن ئەگەر نوێژیان نەکرد, جێگەشیان جیابکەنەوە با بەیەکەوە نەخەون.

ئەمەش بۆ ئەوەیە منداڵ لە سەرەتاوە خویگرێت بە پەرستشەوەو رابێت لەسەری,

---

[1] - اخرجه ابو داود في الصلاة (٤٩٥), والترمذي (٤٠٧), و أحمد في المسند: (١٨٧\٢).

پەروەردەبێ لەسەر گوێڕایەڵی بۆ خوا, پارێزگاری لە مافەکانی بکا, سوپاسگوزار بێ, پشت تەنها بەو ببەستێ, زوو زوو بگەڕێتەوە بۆ لای, متمانە تەواوی پێی هەبێ, تەسلیم بێ بە زاتی خوا.. تا بەو پەرستشانە روحی پاك بێەوە, جەستەی چالاك بێ, خووڕەوشتی جوان بێ, گوفتار و رەفتاری چاك بێت!!.

ئەمە جگە لەوەی منداڵ بۆشایی ژیانی پێ پڕدەکاتەوە بە چۆنیەتی فێرکردنی و کردارو هەڵسوکەوتەکانی ناو نوێژو, قورئان خوێندن و, ژمارەی رکاتەکانی و, فەرزو سوننەتەکان و, ئادابەکانی, جا ئیتر لە ماڵەوە لەسەر دەستی پەروەردەکارەکەی بێت یان لە مزگەوت بێ لەسەر دەستی فێرکارو مامۆستاکەی.

ئەو هۆکارە کردەییانەی کە ئیسلام دایناون و ئاڕاستەی کردوون بۆ چارەسەری کات بەفیڕۆدان لای منداڵان ئەمانەی لای خوارەوەن:

فەرمانی کردووە بە فێر بوونی هەنەری جەنگ, ئەسپ سواری, مەلەوانی, بازدان و پاڵەوانبازی.. هەروەها ئاراستەیکردوون بۆشایی ژیانیان پڕبکەنەوە بە خوێندنەوەی بەسوود, گەشت و گوزاری پاك و خاوێن, وەرزشی هەمەجۆر, بۆ ئەوەی کات بەفیڕۆ نەدەن, کە ئەمانەش بە کردنەوەی کتێبخانەی گشتی و بەنابانگ و, یانەی گەورەو فراوانی وەرزشی و, گۆڕەپانی گەورەی یاری و, مەلەوانگەی شیاو دەبێت, کە بگونجێن و هەماهەنگ بن لەگەڵ یاساو دروشمەکانی ئیسلام و بەرنامە پیرۆزەکەیدا, دەرچوون نەبێ لە سنووری شەرعی و ئاداب و رەوشتە بەرزەکانی ئیسلام.

**ئەمانەی لای خوارەوە چەند ئاراستە کردنێکن ئیسلام دایناون بۆ ئەو مەبەستە:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ..**﴾. **الأنفال:٦٠.** واتە: ئەی ئیمانداران ئامادەی بکەن بۆیان ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز و, ئەسپی دامەزراو, تا بترسێنن پێی دوژمنانی خواو دوژمنی خۆتان, وە کەسانێکی تریش کە ئێوە نایانناسن خوا دەیانناسێ. هەروەها دەفەرموێت: ﴿**قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ..**﴾ . **الزمر : ٩.** واتە: بڵێ ئایا ئەو کەسانەی کە شارەزان و شەرع زانن وەك ئەو کەسانەن کە نەشارەزان؟.

عومەری کوڕی خوتاب ڕەزای خوای لێ بێ فەرمویەتی: منداڵەکانتان فێری مەلەوانی و تیرهاوێژی و ئەسپ سواری بکەن.

* ئیبن عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ فەرموی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئامۆژگاری پیاوێکی دەکرد پێی فەرموو: **(اغتنم خمساً قبلَ خمسٍ: شبابَّك قبل هَرَمِك ، وصحَّتَك قبل سَقَمك، وغِناك قبل فقرِك، وفراغَكَ قبل شغلك، وحياتَك قبل موتك)**[1]. واتە: پێنج شت بەهەل بزانە لە پێش پێنج شتەوە: گەنجی و لاویت پێش ئەوەی پیر بیت, لەش ساغیت پێش ئەوەی نەخۆش بکەویت, دەوڵەمەندیت پێش ئەوەی هەژار بکەویت, بەتاڵیت پێش ئەوەی سەرقاڵی ئیش و کار بیت, ژیانت پێش مردنت.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(وَارْمُوا وَارْكَبُوا وَأَنْ تَرْمُوا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ تَرْكَبُوا)**[2]. واتە: تیرهاوێژی و ئەسپ سواری بکەن, من تیرهاوێژیم پێخۆشترە لە ئەسپ سواری.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(كُلُّ شَيْءٍ لَيْسَ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَهُوَ لَهْوٌ أَوْ سَهْوٌ إِلا أَرْبَعَ خِصَالٍ: مَشْيُ الرَّجُلِ بَيْنَ الْغَرَضَيْنِ، وَتَأْدِيبُهُ فَرَسَهُ، ومُلاعَبَةُ أَهْلِهِ ، وَتَعَلُّمُ السِّبَاحَةِ)**[3]. واتە: هەرشتێك زیکرو یادی خوا نەبێ ئەوە قسەی پڕوپوچە یان گاڵتەو گەپ و بێ ئاگایی و غافڵ بوونە تەنها چوار شت نەبێت: هات و چۆی پیاو لە نێوان دوو نیشانەنەدا بۆ ڕەمی و تیرهاوێژی, مەشقکردن بە ئەسپەکەیی و ئامادەکردنی بۆ جیهاد, گاڵتەو گەپ کردن لەگەڵ خێزان و منداڵەکانی, فێربوونی مەلەوانی.

---

[1]- صحيح رواه الحاكم وقال صحيح على شرطهما,والبيهقي, قال الألبانى صحيح, صحيح الترغيب والترهيب: ٣/٥ ٣٣٥.

[2]- قال الترمذي: حديث حسن صحيح, وقال الشيخ الألباني : ضعيف, جامع الترمذي: ١٦٣٧, وإبن ماجة: ٢٨١١, سنن انسائي: ٣٥٧٨.

[3]- رواه والطبراني في الكبير: ٢/٢٧٠ والحاكم, وقال الشيخ الألباني : صحيح, سلسلة الصحيحة: ٣١٥, غاية المرام: ٣٨٩.

* پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: **(رَحِمَ اللّهُ امْرَأً أَرَاهُمْ الْيَوْمَ مِنْ نَفْسِهِ قُوّةً)** [1]. واتە: رەحمەتی خوا لەو کەسەی ئەمڕۆ بە بەهێزی دەیبینن.

* کاتێك حەبەشیەکان لە مزگەوتدا یاریان دەکرد بەرمەکانیان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموون: **(دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ لتعلم اليهود أن في ديننا فسحة)** [2]. واتە: رمبازی و تیرئەندازی بکەن ئەی بەنی ئەرفیدە با جولەکەکان بزانن ئایینی ئێمە چەندە فراوان و کراوەیە.

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلَا تَعْجَزْ وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلَا تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللَّهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ)** [3]. واتە: ئیمانداری بەهێز چاکترو خۆشەویسترە لای خوا لە ئیمانداری لاواز هەمووشیان هەر چاکن, سوربە لەسەر ئەوەی سوودت پێدەگەیەنێت داوای یارمەتیش تەنها لە خوای گەورە بکەو, دەستەپاچە مەبە, ئەگەر شتێکت تووش هات مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە وادەبوو, بەڵکو بڵێ: ئەمە قەدەری خوایەو ئەوەی ویستی کردی, چونکە بەراستی وتنی وشەی وابوایە کاری شەیتان دەکاتەوە.

ئەمانەو چەندەها ئاراستەی بەرزو راست و دروستی تر.

ئەگەر پەروەردەکارانت دەسبگرن بەم ئاراستە ئیسلامیانەوە, ئەوا تەندروستی و زانستی و بەهێزی بۆ منداڵەکانیان بەدەسدەهێنن, هەروەها منداڵەکانیان بەدوور دەبن لە لادان و ئەملاولاکردن و سەرگەردانی, بۆشایی ژیانیان بەشتێك پڕدەکەنەوە سوودی بۆ دنیاو ئایین و قیامەتیان هەبێ, نەوەیەکی ئامادەکراو و بانگخوازو گیان لەسەر دەست و لاوانێکی ئیشکەر دەبن بۆ ئیسلام.

---

[1] - رواه إبن إسحاق و إبن هشام في سيرة إبن هشام : ٢/٣٧٠.

[2] - تحقيق الألباني: (صحيح) انظر حديث رقم: ٣٢١٩ في صحيح الجامع, سلسلة الصحيحة: ١٨٢٩.

[3] - أخرجه مسلم في القدر: ٥٦/٨ ( ٢٦٦٤ ) ( ٣٤ ), وأحمد في المسند: ٢/ ٣٧٠.

**هـ - تێکەڵاوی هاوڕێی خراپ و بەدرەوشتان:**

یەکێکی تر لەو هۆکارە گەورانەی زۆرجار دەبێتە هۆی لادانی گەنج و لاوەکان تێکەڵاوی بەدرەوشتان و هاوڕێی خراپە, بەتایبەتی ئەگەر منداڵ زیرەك و وریا نەبێت, بیروباوەڕی لاواز بێت, شل و شێواو بێت لەرووی رەوشتەوە ئەوە هەر زوو کاریگەری خراپیان دەبێت لەسەری و لەخشتەی دەبەن و تووشی چەندەها رەوشتی خراپ دەبێت, چارە رەش و بێ حەیاو لاسار دەبێت, هێدی هێدی دەبێتە کەسێکی تاوانکارو خوی پێوەدەگرێت, ئەو کاتە زۆر بەزەحمەت دەگەڕێتەوە بۆ سەر رێگای راست و لە گومڕایی و نەگبەتی رزگاری دەبێت.

ئیسلام بەو رێنماییە زانستی و پەوەردەییانەی خۆی پەروەردەکاران و باوك و دایکی ئاڕاستەکردووە کە چاودێری منالّەکانیان بکەن بەتەواوی, بەتایبەتی لە تەمەنی لاوێتیدا, پێویستە بزانن تێکەڵاوی و هاوڕێیەتی کێ دەکەن, بەیانیان و ئێواران بۆ کوێ دەڕۆن, هات و چۆی کوێ دەکەن.

وە ئاڕاستەیان دەکات هاوەڵی چاك بۆ منداڵەکانیان بدۆزنەوە تا لەوانەوە فێری ئەدەب و خورەوشتی بەرزو جوان بن.

هەروەها ئاڕاستەی کردوون منداڵەکانیان ئاگادار بکەنەوە لە تێکەڵاوی و هاوڕێیەتی بەدرەوشتان, تا نەکەونە داویان و تووشی تاوان و خراپەو لە رێی راست لادانیان نەکەن, گومڕاو سەرگەردان نەبن.

**ئەوەش ئێوەو ئەو ئاگادارکردنەوەو ئاڕاستانەی ئیسلام لە تێکەڵاوی و هاوڕێیەتی بەدرەوشتان:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلاً* يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَاناً خَلِيلاً* لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولاً**﴾. **الفرقان:٢٧-٢٩.** واتە: رۆژێك دێت ستەمکار هەردوو دەستی خۆی دەگەزێت, پاشان دەڵێت: ئای خۆزگایە لە گەڵ پێغەمبەردا رێگای راستم بگرتایەو بەپێی بەرنامەی ئەو ژیانم ببردایەتەسەر, ئەی هاوار خۆزگایە فلاّن کەسی گومڕام نەکردایەتە هاوەڵ و دۆستی خۆم, بەراستی ئەو کەسە لە رێی

راستی ئایین لایدام و وێڵ و گومڕای کردم, دوای ئەوەی پێم ڕاگەیەنرا بوو, بێگومان شەیتان ئادەمیزاد بەرەو گومڕایی و سەرشۆڕی دەبات و سوك و ڕیسوای دەكات.

هەوەها دەفەرموێت: ﴿**قَالَ قَرِينُهُ رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ وَلَكِن كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ**﴾. **ق: ٢٧**. واتە: هاوڕێ و هاونشینە شەیتانەکەشی پاکانە بۆ خۆی دەکات و دەڵێت: ئەی پەروەردگارمان! من بێ بڕواو گومڕام نەکرد, بەڵکو ئەو خۆی لەناو گومڕاییەکی دوور لە هیدایەتدا بوو.

هەر لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**الْأَخِلَّاء يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ**﴾. **الزخرف: ٦٧**. واتە: ئەو ڕۆژە دۆستان دەبنە دوژمنی یەکتر, تەنها پارێزکاران نەبێت.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (**الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ**)[1]. واتە: پیاو لەسەر ئایینی هاوەڵ و برادەرەکەیەتی, هەر کەسێك لە ئێوە باسەیر بکات لەگەڵ کێ هاوڕێیەتی دەکات.

* هەروەها دەفەرموێت: (**إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً**)[2]. واتە: نمونەو وێنەی دانیشتن لای هاوڕێی چاك و هاوەڵی خراپ, وەك میسك فرۆش و خاوەن کورەی ئاگر وایە, ئەگەر لای میسك فرۆش دانیشیت یا ئەوەتا بەشت دەدات یان لێی دەکڕی, یاخود لەو بۆنە خۆشە دێت بەسەرتا, بەڵام دانیشتنت لای خاوەن کورەی ئاگرەکە یان جل و بەرگەکەت دەسوتێنێ یا بۆنی ناخۆش دێت بەسەرتا.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (**الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ وَلَه مَا اكْتَسَب**)[3]. واتە: هەموو کەس لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێت, واتە لە

---

[1] - حسن أخرجه أبو داود ( ٤٨٣٣ ) ، والترمذي ( ٢٣٧٨ ).

[2] - مُتَّفَقٌ عَلَيهِ, البخاري: ٥٥٣٤, مسلم:١٤٦.

[3] - مُتَّفَقٌ عَلَيهِ, أخرجه البخاري ٤٩/٨ ( ٦١٦٩ ) ، ومسلم ٤٣/٨ ( ٢٦٤٠ ) ( ١٦٥ ) ..

قیامەتدا لەگەڵ ئەو حەشر دەکرێ, هەر لەویشەوە شت وەردەگرێ و فێری هەموو جۆرە ئاكارو رەوشتێك دەبێت.

* هەوەها دەفەرموێت: ( **إيّاك وقرين السوء فإنّك به تعرف**) [١]. واتە: ئاگاداربە خۆت بەدووربگرە لە تێکەڵاوی هاوڕێی خراپ چونکە بەوا دەناسرێیت.

چەند بەجێیە پەروەردەکاران و باوك و دایك دەستبگرن بەو ئاراستەکردنە بەرزانەی کە ئیسلام دایناون, تا حاڵی منداڵەکانیان چاك بێت و رەوشت بەرز بن و لەناو کۆمەڵگەدا بە خاوەن ئەدەب بناسرێن, چاکەخواز بن, هیدایەت دەر بن, گەل و نەتەوە شانازییان پێوە بکەن, بەڵکو بەچاکی ئەوان کۆمەڵگەش چاك بێت, ئاشتی و ئارامی باڵ بکێشێ بەسەریا [٢].

**و- مامەڵەو رەفتاری خراپی باوك و دایك بەرامبەر بە منداڵان:**

زانایانی بواری پەروەردەو زانست یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر ئەگەرمنداڵ لەلایەن پەروەردەکارو باوك و دایکیەوە مامەڵەو رەفتاری خراپی لە گەڵدا کرا, توندو تیژیان نواند بەرامبەری, لێیانداو سوکایەتیان پێکرد, هەمیشە سەرزەنشتیان کرد, ئەوا بێگومان ئەو رەفتارانە دەرەنجامی خراپی دەبێت بۆسەر رەوشتی ئەو منداڵەو تووشی دڵەڕاوکێ دەبێت, جاری واش دەبێت سەر دەکێشێ بۆ خۆکوشتن یا کوشتنی دایك و باوکی, یان بەجێهێشتن و دوورکەوتنەوەی لە ماڵ بە هەمیشەیی, بۆ ئەوەی رزگاری ببێ لەو ئازار و ژان و ستەمەی لێی دەکرێت لە ماڵەوە.

شتێکی سەیر نیە ئەو جۆرە رەفتارانە منداڵ دەکاتە منداڵێکی چەقاوەسوو تاوانکەر لە ناو کۆمەڵگەدا, لادەرو نامۆ دەبێت بەژیان, ئەو کاتە لەسەر ئەو رەوشتە لارو چەوتانە پەروەردە دەبێ و گەشەدەکات!!.

---

[1] - رواه إبن عساكر.

[2] - زۆر بەداخەوە زۆربەی لادانی منداڵ بەهۆی هاوڕێی چەقاوەسوو لاسارەوەیە کەچی باوکان و دایکان گوێ نادەنە منداڵەکانیان بزانن هاوڕێیەتی کێ دەکەن لە قوتابخانەو دەرەوەی ماڵ, زۆر سەیرە ئەوانە ناترسن هاوڕێی منداڵەکانیان خەریکی خواردنەوەی مەی و عەرەق و تلیاك کێشان بن, یان ناترسن هاوەڵەکانیان زیناکەرو بەرەڵا بن ئەوانیش فێری ئەو رەوشت و کارە دزێوو ناپەسەندانە بکەن؟!!. وەرگێڕ.

ئیسلام بەو زانستە راست و دروستە هەمیشەییەی خۆیەوە, فەرمانی کردووە بەو کەسانەی بەرپرسیارێتی پەروەردەو ئاراستە کردنیان لە گەردندایە بە تایبەتی باوکان و دایکان کە خۆیان برازێننەوە بە رەوشتی بەرزو جوان, گاڵتەو گەپ بکەن لەگەڵ منداڵەکانیان, نەرم و نیان و بەسۆزو بەبەزەیی بن بەرامبەریان, تاکو نەشونما بکەن و رابێن لەسەر دامەزراوی و بوێری و کەسێتی سەربەخۆی خۆیان, هەروەها تا هەست بکەن کە خاوەن رێزن.

**ئەوەش ئێوەو ئەو ئاراستەکردنانەی کە ئیسلام دایناون بۆ رەوشت بەرزی و مامەڵەی بەسۆزو بەزەییانەو گاڵتەو گەپکردن لەگەڵ منداڵاندا:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ **إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى**﴾. **النحل٩٠.** واتە: بێگومان خوای پەروەردگار فەرمان بەدادگەری و چاکەکردن لەگەڵ تەواوی دروستکراوانیدا دەدات, تەنانەت لە کاتی تۆڵە سەندنیشدا, وە فەرمان بە بەخشش و پیاوەتی و چاکە لەگەڵ خزم و نزیکانیش دەدات.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ**﴾. **آل عمران١٣٤.** واتە: ئەوانەی رك و کینی خۆیان دەخۆنەوەو کاری پێناکەن و لە هەڵی مەردوم خۆشدەبن و تۆڵە ناسێنن, خواش خێرخوازانی خۆشدەوێت.

هەر لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿**وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً..**﴾. **البقرة٨٣.** واتە: لەگەڵ هەموو خەڵکدا قسەی چاك بکەن, رووخۆش بن, خورەوشتتان قەشەنگ و جوان بێت..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ **وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ..**﴾. **آل عمران١٥٩.** واتە: خۆ ئەگەر تۆ قسەرەق و بێ بەزەیی بویتایە ئەوە هەموو دەورو بەریان چۆڵ دەکردی..

* پێغەمبەری پێشەوامان صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (**إنَّ اللهَ رفيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأمْرِ كُلِّه**)[1]. واتە: خوای گەورە نەرم و نیانەو نەرم و نیانی لە هەموو کارێکدا خۆشدەوێت.

---

[1] - مُتَّفَقٌ عَلَيهِ أخرجه : البخاري ٢٠/٩ ( ٦٩٢٧ ) ، ومسلم ٤/٧ ( ٢١٦٥ ) ( ١٠ ).

* هەروەها دەفەرمویێت: (**إِذَا أَرَادَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِأَهْلِ بَيْتٍ خَيْرًا أَدْخَلَ عَلَيْهِمْ الرِّفْقَ, وإن الرفق لو كان خلقا لما رأى الناس خلقا أحسن منه, وإن العنف لو كان خلقا لما رأى الناس خلقا أقبح منه**)[1]. واتە: ئەگەر خوا ویستی چاکەو خێری بۆ هەر خانەوادەیەك هەبێت نەرم و نیانی دەخاتە نێوانیانەوە, ئەگەر نەرم و نیانی رەوشتێ بوایە ئەوا خەڵك لەوە رەوشتی جوانتریان نەدەدی, ئەگەر توندو تیژییش رەوشتێ بوایە ئەوا خەڵك لەوە رەوشتی خراپتریان نەدەدی.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (**رحم الله والداً أعان ولده على بره**)[2]. واتە: رەحمەتی خوا لەو باوکەی یارمەتی منداڵەکەی دەدات لە چاکەدا.

* هەروەها دەفەرموێت: (**الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمْ الرَّحْمَنُ ارْحَمُوا مَنْ فِي الْأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ الرَّحِمُ**)[3]. واتە: ئەوانەی بەبەزەیین خوای گەورە رەحمیان پێدەکات, بەزەیتان بێتەوە بەوانەی لەسەر زەویدان, ئەوەی لە ئاسمانە رەحمتان پێدەکات.

ئەمانە گرنگترین ئاڕاستەکرنەکانی ئیسلام بوون دەربارەی نەرم و نیانی, گوفتاری جوان و شیرین, کردارو مامەڵەی چاك, ئیتر هیچ نەماوەتەوە بۆ باوکان و دایکان تەنها ئەوەندە نەبێ شارەزای رێنمایی و ئاڕاستەکرنەکانی ئیسلام بن و, دەستیان پێوەبگرن و پەیڕەویان لێ بکەن, ئەگەر دەیانەوێ ژیانێکی خۆش بۆ منداڵەکانیان فەراهەمبهێنن و, دامەزراوبن و, خاوەنی رەوشتی گۆمەڵایەتی رەسەن بن.

بەڵام ئەگەر لەگەڵیان رێگای لارو وێر بگرنەبەر, کردارو مامەڵەیان توندو تیژ بێ, ئازارو سزای بەسۆو ستەمکارانەیان بدەن, ئەو کاتە بەو پەروەردەو ئاراستەکردنە هەڵەو خراپانەوە منداڵەکانیان دەخەنە ناو ژیانی دەردەسەری و ناخۆشەوە, چونکە ئەوان تۆوی ئەو لادان و هەڵهاتن و سزادانەیان رواندووە لە دەروونیاندا بەمنداڵی.

پیاوێك چووەتە خزمەتی عومەری کوڕی خەتاب رەزای خوای لێ بێ شکاتی کوڕەکەی لاکرد کە مافی باوکایەتی جێبەجێ ناکات و ئازاری دەدات, ئەویش

---

1 - رواه أحمد والبيهقي.

2 - رواه أبو الشيخ في الثواب, وقال الشيخ الألباني : ضعيف, سلسلة ضعيفة:١٩٤٦.

3 - قال الشيخ الألباني : صحيح, جامع الترمذي: ٣٢٣/٤ برقم: ١٩٢٤ , أبو داود: ٤٩٤١.

کوڕەکەی بانگکردوو ئاگاداری کردەوە لەو رەفتارانەی کە دژی باوکی کردبوونی, کوڕەکە وتی: ئەی پێشەوای موسڵمانان ئایا منداڵ مافی هەیە لەسەر باوکی؟ عومەر فەرموی: بەڵێ هەیەتی, وتی چییە؟ فەرموی: دایکێکی چاکی بۆ هەڵبژێرێت, ناوێکی چاکی لێ بنێت, فێری قورئان خوێندنی بکات. کورەکە وتی: ئەی پێشەوای موسڵمانان باوکم هیچ کام لەمانەی بۆ من نەکردووە, دایکم زنجیەو لە ئاگر پەرستەکانە, ناوی ناوم قالۆنچەو, یەك پیتی قورئانیشی فێرنەکردووم. عومەر لایکردەوە بەلای پیاوەکەداو فەرموی: هاتوی شکاتی کوڕەکەت کردووە کە ئازاری دەداویت و مافت جێبەجێ ناکات, کە تۆ پێش ئەو خراپەت دەربارە کردووەو مافت نەداوە؟!. بەو شێوەیە عومەر پیاوەکەی تاوانبارکرد چونکە پەروەردەی منداڵەکەی فەرامۆشکردبوو؟!.

جارێکیان مەعاویە رەزای خوای لێ بێ لە یەزیدی کوڕی تووڕە بوو ناردی بۆ لای زانای پایەبەرز ئەحنەفی کوڕی قەیس کە پرسیاری لێبکەن و بزانن بۆچوونی چییە دەربارەی پەروەردەی منداڵان, ئەحنەف گوتی: میوەو بەروبومی دڵمانن, کۆڵەکەی پشتمانن, گلێنەی چاومانن, ئێمە بۆ ئەوان زەمینێکی خۆشکراوو ئاسمانێکی پڕ سێبەرین, ئەگەر داوای شتیان لێکردی بیان دەیە, ئەگەر توڕەبوون رازییان بکە, بەخششی خۆتیان لێ مەگرەوە چونکە لێت بێزار دەبن و رقیان لێت دەبێتەوەو, ئاوات بۆ مردنت دەخوازن.

دەبا باوکان ودایکان لەم دوو بەسەرهاتە گرنگە پەندو ئامۆژگاری وەرگرن و مامەڵەو رەفتاریان چاك بکەن و بەبەزەیی بن بەرامبەر بەمنداڵەکانیان, گاڵتەو گەپیان لەگەڵ بکەن, نەرم و نیان و بەبەزەیی بن لەگەڵیان, رێگای راست و دروست بگرنەبەر بۆ ئاڕاستەو پەروەردەکردنیان.

**ع- تەماشاکردنی فلیمی بەرەڵایی و تاوانکاری:**

یەکێکی تر لەو هۆکارە گەورانەی زۆرجار دەبێتە هۆی لادانی منداڵ و, ئەیبەن بەرەو لاساری و تاوانکردن و شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووە سەرکەشەکان و بەدرەوشتی, بینین و سەیرکردنی فلیمی پۆلیسی و ئەو فلیمە رووت و بەرەڵانەیە کە

لەسەر شاشەی سینەماو تەلەفزیۆنەکان نمایش دەکرێن, کە ئافرەتانی بەرەڵاو داوێن پیس خۆیانی تێدا دەنوێنن و سەما دەکەن و خۆیان بەرووتی پیشانی خەڵك دەدەن بەناوی پێشکەوتن و مافی ئافرەتانەوە, هەروەها ئەوانەی کە لە دەزگاکانی راگەیاندنەوە بڵاودەکرێنەوە, وەك کتێب و گۆڤارو رۆژنامە کە باس لە چیرۆکی دڵداری و ئەو شتانە دەکەن کە دەبنە هۆی وروژاندنی ئارەزوو بەتایبەتی لای گەنج و لاوەکان و هاندەرن بۆ تاوانکردن و لادان, ئەمانە هەر هەموویان کاریگەری خراپیان بۆ سەر گەورەکانیش هەیە چ جای گەنج و لاوەکان و منداڵە بچوکەکان؟!.

شتێکی ئاشکراو روونە منداڵ کاتێك گەورە بوو فامیکردەوە ئەو وێنانە لە زەینیدا تەبع دەبێ و دێنەوە بیری, بێگومان لاساییان دەکاتەوە.. هیچ شتێك وەك بینینی ئەو فلیمانە کاریگەری خراپی نیە بۆسەر دەروونی منداڵی لاوو هەرزەکار, هاندەرن بۆ تاوانکردن و ئەیانبەن برەو خراپەو بەدرەوشتی, بەتایبەتی ئەگەر ئەو منداڵە رەشمەو جڵەوی لە دەست بەردابوو, چاودێریکەرو سەرەرشتیاری نەبوو.

ئەوەی دووکەس جیاوازیان لەسەری نیەو شتێکی بەڵگە نەویستە ئەوەیە وێنەی ژینگەی ئاوەهاو بینینی ئەو جۆرە فلیمانەو خوێندنەوەی ئەو کتێب و گۆڤاروانەی کە باس لە بەرەڵایی و ژیانی بێسەروبەرەیی دەکەن, ئەوەندە کایگەری گەورەو خراپیان دەبێت بۆسەر دەروونی منداڵ کە بەهیچ شێوەیەك ئامۆژگاری باوك و دایك و ئاراستەکردنی مامۆستاو پەروەردەکاران سوودیان پێ ناگەیەنێ.

ئیسلام بەو بیروباوەڕە پەروەردەییەی خۆیەوە بەرنامەی راست و دروستی لەبەردەم پەروەردەکاران و بەرپرسیاران و باوك و دایکدا داناوە بۆ پەروەردەو ئاراستەکردنی منداڵان و, هەستان بەئەرك و مافیان:

- لە بیروباوەڕەکانی ئەو بەرنامەیە: پاراستنیانە بەتەواوەتی لەو شتانەی کە دەبنە هۆی تووڕە بوونی خوای پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات و چوونە دۆزەخ, بە پەیڕەوکاری ئەم ئایەتە خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾. التحريم: ٦.** واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و خاوو خێزانتان بپاریزن لەو ئاگرەی سوتەمەنیەکەی بەرد و مرۆڤەکانە.

- یەکێکی تر لە بیروباوەڕەکانی ئەو بەرنامەیە: هەستکردنە بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر بەو کەسانەی کە مافی ئاراستەو پەروەردەکردنیان لە گەردندایە, هەستانە بەراپەراندنی ئەو ئەرکەی لەسەر شانیانە بەتەواوەتی و بەوپەڕی جوامێری و پیاوەتی, بۆ بەدیهاتنی ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (**والرجلُ راعٍ على أهل بيته وَ مسؤولٌ** عَنْ رَعيّتِه..)[1] واتە: پیاو شوانە لەناو خانەوادەکەیدا و بەرپرسە لە ژێردەستەکانی..

* لە بیروباوەڕەکانی ئەو بەرنامەیە: نەهێشتنی ئەو زیانانەیە کە دەبێتە هۆی لادانی منداڵان و خراپی عەقیدەو رەوشتیان, پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (**لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ**)[2]. واتە: با کەس زیان لە خۆی نەدات و زیانیش بە کەسی تر نەگەیەنێت.

لەبەر رۆشنایی ئەم بیروباوەڕە ئیسلامیانەو ئەو بەرنامە پەروەردەییە, واجبە لەسەر هەموو باوك و پەروەردەکارو بەرپرسیارێك منداڵەکانیان قەدەغەبکەن لە بینینی فلیمی پۆلیسی و ئەو فلیمانەی کە باس لە بێباوەڕی و بەدرەوشتی و خۆشەویستی و بەرەڵایی دەکەن, هەروەها بیان پارێزن لە کڕین و خوێندنەوەی ئەو کتێب و گۆڤارانەی کە باس لە دڵداری و بەرەڵایی و تاوان دەکەن.. بە کورتی واجبە لەسەریان نەهێڵن نزیك ببنەوە لەهەر شتێك زیان بگەیەنێ بە بیروباوەڕو عەقیدەیان و, پاڵیان پێوەبنێ بەرەو خراپەو تاوانکاری.

بە ویستی خوای گەورە لە بەندی بەرپرسیارێتی پەروەردەی ئیمانی و, بەرپرسیارێتی پەروەردەی رەوشتی, لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا (پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام)دا بەدرێژی باسی ئەو بیروباوەڕانە دەکەین کە ئیسلام دایناون بۆ پەروەردەی بیروباوەڕو رەوشتی منداڵ, بۆ ئەوەی بزانن ئەوانەی ئەیانەوێ فێربن و بزانن کە ئیسلام ئایینی ژیان و فیترەت و چاکەخوازی و پەروەردەیی و ئاراستەکردنە.

---

[1] - مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجه البخاري ٧/٤١ ( ٥٢٠٠ ) ، ومسلم ٦/٧ ( ١٨٢٩ ) ( ٢٠ ).

[2] - رواه مالك: ١٢٣٤, وقال الشيخ الألباني صحيح, إبن ماجة:٢٣٤٠, سلسلة الصحيحة: ٢٥٠.

خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾. **المائدة: ٥٠**. واتە: ئایا کێ حوکم و بڕیاری لە هی خودا جوان و چاکترە؟ لای کەسانێك کە بڕوای تەواویان هەیە.

**غ- بڵاوبوونەوەی بێکاری لەناو کۆمەڵگەدا:**

یەکێکی تر لەو هۆکارە سەرەکیانەی دەبنە هۆی لادانی منداڵ, بڵاوبوونەوەی بێکارییە لەناو تاکەکانی گەل و چینەکانی کۆمەڵگەدا.. ئەو باوکەی خاوەنی ژن و منداڵە, ریگای کارکردن ناگرێتەبەر, ئیش و کار نادۆزێتەوەو بژێوی ژیانی خێزانەکەی دابین ناکات, ئەوندەش ماڵ و سامانی نەبێت لە برسێتی بیانپارێزێت و تێریان بکات, ئەوا ئەو خێزانە بە هەموو تاکەکانیەوە تووشی بەرەڵایی و پەرش و بڵاوی و لەناو چوون دەبن, منداڵەکانیان لە رێگای راست لادەدەن و دەست دەکەن بە تاوانکردن, هەندێ جار بەتایبەتی سەرپەرشتیاری خێزان لەگەڵ ئەوانەی ئەرکی خێزان و منداڵیان لە ئەستۆدایە پەنا دەبەنەبەر کاری نامەشروع وەك دزی و بەرتیل وەرگرتن و زەوتکردنی ماڵی خەڵك, ئەوەش دەبێتە هۆی فەوزاو بێسەروبەرەیی لەناو کۆمەڵگەدا!.

ئیسلام بەو بیروباوەڕە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و چاودێریکردنی مافی تاك و کۆمەڵگەی خۆیەوە, چارەسەری کێشەی بێکاری کردووە بە هەموو جۆرەکانیەوە, جا ئیتر بێکاری ناچاری بێ یان بێکاری تەمەڵی و تەوەزەلی.

چارەسەری بێکاری ناچاری ئەوەی توانای کارکردنی هەیەو حەزی لە کارکردنە بەڵام کاری دەستناکەوێت, بەدووشت دەستەبەر دەبێت:

أ- واجبە لەسەر دەوڵەت کاری بۆ بدۆزێتەوەو رێگای کارکردنی بۆ دابین بکات.

ب- واجبە لەسەر کۆمەڵگە یارمەتی بدەن تاکو رێگای کارکردنی بۆ دابین دەکرێ.

ئەوەی کە دەڵێ واجبە لەسەر دەوڵەت کاری بۆ بدۆزێتەوە: ئەوەیە لەو بارەوە ئەنەس رەزای خوای لێ بێ فەرموی: **(أَنَّ رَجُلًا مِنْ الْأَنْصَارِ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُهُ فَقَالَ أَمَا فِي بَيْتِكَ شَيْءٌ قَالَ بَلَى حِلْسٌ نَلْبَسُ بَعْضَهُ وَنَبْسُطُ بَعْضَهُ وَقَعْبٌ نَشْرَبُ فِيهِ مِنْ الْمَاءِ قَالَ ائْتِنِي بِهِمَا قَالَ فَأَتَاهُ بِهِمَا فَأَخَذَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ**

بِيَدِهِ وَقَالَ مَنْ يَشْتَرِي هَذَيْنِ قَالَ رَجُلٌ أَنَا آخُذُهُمَا بِدِرْهَمٍ قَالَ مَنْ يَزِيدُ عَلَى دِرْهَمٍ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا قَالَ رَجُلٌ أَنَا آخُذُهُمَا بِدِرْهَمَيْنِ فَأَعْطَاهُمَا إِيَّاهُ وَأَخَذَ الدِّرْهَمَيْنِ وَأَعْطَاهُمَا الْأَنْصَارِيَّ وَقَالَ اشْتَرِ بِأَحَدِهِمَا طَعَامًا فَانْبِذْهُ إِلَى أَهْلِكَ وَاشْتَرِ بِالْآخَرِ قَدُومًا فَأْتِنِي بِهِ فَأَتَاهُ بِهِ فَشَدَّ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عُودًا بِيَدِهِ ثُمَّ قَالَ لَهُ اذْهَبْ فَاحْتَطِبْ وَبِعْ وَلَا أَرَيَنَّكَ خَمْسَةَ عَشَرَ يَوْمًا فَذَهَبَ الرَّجُلُ يَحْتَطِبُ وَيَبِيعُ فَجَاءَ وَقَدْ أَصَابَ عَشْرَةَ دَرَاهِمَ فَاشْتَرَى بِبَعْضِهَا ثَوْبًا وَبِبَعْضِهَا طَعَامًا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ تَجِيءَ الْمَسْأَلَةُ نُكْتَةً فِي وَجْهِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[1]. واته: پیاوێك له ئەنصار هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوای سواڵی کرد که شتێکی بداتیٚ, پێغەمبەری پێشەوا فەرموی: لەماڵەوە هیچتان نیە؟ وتی: پەلاسێك یان بەڕەیەکمان هەیە نیوەی دەخەینە ژێرمان و نیوەکەی تریشی دەدەین بەخۆماندا, دەفرێکیشمان هەیە ئاوی تێدا دەخۆینەوە, فەرموی: بڕۆ بیانهێنە, چوو له ماڵەو هێنانی, پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست بەدەستی موبارەکی خۆی هەڵیگرتن و فەرموی: کێ ئەمانەم لیٚ دەکڕێت؟ پیاوێك گوتی: من بە درهەمێك دەمەوێت, پێغەمبەری پێشەوا فەرموی: کێ بە زیاتر دەیەوێت؟ پیاوێکی تر گوتی: من بە دوو درهەم دەمەون, پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە دوو درهەمەکە فرۆشتی بە پیاوی دووەم و, دوو درهەمەکەی دا بە پیاوە ئەنصاریەکەو فەرموی: درهەمێکیان بدە بە خواردن بۆ منداڵەکانت و بەوی تریش تەورێك بکڕەو بۆم بهێنە, چوو تەورەکەی هێنا پێغەمبەری ئازیز بەدەستی موبارەکی خۆی کلکە تەورێکی تێخست و فەرموی: بڕۆ دار بیهێنەو بیفرۆشە تا ماوەی پانزە ڕۆژی تر نەتبینم, ئەویش ئاوەهای کردو له پاش پانزە ڕۆژەکە هاتەوە دە درهەمی پیٚ بوو, بە هەندێکی جل و بەرگی کڕی بۆ خاوو خێزانەکەی و ئەوی تریشی دا بەخواردن بۆیان, پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموی: ئائەوە باشترە بۆت نەك بێی دەست له خەڵك پان بکەیتەوەو له ڕۆژی قیامەتدا ببێتە پەڵەیەك بە نێوچاوانتەوە.

---

[1] - رواه أبوداود وانسائي والترمذي و إبن ماجة.

ئەوەی کە دەڵێ واجبە لەسەر کۆمەڵگە یارمەتی بدەن تاکو ڕێگای کارکردنی بۆ دابین دەکرێ: ئەوەیە لەو بارەوە ئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوەو گوتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لَا ظَهْرَ لَهُ وَمَنْ كَانَ لَهُ فَضْلٌ مِنْ زَادٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لَا زَادَ لَهُ)**[1]. واتە: هەر کەسێ وڵاغی سواری یان هەر شتێکی تر کە هاوڕێکانی پێویستیان پێیەتی زیاد لە پێویستی خۆی پێیە بابیدات بەو کەسەی پێویستیەتی, هەر کەسێ خواردنی زیادی پێیە بابیدات بەو کەسەی پێی نیە. واتە: هەر کەسێك وڵاخی بارهەڵگری زیادی پێیە با بیدات بەوەی کە پێی نیە, هەر کەسێك خواردنی زیادی پێیە با بیدات بەوەی پێی نیە.

* ئەنەسی کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ گێڕایەوەو کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **( ما آمن بي من بات شبعان وجاره جائع إلى جنبه وهو يعلم به)**[2]. واتە: ئیمانی نیە بەمن ئەو کەسەی شەو بەتێری سەربنێتەوە و دراوسێکەی برسی بێت لە تەنیشتیەوەو ئەویش ئاگای لە حاڵی بێت و یارمەتی نەدات ئەگەر توانای هەبوو.

هەر پیاوێ بەهەژاری و برسێتی بمرێ لەنێوان خەڵکانێکی دەوڵەمەندا, ئەوا ئەو دەوڵەمەندانە لە زیمەتی خواو پێغەمبەر دەچنە دەرەوە, چەسپاوە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەو بارەوە فەرمویەتی: **( أيما رجل مات ضياعاً بين أقوام أغنياء, فقد برئت منهم ذمة الله, وذمة الرسوله).**

لە کتێبی(الإختيار لتعليل المختار)دا هاتووە: ئەگەر یەکێك خواردن بدات بە هەژارێکی برسی و تێری بکات ئەوە تاوانەکەی لەسەر خەڵکانی تر نامێنێت.

چارەسەری بێکاری تەمەڵی و تەوەزەلی: ئەمەش ئەو کەسە دەگرێتەوە کە توانای کاکردنی هەیەو دەتوانێ کاربکات, بەڵام حەزی لە کارکردن نیە: ئەوەش بەوە دەبێت دەوڵەت چاودێری بکات ئەگەر زانیان بەقەستی کارناکات و بەتەمەڵی پاڵی

---

[1] - صحيح رواه مسلم: ١٢٥٨, مشكاة المصابيح: ٣٨٩٨/٢ .

[2] - رواه البزار والطبراني, تحقيق الألباني: (صحيح) انظر حديث رقم: ٥٥٠٥ في صحيح الجامع.

لێداوەتەوە, ئەوە ئامۆژگاری خێری دەکرێت کە ئیش بکات ئەگەر نەیکرد پێویستە بەزۆر پێی بکرێ و پابەندبێ پێوەی.

ئیبن جەوزی لە عومەری کوڕی خەتابەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: عومەر گەیشت بە کۆمەڵێك بە بێکاری لێی دانیشتبوون فەرمووی: ئێوە کێن وا کار ناکەن؟ وتیان: ئێمە پشتمان بە خوا بەستووە, فەرمووی: درۆدەکەن!.. ئەو پیاوە بەراستی پشتی بە خوا بەستووە کە تۆوی دانەێڵە دەکات بەژێر زەویەوەو پاشان پشت بە خوا دەبەستێ بۆ بەروبوومەکەی, هەروەها فەرمووی: با کەس لە ئێوە دانەنیشێ بە بێکارو داوای رزق و رۆزی لە خوا بکاو بڵێت: پەروەردگارا رۆزیم پێ ببەخشە, بێگومان ئەشزانێ کە لە ئاسمانەوە زێڕو زیو ناباریێ. هەر عومەری کوڕی خەتابیش بوو رەزای خوای لێ بێ بەوانەی کارناکەن و چاوەڕێی زەکات و خێرن فەرموو: ئەی کۆمەڵی هەژاران پێش برکێ بکەن هەوڵی کارکردن بدەن و ببەخشن چاوەڕێی دەستی کەس مەکەن و مەبنە بار بەسەر موسڵمانانەوە.

ئەوەی لە وتە بەنرخ و ئاراستەکردنەکەی پێشەوا عومەرەوە وەردەگیرێت ئەوەیە: کە زەکات بەخشین لە ئیسلامدا تەنها بۆ دەرکردنی پێویستیە, بۆ دابینکردنی کارکردنە, نەك ببێتە بانگەواز بۆ تەمەڵی و تەوەزەلی, هەروەها نابێ ببێتە هۆی پاڵدانەوە بەنیەتی پشت بەستن بەخوای پەروەردگار.

ئەگەر بێکاری بەهۆی نەخۆشی و پیری و پەککەوتەییەوە بوو, ئەوا واجبە لەسەر دەوڵەت چاودێری ئەوانە بکات, پێویستی ژیانیان بۆ دابین بکات لە پۆشاك خواردن و خوارنەوە بە شێوەیەکی گونجاو, ئیتر ئەو کەسانە موسڵمان بن یان بێباوەڕ بن.

ئەم رووداوەش بەڵگەیە بۆ ئەو راستیە کە ئەبو یوسف لە کتێبی(الخراج)دا ەیگێڕێتەوەو دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب رەزای خوای لێ بێ دای بەلای کۆمەڵێك ماڵدا سواڵکەرێکی پیری کوێری بینی داوای سواڵی دەکرد, لە دواوە قۆڵی گرت فەرمووی: تۆ ئەهل و شوێنکەوتەی کام نامەی ئاسمانیت؟ وتی: جولەکەم, فەرمووی: چی وای لێکردی سواڵ بکەیت؟ وتی: لەبەر پیری و پێویستی, داوای (الجزیە)باجم لێ دەکەن منیش پیربووم و ناتوانم کاربکەم, عومەر بردیەوە بۆ ماڵی خۆیان و شتێکی

دایە لە ماڵی خۆی, پاشان ناردی بۆ لای خەزنەدارو سەرکاری گەنجینەی دەوڵەت و پێی فەرموو: سەیری ئەمەو وێنەی ئەمانە بکەن, سوێند بەخوا ئێمە بەویژدان نەبووین لە گەڵیان, بە گەنجی لێمان وەرگرتوون ئەوا دەبێت ئێستا پێیان ببەخشینەوە, خێرو خێرات و زەکات بۆ نەدارو هەژارانە, ئەمەش لە هەژارانی ئەهلی کیتابە واتە خاوەن نامە ئاسمانیەکانە.

دەگێڕنەوە جارێکیان عومەری کوڕی خەتاب رەزای خوای لێ بێ دای بەلای کۆمەڵێك لە گاورەکاندا تووشی نەخۆشی گولی بوو بوون, فەرمانی دەرکرد لە گەنجینەی دەوڵەتی موسڵمانان ئەوندەیان پێ ببەخشن تا بەشی بژێوی ژیانیان بکات, چارەسەری نەخۆشیەکەیانی پێ بکەن, رێزو کەرامەتیان پارێزراو بێت.

وەك بینیت ئەمانەش ئەو رێگا چارانەبوون ئیسلام داینان بۆ نەهێشتنی کێشەی بێکاری, کە چارەسەریەکی حەکیمانەو دادپەروەرانەو بەبەزەیی و دڵسۆزانەیە, بەڵگەی روون و ئاشکران کە ئیسلام ئایینی مرۆڤایەتی و دادپەروەری و بەزەیی هاتنەوەیە, خوای گەورە ناردویەتی کە تیشکێکی درەوشاوەو رووناککەرەوە بێت بۆ هیدایەت و رێنمایی بەشەریەت, تاکو لە شەوزەنگی نەفامی رزگاریان بکات. . چەند جێگەی خۆیەتی کە نەفام بزانێت ئیسلام چییە؟ بۆچی خوای گەورە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم رەوانەکردووە بانگەواز بکات بە فەرمانی خواو چرایەکی درەوشاوەو هیدایەت دەربێ, مژدەدەرو ترسێنەر بێ.

**ف- فەرامۆشکردنی پەروەردەی منداڵ لەلایەن دایك و باوکەوە:**

یەکێکی تر لەو هۆکارە گەورانەی دەبێتە هۆی لادانی منداڵ و دەیبەن بەرەو لاساری و تاوانکردن و هەڵوەشانەوەی باری کەسێتی: فەرامۆشکردنی چاکسازی و ئاراستەکردن و پەروەردەکردنی منداڵە لەلایەن دایك و باوکەوە.

پێویستە لەسەرمان کە بێئاگا نەبین لە رۆڵی کاریگەری دایك لە هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتەو, هەستانی بە راپەڕاندنی ئەرکی سەرشانی بەرامبەر بە چاودێریکردن و ئاراستەکردن و ئامادەکردن و پەروەردەکردنی منداڵان.

**الأم مدرسة إذا أعددتها أعددت شعبا طيب الاعراق.**

واتە: دایك قوتابخانەیەكە ئەگەر ئامادەتكرد, ئەوا گەلێكی رەسەن و خاوەن رەوشتی باشت ئامادەكردووە.

دایك لە هەڵگرتنی ئەو بەرپرسیاریەتیەدا وەك باوك وایە: بەڵكو بەرپرسیاریەتی ئەو گرنگترە, بە ئیعتیباری ئەوەی منداڵ لە سەرەتاوە بەسراوە بەدایكیەوەو لەژێر چاودێری ئەودایە تادەگاتە تەمەنی لاوی و هەرزەكاری و دەتوانیٚ بە ئەركی سەرشانی خۆی هەستیٚ و دەبێتە پیاویٚ بەرگەی ئازارو مەینەتیەكانی ژیان بگریٚ.. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دایكی جیاكردۆتەوە لە هەڵگرتنی ئەو ئەرك و بەرپرسێتیەدا لە كاتێكدا دەفەرموێت: **(والمَرأةُ راعيّة في بَيتِ زَوجِها ومَسؤولَةٌ عَن رَعيّتِها..)** [1]. واتە: ژن شوانە لە ماڵی مێردەكەیدا و بەرپرسە لەو شتانەی لەژێر دەستیدایە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنیٚ كە دایك دەبێت یارمەتیدەری باوك بێت لە ئامادەكردن و پەروەردەكردن و پێگەیاندنی نەوەی نوێدا, دایك ئەگەر پەروەردەی منداڵەكانی فەرامۆشكرد لەبەر چوونە دەرەوەی لەماڵ و, خۆی سەرقاڵ كرد بە خزم و هاوڕێكانی و پێشوازیكردن لە میوانەكانی, , باوكیش ئەگەر ئارستەكردن و پەروەردەی منداڵەكانی فەرامۆشكرد, لەگەڵ هاوڕیٚ و برادەرەكانی كاتی بەتاڵی و بێكاری خۆی لە چاخانەو یانەكاندا بەشتی پڕوپوچ و بیٚ ماناوە بردەسەر.. ئەوا بێگومان منداڵەكانیان وەك هەتیو گەورەدەبن و, بە ئاوارەیی ژیان دەبەنەسەر, بەڵكو دەبنە هۆكاری تاوانكردن و ئاژاوەنانەوە بۆ هەموو گەل.

**ليس اليتيم من إنتهى أبواه من**
**همّ الحياة وخلفاه ذليلا**
**إنّ اليتيم هو الذي تلقى له**
**أمّاً تخلّت أو أبّا مشغولاً**

واتە: هەتیو ئەوە نیە بیٚ دایك و باوك و ریسوا بێت, بەڵكو هەتیو كەسێكە دایكی گوێی نەداتیٚ و پەروەردەی نەكات, باوكیشی سەرقاڵ بێت پەروەردەی فەرامۆش بكات.

---

[1] - مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجه البخاري ٤١/٧ ( ٥٢٠٠ ) ، ومسلم ٧/٦ ( ١٨٢٩ ) ( ٢٠ ).

دەی ئیتر چاوەڕێی چی دەکەیت لەو منداڵانەی کە ئەوە حاڵی دایك و باوکیان بێت لە کەموکوڕی نواندن بەرامبەر بە پەروەردەکردنیان؟!.

بەراستی لە لادان و تاوانکردن و ئاژاوەنانەوە زیاتر هیچیان لێ چاوەڕێ ناکرێ, ئەگەر دایك گوێی نەداتە منداڵەکەیی و پەروەردەی نەکات, باوکیش واجبی چاودێری و پەروەردەی فەرامۆش بکات.

لەوەش خراپتر ئەگەر باوك و دایك زۆربەی کاتیان بە بەرەڵایی و شتی پڕوپوچ و ئارەزووبازی بەرنەسەر.. بێگومان ئەوا لادانی منداڵ گەورەترو خراپترەو, بەرەو تاوانکردنی گەورەتری دەبەن.

**وليس النَبت ينبت في الجنان**

**كمثل النبت ينبت في الفلاة**

**وهل يرجى لأطفال كمال**

**إذا ارتضعوا من ثُدّيّ الناقصات.**

واتە: کشتوکاڵ و ڕووەك لەناو باخ باخات و زەری بەپیت وبەرەکەت و ئاودارردا سەوز بێت، قەت وەك ئەو کشتوکاڵە نیە لە بیابان و زەروی ڕەق تەقدا سەوز دەبێ، ئایا ئومێد بە منالانێك دەکەی چاك و بەرەوشت بن بە تەواوی، لە کاتێکدا بە شیری ناتەواوەکان گۆشکراون.

ئیسلام بانگەوازی بۆ هەڵگرتنی ئەو بەرپرسێتی و ئەمانەت و سپاردەیە کردووە, ئەرکی بەرپرسێتی گەورەی خستۆتە سەرشانی دایکان و باوکان بەرامبەر بەئامادەکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بەتەواوەتی بۆ ئەوەی بتوانن بەرگەی ناخۆشیەکانی ژیان بگرن, هەروەها هەڕەشەی سزای سەختی کردووە لەو دایك و باوکانەی کەموکوڕی و خیانەت و زێدەڕەوی ئەکەن لەو بارەوە: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ..**﴾. **التحريم: ٦**. واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و خاوو خێزانتان بپاریزن لەو ئاگرەی سوتەمەنیەکەی بەرد و مرۆڤەکانە..

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە زۆربەی ئامۆژگاریەکانیدا ئاماژەی داوەو

دووپاتی کردۆتەوە کە چاودێری و پەروەردەی منداڵان و هەستان بەراپەڕاندنی ئەرکەکانیان چەندە گەورەو گرنگەو زەرورە. ئەوەش ئێوەو چەند فەرمان و ئاراستەکردنێکی لەو بارەوە:

* **(والرجُل راعٍ في أهْلهِ بَيته وَ مَسؤولٌ عَن رَعيّتِهِ, والمَرأةُ راعيّة في بَيتِ زَوجِهَا ومَسؤولَةٌ عَن رَعيّتِها..)**[1]. واتە: پیاو شوانە لەناو خانەوادەکەیدا و بەرپرسە لە ژێردەستەکانی, ژنیش شوانە لە ماڵی مێردەکەیدا و بەرپرسە لەو شتانەی لەژێر دەستیدایە.

* **(أدبُو أولادكُم وأحسنوا أدبهم)**[2]. واتە: ئەدەبی منداڵەکانتان دابدەن بەچاکترین شێوە.

* **(علموا أولادكُم وأهليكم الخير وأدبهم)**[3]. واتە: منداڵەکانتان و خانەوادەکانتان فێری چاکەو ئەدەبی جوان بکەن.

***(مروا أولادكُم بإمتثال الآوامر, وإجتناب النواهي , فذلك وقاية لهم من النار)**[4]. واتە: منداڵەکانتان فێری پەیڕەوکاری فەرمانەکانی پەروەردگار بکەن, هەروەها دوورکەوتنەوە لەو شتانەی قەدەغەکراون, چونکە ئەوە دەبێتە هۆی پاراستنیان لە ئاگری دۆزەخ.

* **(أدبُو أولادكُم على ثَلاُث خِصال: حُب نَبيُكَم, وَ حُب آل بَيتِهِ , و تِلاوَةُ القُرآن فَإن حَمَلَةَ القُرآن في ظل عرش الله يوم لا ظِلّ إلا ظِله مع الأنبيائهِ وأصفيائهِ)**[5]. واتە: منداڵەکانتان لەسەر سێ رەوشت پەروەردەبکەن: خۆشەویستی پێغەمبەرەکەتانو خانەوادەکەیو خوێندنی قورئان, چونکە هەڵگرانی قورئان لەژێر سێبەری عەرشدان لەگەڵ پێغەمبەرانو پیاوچاکاندا لەرۆژێکدا کە جگە لەو سێبەرە هیچ سێبەرێکی تر نیە.

---

1 - مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجه البخاري ٤١/٧ ( ٥٢٠٠ ) ، ومسلم ٧/٦ ( ١٨٢٩ ) ( ٢٠ ).

2 - رواه إبن ماجة.

3 - رواه عبدالرزاق وسعيد إبن منصور.

4 - رواه عبدالرزاق وسعيد إبن منصور.

5 - ضعيف ,رواه الطبراني, سلسلة الأحاديث الضعيفة: (٢١٦٢).

له باسی بەرپرسێتی پەروەردەکاراندا لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا (پەروەردەی منداڵان له ئیسلام)دا بەدرێژی باسی لێوه دەکەین, تا بەویستی خوای گەوره ببێته شیفای دەردەداران و, تێرکردنی دەروون و فکریان.

**ق- مەینەتی و دەردەسەری هەتیوی:**

یەکێکی تر لەو هۆکاره گەورانەی دەبێته هۆی لادانی منداڵ: مەینەتی و دەردەسەری هەتیویه, له سەرەتای پشکوتنی تەمەنی و ئەو کاتەی پێشوازی له ژیان دەکات.. ئەو منداڵەی که له سەرەتای تەمەنیەوه باوکی دەمرێت و هەتیو دەکەوێت, ئەگەر دەستێکی دڵسۆزو بەبەزەیی نەبێت دەستی بگرێ و یارمەتی بداو خەمخۆری بێ, ئەگەر خزم و کەسوکاری چاکی نەبێت سەرپەرشتی و چاودێری بکەن و, له برسێتی رووت و رەجاڵی رزگاری بکەن.. بیگومان ئەو هەتیوه هێدی هێدی بەرەو لادان و لاساری و تاوانکردن دەڕوات, دەبێته ئامرازی تێکدان و رووخانی کیان و بوونی گەل و, نەهێشتنی یەکێتی و برایەتی و, بڵاوبوونەوەی بێسەرو بەرەیی و بەدرەوشتی و فەوزا له نێو نەوەکانی ئەو گەلەدا.

ئیسلام بەو شەریعەته جاویدانی و هەمیشەیی و ئاراستەکردنانەی خۆیەوه فەرمانیکردووه بەو کەسانەی خزمایەتیان هەیه لەگەڵ منداڵی هەتیودا دەبێ مامەڵەو رەفتاریان چاك بێ لەگەڵی, هەستن به ئەرکی سەرپەرشتیاری و بەخێوکردنی بەشێوەیەکی گونجاو, فێری ئەدەب و خورەوشتی بەرزو جوانی بکەن, تاکو لەسەر خێرو چاکه پەروەرده ببێ , رەوشت جوان بێ, نەفس بەرز بێت, ژیانێکی خۆش بگوزەرێنێت لەژێر سایەو سێبەری ئەو کەسانەدا که دڵسۆزانه چاودێری دەکەن و سۆزو بەزەییان هەیه بۆی .

**ئەوەش ئێوەو چەند رێنمای و ئامۆژگاریەکی ئیسلام که فەرماندەکەن به چاودێریکردنی هەتیوو, نواندنی سۆزو بەزەیی بەرامبەریان:**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ **وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَى قُلْ إِصْلاَحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ وَإِنْ تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ..** ﴾. **البقرة٢٢٠** . واته: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی هەتیوان, پێیان بڵێ: چاکسازی و پەروەردەکردنیان چاکترو پەسەندتره, خۆ ئەگەر تێکەڵاویان بکەن

ئەوانە براتانن..

هەروا دەفەرموێت: ﴿ فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ﴾. **الضحى٩.** واتە: کەواتە تۆش هەتیو مەچەوسێنەرەوە.

وە دەفەرموێت: ﴿ أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ* فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ﴾. **الماعون١-٢.** واتە: ئاخۆ دیت ئەو کەسەی بڕوای بە ئایین نیە, ئەوە کەسێکە کەپاڵ بە هەتیوەوە دەنێت.

هەر لە بارەی هەتیوەوە دەفەرموێت: ﴿ **إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْماً إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَاراً وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيراً**﴾. **النساء:١٠.** واتە: بەراستی ئەو کەسانەی کەماڵی هەتیوەکان دەخۆن بەستەم و ناڕەوا, ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن, ئەو ماڵە دەبێتە ئاگر لە سکیاندا, لە قیامەتیشدا دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

* پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: **(مَنْ وَضَعَ يَدَهُ عَلى رَأْسَ يَتِيمٍ رَحمَة, كتب الله بِكُلِّ شَعْرَةٍ مَرَّتْ عَلَيْهَا يَدُهُ حَسَنَةٌ)**[1]. واتە: هەر کەسێ بەزەیی بێتەوە بە هەتیوداو دەست بهێنێ بەسەریا, بۆ هەموو تاڵە موویەکی سەری ئەو هەتیوە کە دەستی ئەو کەسەی بەر کەوتووە, خوای گەورە چاکەیەك بۆ ئەو کەسە دەنوسێ.

* وە دەفەرموێت: **(مَنْ قَبَضَ يَتِيمًا مِنْ بَيْنِ الْمُسْلِمِينَ إِلَى طَعَامِهِ وَشَرَابِهِ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ إِلَّا أَنْ يَعْمَلَ ذَنْبًا لَا يُغْفَرُ لَهُ)**[2]. واتە: هەر کەسێك هەتیوێك بگرێتەخۆی لە نێو موسڵمانانداو خواردن و خواردنەوەی بداتێ, تا خوای گەورە دەوڵەمەندی دەکات, ئەوا خوای پەروەردگار بەهەشتی هەتا هەتایی بۆ مسۆگەر دەکات, مەگەر تاوانێکی گەورەی وای ئەنجامدابێ شایەنی لێخۆشبوون نەبێت.

* هەروەها دەفەرموێت: **(أنا وكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ كَهَاتَيْنِ, وَأَشَارَ بأصبَعيه بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى)**[3]. واتە: من و بەخێوکەری هەتیو لە بەهەشتدا وەك ئەم دوو

---

[1] - رواه أحمد في مسنده: ١٢٧/٤٥ برقم: ٢١١٣٢ , و إبن حبان.

[2] - قال الشيخ الألباني: ضعيف, جامع الترمذي: ٣٢٠/٤ برقم: ١٩١٧.

[3] - أخرجه البخاري ٦٨/٧ ( ٥٣٠٤ ) .

پەنجەیە پێکەوەین, ئاماژەی بەدوو پەنجەی خۆی کرد.

ئەمانەو چەندەها فەرمانیی ترێ خوای پەروەردگارو, ئاراستەکردنەکانی پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم, کە دەیسەلمێنن چاودێری و بەخێوکردنی هەتیوو پەروەردەکردنی واجبە لەسەر خزم و کەسەوکارەکانی.. لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەوانیش توانای ماڵییان نەبوو ئەوە ئەو کاتە واجبە لەسەر دەوڵەت بەخێویان بکا و, سەرپەرشتی و چاودێریان بکا, ئەوەش دەبێتە هۆی پاراستن و دوورکەوتنەوەیان لە فەرامۆشکردن و لادان و سەرگەردانیان.

ئەوانەی لە پێشەوە باسکران ئەو هۆکارە سەرەکیانە بوون کە بوونە هۆی لادانی منداڵ, وەك بۆت دەرکەوت چەند هۆکارێکی زەرەمەندو ترسناك بوون, ئەگەر پەروەردەکاران ئەو هۆکارانە لە ریشە دەرنەکێشن و, دەستنەگرن بەو چارەسەریە سەرکەوتووەی کە ئیسلام دایناوە بۆ چاکسازی و پەروەردەکرن, ئەوا منداڵان لەسەر بەدرەوشتی و تاوانکردن نەشونما دەکەن و پێدەگەن.. بەڵکو دەبنە هۆی رروخان و دارمانی کیان و بوونی کۆمەڵگەو, نەهێشتنی ئاشتی و ئارامی بۆ بەشەرەیەت. ئیتر ئەو کاتە زۆر بەزەحمەت دەگەڕێنەوە بۆ سەر رێگای راست و خێرو چاکەو هیدایەت.

چەند جوان و بەجێیە پەروەردەکاران و باوك و دایك لەسەر ئەو سوننەت و بەرنامە راست و دروستەی ئیسلام هەنگاو هەڵگرن بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانیان, چارسەری لادانیان, راستکردنەوەی لارو چەوتیەکانیان, چاکسازی دەروونیان, جێگیربوونی بیروباوەڕو عەقیدەیان و, راهێنانیان لەسەر خێرو چاکەو رەوشتی بەرز.. تاکو بەچاوی خۆیان بیبینن منداڵەکانیان رۆحیان پاك بێ وەك مەلائیکە, دەروونیان ساف و بیگەردبێ, پەیڕەوکاری فەرمانەکانی پەروەردگاریان بن.. بەڵکو ببینن ببنە پێشەنگی چاك بۆ کەسانی تر لە هەموو کارەو کردەوەیەکی چاکە و, وەبەرهێنان و قوربانیداندا.

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەپاڕێینەوە لە پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات و میهرەبان منداڵەکانی ئیسلام چاك و سەرکوتوو بەختەوەر بکا, ئیمانێکی وایان پێ ببەخشێ هەست بە شیرینیەکەی بکەن لەدڵیاندا, هەمیشە لەسەر رێگای راست بن, کارو کردەوەو رەفتارەکانیان ببێتە نەخشەیەك بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی

ڕەسەن و شارستانیەتیەکی بەهێزو شکۆمەندو, بڵاوکردنەوەی زانست, بەهێزی بازوویان ئاڵای سەربەرزی و سەرکەوتن هەڵکەن, ڕەوڕەوەی مێژوو بگۆڕن, کیان و شکۆمەندی و سەربەرزی بگێڕنەوە بۆ ئەم گەلە بەشخوراوە کە دەمێکە مافی زەوتکراوە, ئەوەش لای خوا قورس و گران نیە, هەر ئەویشە شایەنە بە وەڵامدانەوەو چاکترین سەرپەرشتیارە. لە کۆتاییدا سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان.

# بەشی دووەم:
# بەرپرسیارێتی پەروەردەكاران

## پێشـــەكیی

یەكێك لە دیارترین بەرپرسیارێتیەكان كە شتێكی بەرچاوەو ئیسلام زۆر گرنگی پێداوەو, خەڵكی بۆ هانداوەو پێی لەسەر داگرتووەو.. بەرپرسیارێتی پەروەردەكارانە بەرامبەر بەوانەی ئەرك و مافی فێركردن و ئاڕاستەكردن و پەروەردەكردنیان لە ئەستۆدایە.. لەراستیدا بەرپرسیارێتیەكی گەورەو گران و گرنگە.. لەبەر ئەوەی لەسەرەتای منداڵیەوە دەست پێدەكات تا تەمەنی هەرزەكاری و لاوێتی, تاكو دەبێتە كەسێكی باڵغ و تەكلیفی شەرعی دەكەوێتە سەر.. هیچ گومانی تێدا نیە ئەگەر پەروەردەكار مامۆستا بێت یا دایك و باوك یان سەرپەرشتیارێكی كۆمەڵایەتی بێت.. كاتێ بەئەمانەتەوە هەستان بەو بەرپرسیارێتیە بەتەواوی بەو شێوەیەی كە ئیسلام دایناوەو نەخشەی بۆ كێشاوە.. هەروەها هەموو هەوڵ و تەقەلایەكیان بخەنەگەڕ بۆ پێگەیاندنی نەوەیەكی نوێ بەهەموو شێوازێكی تایبەتی و هۆكارە بەبەهاكانی و سیفەتە چاكەكانیەوە, پاشان هەر بەو شێوەیەش خێزانێكی ناوازەو نمونەیی پێكدێنن, ئەو كات كۆمەڵگەیەكی نمونەیی بونیاد دەنێن بەهەموو ئەو شێوازە نایابانەوە, چونكە ئەو كۆمەڵگەیە لە تاك و خێزانی چاك و پەروەردەكراو پێكهاتووە.. ئەوەش ئەو چاكسازی و خێرو بێرەیە كە ئیسلام دەیەوێت بۆ بەندەكانی خوا.

ئەگەر ئێمەی موسڵمان شوێن ئایەتە پیرۆزەكانی قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بكەوین و پەروەردەكارانێكی وەها ئامادەكەین هەستن بەئەركی بەرپرسیارێتی خۆیان, بیان ترسێنین و ئاگادارییان بكەینەوە لە زیانەكانی كەموكوڕیان لەو بوارەدا.. ئەگەر شوێن ئەو ریگایە كەوتین و شتی زۆر لەوە گەورەتر بەدەست دەهێنین كە لە ژمارە نەیەن لەوەی كە دامانابوو, ئەمەش هەر

لەبەر ئەوەیە تاکو هەموو پەروەردەکارو باوك و دایکیّ بزانیّت بەرپرسیّتی و ئەمانەتیّکی گەورەو گرانی لە ئەستۆدایە.

**لەو ئایەتە پیرۆزانە:**

خوای گەورە دەفەرمویّت: **﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا..﴾. طه : ١٣**. واتە: فەرمان بدە بە خیّزان و کەسەکانت بۆ نویّژ کردن, خۆشت هەولّ بدە کە زۆر بە صەبر و خۆراگر بیت لەسەری..

- **﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ..﴾. التحريم: ٦**. واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هیّناوە خۆتان و خاوو خیّزانتان بپاریزن لەو ئاگرەی سوتەمەنیەکەی بەرد و مرۆڤەکانە..

- **﴿ وَ لَتُسئَلُنَّ عَمَّا كُنتُم تَعمَلُنَ﴾. النحل: ٩٣**. واتە: بە بیّگومان لە قیامتدا لە سەر کردەوەکانتان موحاسەبە دەکریّن.

- **﴿ يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾. النساء: ١١**. واتە: خودا سەبارەت بە منداڵەکانتان وەسیەتتان بۆدەکات و ریّنوماییتان دەکات لە بواری میراتگرتندا کە بەشی نیّرینەیەك ئەندازەی بەشی دوو میّینەیە.

- **﴿ وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾. البقرة: ٢٣٣**. واتە: دایکان با تا دوو ساڵی تەواو شیر بدەن بە منداڵەکانیان..

- **﴿ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ..﴾. الممتحنة: ١٢**. واتە: با منداڵەکانی خۆیان نەکوژن..

- **﴿..وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ﴾. الصافات: ٢٤**. واتە: ئادەی بیان وەستیّنن لیّپرسینەوەیان لەسەرە.

ئەم ئایەتانەو چەندەها ئایەتی تر.

**وە لەو فەرمودە پیرۆزانە:**

* **(والرجُل راعٍ في أهْلهِ بَيته وَ مَسؤولٌ عَن رَعيّتِه, والمَرأةُ راعيّة في بَيتِ زَوجِهَا ومَسؤولَةٌ عَن رَعيّتِها..)** [1] . واتە: پیاو شوانە لەناو خانەوادەکەیدا و بەرپرسە لە

[1] - مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجه البخاري ٤١/٧ ( ٥٢٠٠ ) ، ومسلم ٧/٦ ( ١٨٢٩ ) ( ٢٠ ).

ژێردەستەکانی, ژنیش شوانە لە ماڵی مێردەکەیدا و بەرپرسە لەو شتانەی لە ژێردەستیدایە.

* **(لَأَنْ يُؤَدِّبَ الرَّجُلُ وَلَدَهُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِصَاعٍ)**[1] . واتە: ئەگەر پیاو منداڵەکەی فێری ئەدەبی جوان و رەوشتی بەرز بکات چاکترە لەوە بەپێوانە ببەخشێت بە فەقیر و هەژاران لەبەر رەزامەندی خوا.

* **(مَا نَحَلَ وَالِدٌ وَلَدًا مِنْ نَحْلٍ أَفْضَلَ مِنْ أَدَبٍ حَسَنٍ)**[2] . واتە: هیچ باوکێك شتێکی نە بەخشیوە بە منداڵەکەی چاکتر بێت لە ئەدەبی جوان.

* **(علموا أولادكُم وأهليكم الخير وأدبهم)**[3] . واتە: منداڵەکانتان و خانەوادەکانتان فێری چاکەو ئەدەبی جوان بکەن.

* **(أدبُو أولادكُم عَلَى ثَلَاثِ خِصَالٍ: حُب نَبيُكَم, وَحُب آل بَيتِهِ, وتِلاوَة القُرآن)**[4] واتە: منداڵەکانتن لەسەر سێ رەوشت پەروەردە بکەن: خۆشەویستی پێغەمبەرەکەتان و, خانەوادەکەی و, خوێندنی قورئان.

* ئەبو سولەیمانی کوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ گێڕایەوەو فەرموی: کۆمەڵێك لاوی هاوتەمەن لە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بیست رۆژێ ماینەوە هەستی کرد بیری ماڵ و منداڵەکانمان دەکەین, دەربارەیان پرسیاری لێ کردین, ئێمەش باسی حاڵ و گوزەرانی ئەوانمان بۆ گێڕایەوە, ئەویش زۆر بە رەحم و بە بەزەیی بوو, فەرمووی: **(إرجِعُوا الى أهليكُم فَعلِمُهُم وَمَروهُم, صَلُوا كَما رَأيْتُمونِي أُصّلِي فإذا حَضَرَت الصّلاة فَلَيُؤَذِن لَكم أحَدُكُم ولِيَؤُمَّكُم أكْبَرُكُم)**[5] . واتە: بگەڕێنەوە بۆ ناو خانەوادەو منداڵەکانتان فێریان بکەن و فەرمانیان پێبکەن, نوێژ بکەن بەو شێوەیەی کە من دەبینن دەیکەم, کاتی نوێژ هاتە پێشەوە با یەکێکتان بانگ بدات و

---

1 - أخرجه الترمذي:٣٣٧/٤ رقم: ١٩٥١, والحاكم: ٤٦٢/٤, وأحمد ٩٦/٥.

2 - رواه البخاري في التأريخ الكبير: ٤٢٢/١ برقم ١٢٥٦, وأخرجه الترمذي: ٣٣٨/٤.

3 - رواه عبدالرزاق وسعيد إبن منصور.

4 - ضعيف ,رواه الطبراني, سلسلة الأحاديث الضعيفة: (٢١٦٢).

5 - قال الشيخ الألباني: صحيح, الأدب المفرد: ٨٤/١ برقم: ٢١٣.

گەورەترینتان پێش نوێژیتان بۆ بکات.

* **(لا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَومَ القِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَ أفنَاهُ ؟ وَعَنْ عِلمِهِ فِيمَ فَعَلَ فِيهِ ؟ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أيْنَ اكْتَسَبَهُ ؟ وَفِيمَ أنْفَقَهُ ؟ وَعَنْ جِسمِهِ فِيمَ أبلاهُ)**[1]. واته: بەندە لە ڕۆژی قیامەتدا لە بەردەم دادگای خوادا ڕادەوەستێنرێت لە شوێنی خۆی ناجولێت تا سێ پرسیاری لێدەکرێت: تەمەنەکەی لەچیدا بەسەر برد, زانست و زانیاریەکەی لە چیدا بەکار هێنا, ماڵ و سامانەکەی چۆن پەیدا کرد و لە چیدا خەرجیکرد, ئەو جەستەیەی خوا پێی بەخشیبوو چۆن و لە چیدا بە کاری هێنا تاچووە ناو گۆڕو ڕزی.

ئەمانە و چەندەها فەرمودەی تر.

هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەت و فەرموودانە بووە پەروەردەکاران گرنگی زۆریان داوە بە پەروەردەی منداڵان نەوە لە دوای نەوە, هەڵەکانیان بۆ ڕاست کردوونەتەوە.. بەڵکو دایکان و باوکان چاکترین مامۆستاشیان بۆ هەڵبژاردوون تا پەروەردەیان بکەن.. بۆ ئەوەی هەستن بە ئەرکی سەرشانیان بەشێوەیەکی ڕاست و دروست, لەسەر بنەمای بیروباوەڕو عەقیدەو ڕەوشت و ڕینمایی و ئامۆژگاریەکانی ئیسلام.

ئەوەش ئێوەو چەند بەسەرهاتێکی دانسقەی پێشینە چاکەکان لەو بارەوە, بەڵکو ببێتە بۆ هەموو خاوەن عەقڵ و بەرچاو ڕونێ کە چۆن پێشینە چاکەکان گرنگیان داوە بەپەروەردەی منداڵەکانیان, سوربوونیان لەسەر شارزاکردنیان و ئەدەب دادانیان, وە چۆن مامۆستای چاکیان بۆ هەڵبژاردوون تا پەروەردەیان بکەن و فێری ڕەوشتی جوانیان بکەن؟:

- **(جاحظ)** لە عوقبەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کاتێك کە عوقبە منداڵەکەی برد بۆ لای مامۆستایەك تاکو ئەدەبی جوانی فێربکات بە مامۆستاکەی فەرموو: پێش ئەوەی منداڵەکەی من پەروەردە بکەیت یەکەم شت خۆت چاك بکە, چونکە ئەوان چاو لە تۆ دەکەن, چاك لای ئەوان ئەوەیە تۆ بەچاکی

[1] - صحيح أخرجه الترمذي: ( ٢٤١٧).

دەزانیت, خراپەش لای ئەوان ئەوەیە تۆ بە خراپ و ناپەسەندی دەزانیت, ژیان نامەو بەسەرهاتی فەرمانڕەواو پاشاکانیان بۆ باس بکە, رەوشتی ئەدیبانیان فێربکە, بە من بیانترسێنە, بەبێ منیش رەوشتی جوانیان فێربکە, وەك ئەو پزیشکە وابە پەلە ناکا لە دەرمان دان بە نەخۆش هەتا نەزانێ دەردو نەخۆشیەکەی چییە؟ پشت بە بەهانەی من مەبەستە, چونکە من پشتم بە تەواوی و بێ کەموکوڕی تۆ بەستووە.

- ئیبن خەلدون لە موقەدیمەکەیدا دەگێڕێتەوەو دەڵێ: هارونە رەشید کاتێك ئەمینی کوڕی برد بۆ لای مامۆستاکەی تا فێری ئەدەب و خورەوشتی بەرزو جوانی بکات, پێی فەرموو: ئەی(أحمر!) هارونە رەشید بەرهەمی دڵ و گیانی خۆی هێناوەتە بەردەستی تۆ, تۆش بەشێوەیەکی جوان و بەساناییی دەستت بەسەریەوە بێت, لە سەرئەیش پێویستە گوێرایەڵیت بکات, تۆش بەو شێوەیەبە پێشەوای ئیمانداران گومانی پێ بردووی.. قورئانی فێربکە بەرەوانی, شارەزای ژیانی هاوەڵانی بکە, شیعری جوان و رەوانی بۆ بخوێنەوە, فێری سوننەتەکانی بکە, شارەزای شوێن و کاتی قسەکردنی بکە کە چۆن پێی هەستێ, رێگری بکە لە پێکەنین تەنها لە کاتی خۆیدا نەبێت.. هیچ کاتێك تێ نەپەڕێ بەسەریا سوودێکی پێ نەگەیەنی, بە نەرم و نیانی هەڵەکانی راستکەرەوە, ئەگەر ملی نەدا توندوتیژ بە لەگەڵی.

- پێشینە چاکەکان گرنگی زۆریانداوە بە منداڵان و سوربوون لەسەر پتەوی پەیوەندیان بە مامۆستاکانیانەوە, ئەگەر لێیان دوور بوونایە لەبەر هەر هۆیەك بوایە زۆر دڵگران دەبوون و خەفەتی زۆریان پێ دەخوارد, دەترسان لەوەی منداڵەکانیان بەشێوەیەك پەروەردە نەکرێن کەخۆیان دەیانەوێ و پێیان خۆشە..

- راغبی ئەسفەهانی خەلیفە مەنصورەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: خەلیفە مەنصور ناردی بۆ لای ئەو ئەمەویانەی لە زیندانەکانی ئەواندا بوون پێیان بڵێن: چی زۆر نارەحەتی کردوون لە زینداندا؟ ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان: تەنها پەروەردەی منداڵەکانمان کە لەدەستمان دەرچووە!!.

- عەبدول مەلیکی کوڕی مەروان ئامۆژگاری مامۆستای کوڕەکەی دەکات و دەڵێت: فێری راستگۆییان بکە وەك چۆن فێری قورئان خوێندنیان دەکەیت, ئاکارو

ڕەوشتی جوانیان فێربکە, شیعری جوان و پاراویان بۆ بخوێنەرەوە با بەغیرەت و چاونەترس و چالاك بن, بیانبە بۆ کۆڕی زانایان و پیاو ماقوڵان و دایان نیشێنە, دووریان بخەرەوە لە کۆڕی ڕەوشت نزم و بێ ئەدەبان, چونکە ئەوانە خاوەنی ناشیرین ترین ڕەوشت و ئەدەبن.. لە ئاشکرادا بە ویقاربە لەگەڵیان, لە پەنهانیشدا ئاگاداریان بە, لەسەر درۆکردن لێیان بدە, چونکە درۆ دەیانبات بەرەو کارو کردەوەی ناپەسەند و لادان و خراپەکاری, سەرەنجام دەیانبات بەرەو ئاگری دۆزەخ..

- حەجاج بە مامۆستای منداڵەکانی گوت: فێری مەلەوانیان بکە پێش ئەوەی فێری نووسینیان بکەیت, چونکە ئەتوانن کەسانێك بدۆزنەوە بۆیان بنووسن, بەڵام جیاتی ئەوان مەلەوانی ناکرێت.

- یەکێك لە پاشاو فەرمانڕەواکان بەمامۆستای منداڵەکەی گوت: لە زانستێکەوە مەیانبە بەرەو زانستێکی تر تابە جوانی فێری نەبن, چونکە گوێگرتن بۆ قسەی زۆرو کەڵەکەبوونی لە بیرو ئەندێشەیاندا مانای چاك تێگەیشتن نیەو سەریان لێ تێکدەدات.

- عومەری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لێ بێ نووسی بۆ خەڵکی شام و پێی فەرموون: منداڵەکانتن فێری مەلەوانی و تیرهاوێژی و ئەسپ سواری بکەن.

- ئیبن سینا لە ئامۆژگارییە بەنرخ و بە بەهاکانیدا بۆ پەروەردەی منداڵان دەڵێت: پێویستە منداڵ لەقوتابخانەکەیدا منداڵی بەئەدەب و بە ڕەوشتی لەگەڵدا بێت, لە هەڵسوکەوتیان ڕازی بن, چونکە منداڵ لە منداڵانی ترەوە خوڕەوشت و ئەدەب وەردەگرێت, ئەویش هاودەم و هاوڕازیەتی و هۆگری دەبێت.

- هیشامی کوڕی عەبدول مەلیك گوتی بە مامۆستای کوڕەکەی کە ناوی سولەیمانی کەلبی بوو: ئەم کوڕەم خۆشەویستمەو چاوی منە, دەیدەمە دەست تۆ بۆ ئەوەی ئەدەبی جوانی فێربکەیت, لەخوا بترسە, ئەمانەت بپارێزە, یەکەم ئامۆژگاریم بۆ تۆ ئەوەیە فێری قورئان خوێندنی بکە بەرەوانی, شیعری چاك و پاراوی شاعیرە بەرزەکانی عەرەبیان بۆ بخوێنەرەوە تا بەجوانی فێری زمانی عەرەبی بن و لێی تێبگەن, حەڵاڵ و حەرامیان فێر بکە, شارەزای وتارو غەزاو جەنگەکانیان بکە..

ئەمانە چەند دڵۆپێك بوون لە دەریای بێ پایانی گرنگیدانی تایبەتی بە بواری

پەروەردەو بەرپرسیارێتی لە ئیسلامدا, هەروەها لە هەڵبژاردنی مامۆستای چاك و نمونەیی کە شارەزای بنەماکانی ئاراستەکردن و بیروباوەڕی پەروەردەیی راست و دروست و بێ بەکردەوە, چونکە بەرپرسیارن لێیان و ئەمانەتن لەبەردەستیاندا, لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ لەسەر فەرامۆشکردن و کەموکوڕی لە پەروەردەکردن و فێرکردنیاندا..

لەبەر ئەوەی پەروەردەکاران لە باوکان و دایکان و مامۆستایان.. بەرپرسن لە پەروەردەکردنی منداڵان و, ئامادەکرن و پێگەیاندنیان بۆ ژیان.. بۆیە پێویستە لەسەریان بەڕوونی سنوری بەرپرسێتی خۆیان شارەزا بن لە هەموو بوارەکاندا بە تەواوی مانای بەرپرسێتی رەسەن و جوامێرانە, تاکو بتوانن بە تەواوی مانا هەستن بەو ئەرکە قورسەی لە ئەستۆیاندایە..

گرنکترینی ئەو بەرپرسێتیانەش لە روانگەی زۆربەی پەروەردەکارانەوە ئەمانەی لای خوارەوەن:

١ - بەرپرسیارێتی پەروەردەی ئیمانی.
٢ - بەرپرسیاری پەروەردەی رەوشتی.
٣ - بەرپرسیارێتی پەروەردەی جەستەیی.
٤ - بەرپرسیاریی پەروەردەی ئەقڵی.
٥ - بەرپرسیارێتی پەروەردەی دەروونی.
٦ - بەرپرسیارێتی پەروەردەی کۆمەڵایەتی.
٧ - بەرپرسیارێتی پەروەردەی جنسی.

ئێمەش لەم بەندانەدا بەویستی خوای گەورە لە هەموو لایەنەکانی ئەم بەرپرسێتیانە دەدوێین, مەبەستمان پێی رەزامەندی خوایە, داوای یارمەتی و کۆمەکی و سەرکەوتن هەر لەو دەکەین.

## بەندی یەکەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی ئیمانی

مەبەست لە پەروەردەی ئیمانی ئەوەیە منداڵ کاتێك فامیکردەوە پەیوەست بکرێت بەبنچینەو بناماکانی ئیمانەوە, تێبگەیەنرێت و رابهێنرێت لەسەر روکنەکانی ئیسلام و بنەماو دروشمەکانی شەرعی پاك و بێگەرد..

**مەبەست لە بنچینەکانی ئیمان:**

هەر شتێکە چەسپاو بێ لە رێگەی هەواڵی راستەوە لە هەقیقەتە ئیمانیەکان و, کارو بارە غەیبی و نادیارەکانی وەك: ئیمان بەخوا, بەمەلائیکەکان, بەنامە ئاسمانیەکان, ئیمان بەهەموو پێغەمبەران, ئیمان بەپرسیارو وەڵامی دوو مەلائیکەکەی ناوگۆڕ, بەسزای ناو گۆڕ, بە زیندووبوونەوە, ئیمان بە موحاسەبە و لێپرسینەوە, بە بەهەشت, بە دۆزەخ.. هەروەها بەشتە غەیبی و نادیارەکانی تر..

**مەبەست لە پایەکانی ئیسلام:**

هەموو ئەو پەرستشانە دەگرێتەوە کە بەماڵ و سامان و جەستە ئەنجامدەدرێن وەك: نوێژ , رۆژوو, زەکات, حەجکردن بۆ کەسێك توانای هەبێ.

**مەبەست لە بیروباوەڕی شەرع:**

هەر شتێکە بەسرابێتەوە بە بەرنامەی پەروەردگارەوە, فێربوونی عەقیدەو, بەندایەتی , رەوشت, بڕیاردانی شەرعی, دەستورو, یاساو ئەحکامەکان..

پێویستە لەسەر سەرپەرشتیارو پەروەردەکار لەسەرەتاوە منداڵەکانیان رابهێنن لەسەر چەمکەکانی پەروەردەی ئیمانی, هەر لەسەر ئەو بنەمایەش زانستەکانی تری ئایینی ئیسلامیان فێربکەن.. تاکو پەیوەست بن بەئیسلامەوە لەرووی بیروباوەڕو پەرستش و, رێبازو بەرنامەو یاساو رێساکانەوە, تاکو لەدوای ئەم پەروەردەو ئاراستانەوە جگە لە ئیسلام شوێنی هیچ بەرنامەو یاساو رێسایەك نەکەون, جگە لە قورئان هیچ شتێك نەکەنە پەیڕەوو پرۆگرام, جگە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ کەسێك نەکەنە رابەر و پێشەنگ بۆ خۆیان.. [١].

---

[1] - بۆ ئەوەی چاندنی بیروباوەڕ لەدڵدا بەهێزبێت پێویستە منداڵ بە هەموو جۆرە پەرستشێك ئاو بدرێت,

ئەم گشتگیریەش بۆ چەمکەکانی ئیسلام لە ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خواوە صلی اللە علیە وسلم وەرگیراوە بۆ فێرکردنی منداڵان لە بنەماو بنچینەکانی ئیمان, ئەرکانەکانی ئیسلام و, ئەحکامەکانی شەریعەت..

**ئەوەش ئێوەو گرنگترین ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم لەو بارەوە:**

**١- فەرمانی کردووە وشەی(لا الە إلا اللە) بدرێت بەگوێی منداڵدا:**

* ئیبن عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ ئەویش لە پێغەمبەری خواوە صلی اللە علیە وسلم کە فەرمویەتی: **(إفتَحوا على صبيانَكُم أول كَلِمة بلا إله إلا الله)** [١]. یەکەم وشە کە زمانی منداڵەکانتانی پێ دەکەنەوە با وشەی(لا إله إلا الله)بێ. واتە: جگە لە خوا هیچ فریاد ڕەسێك نیە.

**نهێنی لەمەدا ئەوەیە:**

تاکو وشەی یەکخوا ناسی دروشمی هاتنە ناو ئایینی ئیسلام بێت, یەکەم وشە بێت زمانی لەسەری ڕابهێنرێ, هۆش و بیری بەو وشانە بکرێتەوە, هەروەك لە باسی ئەحکامی منداڵی تازە لە دایك بوودا لە بەشی بانگدان بەگوێی ڕاست و قامەت بە گوێی چەپی منداڵدا ئاماژەی پێدراوە.. شتێکی شاراوە نیە کە ئەو کردەوەیە چەندە کاریگەری هەیە بۆ ڕاهێنانی منداڵ لەسەر بنەمای عەقیدەو بیروباوەڕی یەکتاپەرستی و ئیمان.

**٢- پێویستە کاتێك منداڵ هۆش و بیریکردەوە یەکەم شت فێری یاساو ئەحکامەکانی حەڵاڵ و حەرام بکرێت:**

* ئیبن عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمویەتی: **(إعملوا بطاعة الله و اتقوا معاصي الله, ومروا أولادكُم بامتثال الأوامر, وإجتناب النواهي, فذالك وقاية لهم ولكم من النار)** [٢]. واتە: گوێڕایەڵی خوا

---

تاکو لە دڵی منداڵدا گەشە بکاو پەلوپۆ بهاوێت و, خۆڕاگر بێت لەبەرامەر گێژەڵوکەی ژیان..وەرگێڕ.

1- رواه حاكم.

2- رواه ابن جرير وإبن المنذر.

بکەن, خۆتان بپارێزن لە تاوان و کاروکردەوەی ناشیرین, منداڵەکانتان فێر بکەن پەیڕەوکاری فەرمانەکانی خوا بن, لەو شتانەش خۆیان بە دووربگرن کە قەدەغەکراون, بەوەش خۆیان و ئێوەش دەپارێزن لە سزای ئاگری دۆزەخ.

**نهێنی لەمەدا ئەوەیە:**

تاکو منداڵ لەسەرەتاوە رابێت لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواو پەیڕەوکاری بەرنامەکەی بێ, خۆی بە دووربگرێ لەو شتانەی کە قەدەغەکراون.. کاتێ منداڵ لەسەرەتاوی تەمەنیەوە تێگەیشت و پابەندبوو بە ئەحکامەکانی حەڵاڵ و حەرام و ئەحکامەکانی شەریعەتی پاك و بێگەردەوە, ئەو کاتە جگە لە ئیسلام هیچ یاساو بەرنامەیەك ناناسێ و شوێنی ناکەوێ.

**٣- لە حەوتساڵیدا فەرمانی پێ بکرێت بە خوا پەرستی:**

* عەمری کوڕی عاص رەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ)**[1]. واتە: فەرمان بکەن بەمنداڵەکانتان لەحەوت ساڵیدا نوێژ بکەن, لە دە ساڵیدا بەلێدانێکی سوك لێیان بدەن ئەگەر نوێژیان نەکرد, جێگەشیان جیابکەنەوە با بەیەکەوە نەخەون.

هەر لەسەر قیاسی فەرمان پێ کردنی بە نوێژ ئەگەر منداڵ توانای هەبوو با رابهێنرێت لە هەندێ لەو رۆژانەدا سونەتە رۆژوویان تێدا بگیرێ بە رۆژوو بێ, یان ئەگەر باوکی تواناو دەسەڵاتی هەبوو با حەجی پێ بکات.

**نهێنی لەمەدا ئەوەیە:**

تاکو منداڵ لە سەرەتاوە خوبگرێ بەو پەرستشەکانەوەو رابێت لەسەریان, پەروەردە بێت لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواو, پارێزگاری لە مافەکانی بکا, سوپاس و ستایشی بکا, تەنها پشت بەو ببەستێ, زوو زوو بگەڕێتەوە بۆ لای, متمانەی پێ ببەستێ بە تەواوی و, تەسلیم بێ بە زاتی خوا.. تاکو بەو پەرستشانە روحی پاك

---

[1]- اخرجه ابو داود في الصلاة (٤٩٥), والترمذي (٤٠٧), و أحمد في المسند: (١٨٧\٢).

بێتەوە, جەستەی چالاك بێت, خوڕەوشتی جوان بێت, گوفتار و رەفتاری چاك بێت!!.

**٤- ئەدەبدانی منداڵ بەخۆشەویستی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و خانوادەکەی و خوێندنەوەی قورئان:**

* ئیمام عەلی رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(أدبُو أولادكُم على ثَلاُث خِصال: حُب نَبيُكَم, وَ حُب آل بَيتِهِ, و تِلاوَةُ القُرآن فَإن حَمَلَةَ القُرآن في ظل عرش الله يوم لا ظِلّ إلا ظِله مع الأنبيائهِ وأصفيائهِ)**[1]. واتە: منداڵەکانتان لەسەر سێ رەوشت پەروەردە بکەن: خۆشەویستی پێغەمبەرەکەتان و خانەوادەکەی و خوێندنی قورئان, چونکە هەڵگرانی قورئان لە ژێر سێبەری عەرشدان لە گەڵ پێغەمبەران و پیاو چاکاندا لە رۆژێکدا کە جگە لەو سێبەرە هیچ سێبەرێکی تر نیە.

لەگەڵ ئەوەشدا شارەزا بکرێن لە غەزاکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم, ژیان و بەسەرهاتی هاوەڵان و, کەسایەتی سەرکردەو پێشەوا بەناوبانگەکان, ئەو جەنگە یەکلاکەرەوانەی لە مێژوی پڕ سەروەرییاندا روویداوە..

**نهێنی لەمەدا ئەوەیە:**

تاکو منداڵان ژیان و بەسەرهاتیان بزانن و شانازییان پێوەبکەن کە چەندە مەردوو گیان فیدا بوون بۆ ئەم ئیسلامەو شوێنیان بکەون, هەروەها تاکو پابەندبن بە قورئانەوەو بە رەوانی بیخوێننەوەو بیکەنە بەرنامەو پەیڕوو پرۆگرام بۆ خۆیان.

**ئەوەش ئێوەو چەند وتەیەکی بەنرخی زانایانی بواری پەروەردەی ئیسلامی لەو بارەوە:**

- سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص رەزای خوای لێ بێ دەفەرموێت: ئێمە منداڵەکانمان فێری غەزاکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەکرد, هەروەك چۆن فێری سورەتێك لە سورەتەکانی قورئانمان دەکردن.

- پێشەوا غەزالی لە کتێبی **(الإحياء علوم الدين)**دا وەسیەت و ئامۆژگاریمان

---

[1]- رواه الطبراني, سلسلة الأحاديث الضعيفة: (٢١٦٢).

دەکات و دەڵێت: منداڵەکانتان فێری قورئان خوێندن بکەن, شارەزای فەرمودەیان بکەن, بەسەرهاتی پیاو چاکانیان بۆ بگێڕنەوە, هەتا پەندو ئامۆژگارییان لیٚ وەرگرن, پاشان فێری هەندیك لە ئەحکامەکانی ئیسلامیان بکەن.

- ئیبن خەلدون لە موقەدیمەکەیدا ئاماژەی داوە بەگرنگی قورئان فێرکردن بەمنداڵ و لەبەکردنی, هەروەها روونی کردۆتەوە کە قورئان فێرکردن بە منداڵ و لەبەرکردنی بنچینەی هەموو بەرنامەکانی وانە وتنەوەیە لە هەموو وڵاتە ئیسلامیەکاندا, چونکە دروشمێکە لە دروشمەکانی ئاین و دەبێتە هۆی دامەزراندنی عەقیدە و بیروباوەڕو, جێگیربوونی ئیمان.

- ئیبن سینا لە کتێبی (السیاسە)دا ئامۆژگاریمان دەکات و دەڵێت: منداڵ هەرکە هۆش و بیریکردەوە لەرووی جەستەو ژیرییەوە ئامادەبوو دەبێت یەکسەر فێری قورئان خوێندن بکریٚ, بۆ ئەوەی شارەزای پیتەکانی عەرەبی بیٚ, زمانی پاراو بیٚ, ئیمان لە دڵ و دەروونیدا جێگیرو دامەزراو بیٚ.

- لە کتێبی مێژوو ئەدەبدا دەگێڕنەوە کە فەزلی کوڕی زەید جارێکیان کوڕی ئافرەتێکی موسڵمانی دەشتەکی بینی, زۆر سەری سوڕما لە ئازایەتی و رووخساری, پرسیاریکرد لە دایکی دەربارەی, ئەویش گوتی: هەرکە تەمەنی گەیشتە پێنج ساڵان مامۆستایەکی چاکم بۆ هەڵبژاردو دامەدەستی, ئەویش فێری قورئان خوێندنی کردو پێشی لەبەر دەکرد, شیعری پاراوو سەرگوزشتەی باب و باپیرانی بۆ دەخوێندەوە, کاتێکیش گەیشتە تەمەنی لاوی فێری ئەسپ سواریم کردوو, ئێستا سوار چاکێکی باش و شارەزای لیٚ دەرچووە, کەرەسەکانی جەنگی دەپۆشی بەناو گەڕەك و کۆڵانەکاندا هاتوچۆ دەکاو, دەچێت بەدەم هاواری ئەو کەسانەوە کە هانای بۆ دەهێنن..

ئەوەی رابوورد سەرگوزشتەی گرنگیدانی پیاوانی پێشین بوو بۆ پەروەردەی منداڵەکانیان و بردنیان بۆ لای مامۆستای چاك و پەروەردەکار, یەکەم شت ئامۆژگاری مامۆستاکەیان دەکرد کە منداڵەکەیان فێری قورئان خوێندن و لەبەرکردنی بکات.. هەتا زمانیان پاراو بیٚ, رۆحیان بەرز بیٚ, گەردنکەچ بن بۆ خوا, ترسی خوا

بچێته دڵیانەوه, چاو به فرمێسك بن, ئیمان و یەقین جێگیرو دامەزراو بێ له دەروونیاندا.

**پوخته قسه لەسەر ئەوەی رابوورد ئەمەیه:** پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گرنگی زۆری داوه به راهێنانی منداڵ لەسەر بنەماو بنچینەکانی ئیمان, روکنەکانی ئیسلام, ئەحکامەکانی شەریعەت, ئەدەب دادانیان لەسەر خۆشەویستی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و خانەوادەکەی, هەروها خۆشەویستی هاوەڵان و, سەرکردەو پێشەوا رزگارکەرەکان, خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.. تاکو منداڵ رابێت و پەروەردەبێ لەسەر ئیمانی تەواو, عقیدەی جێگیر, خۆشەویستی نەوەکانی یەکەمی سەردەمی ئیسلام و سەربازه گیان فیداکانی.. ئەگەر لەسەر ئەوه پێگەیشتوو گەوره بوو ئیتر بیروباوەڕی هیچ بەرنامەیەکی بێ باوەڕی و درۆ نایهەژێنێ و هەڵناخەڵەتێ به پڕوپاگەندەی کوفرو خوانەناسی!!.

چەنده جێگەی خۆیەتی پەروەردەکاران منداڵەکانیان لەسەر ئەو بنەما گرنگانه پەروەرده بکەن, ئەو هۆکارانه بگرنەبەر بۆ بەدەسهێنانی سەلامەتی بیروباوەڕیان له بێباوەڕی و کوفرو خوانەناسی و بەدرەوشتی و لادان!!.

ئەوەی زانایانی بواری پەروەردەو رەوشت هەماهەنگن لەسەری ئەوەیه که منداڵ کاتێك له دایك دەبێت لەسەر سروشت و فیترەتی پاکی ئیسلامەتی لەدایك دەبێ, جا ئەگەر لەماڵەوه پەروەردەیەکی چاك و شیاوی بۆ رەخساو, تێکەڵاوی چاکی کۆمەڵایەتی بۆ گونجا, له ژینگەیەکی ئیمانیدا گەشەی کرد ئەوا بێگومان ئەو منداڵه دەبێته خاوەنی ئیمانێکی پتەوو دامەزراو, رەوشتی بەرزو جوان دەبێت, پەروەردەیەکی چاك و جوان وەردەگرێت..

ئەو راستیەش قورئان بڕیاری لەسەر داوەو, پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانی پیاناوەو, زاناکانی بواری پەروەردەو رەوشت دانیان بەو راستیەدا ناوەو چەسپاندویانه:

- قورئان بڕیاری لەسەر داوەو دەفەرموێت: ﴿**فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ..**﴾. **الروم:٣٠.** واته: دینێکی بنەڕەتیەو له سروشتدا خوا ئەو

خەڵکەی هەر یەکتا پەرستی وەدی هێناوە, کاری خودا گۆڕانی بەسەردا نایە..

* پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەوە دڵنیامان دەکاتەوە بەم فەرمودەیە: **(كَلٌّ مَولودٍ يُولَدُ عَلى فِطرةٍ, وَ إنّما أبَواه يُهَوِدانِه أو يُمَجِسانِه أو يُنَصِرانِه)**[1]. واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیترەتی پاکی ئیسلام لە دایك دەبێ, دایك و باوکی دەیکەن بە جولەکە یا ئاگر پەرست یان گاور.

- زاناکانی بواری پەروەردەو رەوشت دانیان بەو راستیەدا ناوەو چەسپاندویانە: پاش کەمێکی تر لێی دەدوێین و وتەی زاناکانی رۆژهەڵات و رۆژئاواتان بۆ دەخەینەڕوو لەو بارەوە, بەکورتی وتەکەی پێشەوا غەزالیتان بۆ باس دەکەین کە چۆن دانی پێداناوەو سەلماندوویەتی لە کاتێکدا دەڵێت: منداڵ ئەمانەت و سپاردەیە لای دایك و باوك، دڵی پاك و بێگەردی وەك گەوهەرێکی سافی بێ نەخش و نیگار وایە بۆیە ئامادەیە هەموو شتێکی لەسەر نەخش بکرێ، ئارەزووی بۆ هەموو ئەو شتانە هەیە کەسەرنجی بۆلای رابکێشرێ، جا ئەگەر لەسەر چاکە فێرکرا ئەوا لەسەر ئەو چاکەیە پەروەردە دەبێ و بەختەوەرو دڵخۆش دەبێ لە دنیاو قیامەتدا، خۆ ئەگەر لەسەر خراپە راهێنرا و پشتگوێ خرا ئەوا بەدبەخت و چارەڕەشی دنیاو قیامەت دەبێ, سەرئەنجامەکەی تیاچوونەو ئۆباڵیشی لەئەستۆی دایك و باوك و سەرپەرشتیارەکەیەتی.. پارێزگاری کردنیشی بەوە دەبێ ئەدەبی دابدرێ و پەروەردەبکرێ و فێری ئاکارو رەوشتی بەرزو جوان بکرێ..

چەندە جوانی وتووە شاعیر لەو بارەوە کە دەڵێ:

**وينشأ ناشيء الفتيان منا**

**على ما كان عوّده أبوه**

**ومادان الفتى بحجى ولكن**

**يُعوده التديّن أقربوه.**

ئەمانەی باسمانکرد گرنگی و کاریگەری فیترەتە.. وەك دەزانن ئەگەر منداڵ لە ماڵێکی هەڵوەشاوەو لادەردا گەشەیکرد, لە ژینگەیەکی گومڕادا فێرکراو پەروەردە

---

[1] - البخاري: (١٣٨٥), وأبو داود: (٤/٢٧٤).

بوو, تێکەلاوی کۆمەڵێکی خراپەکاری کرد.. بێگومان بەشێری خراپە و تاوان گۆش دەبێ, پەروەردە دەبێ لەسەر بەدڕەوەشتی, دروشمەکانی کوفرو بێباوەڕی دەچێت بەگوێیدا.. بەخێرایی ژیانی لە خوشبەختیەوە دەگۆرێ بۆ بەدبەختی و چارەڕەشی, هێدی هێدی لە ئیمانەوە ئەڕوات بەرەو بێباوەڕی, لە ئیسلامەوە بۆ کافربوون.. ئەوکاتە زۆر زەحمەتە بگەڕێتەوە بۆسەر ڕێگای حەق و ئیمان و هیدایەت..

بەو بۆنەوە جەند نمونەیەك لە شۆێنەواری گومڕایی وخراپەکاری ناو کۆمەڵگەی ئەمڕۆتان پێشکەش دەکەین بۆ ئەوەی زیاتر ئاشناو شارەزای هۆکارەکانی لادانی منداڵان بن لە رووی عەقیدە و بیروباوەڕو خراپی خووڕەوشتەوە, هەروەها بابزانن ئەگەر دۆستان و باوك و دایك پەروەردەی منداڵەکانیان فەرامۆشکرد ئەو کاتە بەزۆری ئەو منداڵانەیان تووشی لەڕێ لادان و خراپەکاری دەبن و دەستلەملانی کوفرو بێباوەڕی دەبن!!..

- کاتێ باوك منداڵەکەی خستە قوتابخانەی بێگانەو پەیمانگای بە گاورکردن ئیتر لەوێ بەشێری ئەوان گۆشدەکرێ, لەسەر دەستی ئەوان فێردەکرێ و ئاراستە دەکرێ.. بێکومان لەسەر گومڕایی و خواروخێچی ئاراستە دەکرێ , پلە پلە لەسەر کوفرو بێباوەڕی گەورە دەبێ.. بەڵکو لەناخی خۆیدا رقی لە ئیسلام دەبێ, دەبێتە دوژمنێکی سەرسەختی ئەم دیینە.

- باوك ئەگەر جلەوی منداڵەکەی دایەدەست مامۆستا بێباوەڕەکان و, پەروەردەکارە خراپکارەکان, ئەوانیش دروشمەکانی کوفر ئەدەن بەگوێیاندا, لەناخی دڵیدا تۆوی گومڕایی دەچێنن.. بێگومان ئەو منداڵە لەسەر پەروەردەی بێباوەڕی گەورە دەبێ, گروپە عەلمانیەکان ئاڕاستەی دەکەن کە ئەوەش زەنگێکی ترسناکە.

- باوك ئەگەر رێگەیدا بەمنداڵەکەی بەئارەزووی خۆی کتێبی بێباوەڕی و کتێبی ماددیەکان بخوێنێتەوە, ئەو تانەو تەشەرانە بخوێنێتەوە کە زاناکانی بەگاورکردن و داگیرکەران لە ئیسلامی دەدەن.. بێگومان ئەو منداڵە توشی گومان و دوودڵی دەبێ لە ئایینەکەی، گاڵتەی بە مێژووی ئیسلام و باو باپیرانی خۆیشی دێ، ئەو کاتە دەبێتە دوژمنێکی سەرسەختی بیروباوەڕو دروشمەکانی ئایینی ئیسلام.

- باوك ئەگەر جلّەوی بۆ كوڕەكەی شل كردو، كوڕەكەشی پەتی پچران و تێكەلی هاوەڵی خراپەكارو گومڕا بوو بە ئارەزووی خۆی، دەستەملانی بیروباوەڕی گومڕایی و ئەو بیرو بۆچوونانە بوو كە لە وڵاتانی بێكانەوە بۆیان هێناوین.. ئەوا بێكومان ئەو منداڵە گاڵتە دەكات بە هەرچی داب و نەریت و بیروباوەڕێكی رەوشتی جوان كە شەریعەت و نامە ئاسمانیەكان هێناویانە.

- ئەگەر باوك بواریدا بەمنداڵەكەی بچێتە ناو ئەو حیزب و لایەنە عیلمانی و كافرانەوەو خۆشەویستی هەبوو بۆیان، یان بۆ ناو ئەو رێكخراونەی كە هیچ پەیوەست نین بیروباوەڕو فیكرو مێژووی ئیسلامەوە.. بێگومان ئەو منداڵە لەسەر دروشمەكانی كوفرو بێباوەڕی پەروەردە دەبێ و گەشەدەكات، دوژمنایەتی رەوشتە بە بەهاو راستەكان و موقەدەسات و ئایینەكان دەكات!!..

**وليس النَبت ينبت في الجنان**

**كمثل النبت ينبت في الفلاة**

**وهل يرجى لأطفال كمال**

**إذا ارتضعوا من ثُدّيّ الناقصات.**

واتە: كشتوكاڵ و رووەك لەناو باخ باخات و زەری بەپیت وبەرەكەت و ئاوداردا سەوز بێت، قەت وەك ئەو كشتوكاڵە نیە لە بیابان و زەروی رەق تەقدا سەوز دەبێ، ئایا ئومێد بە منداڵانێك دەكەی چاك و بەرەوشت بن بە تەواوی، لە كاتێكدا بە شیری ناتەواوەكان گۆشكراون.

مادەم پەروەردەكاران بەگشتی و, باوك و دایك بەتایبەتی، ئەركی بەرپرسێتی گەورەیان لەئەستۆدایە كە منداڵەكانیان لەسەر عەقیدەو ئیمان و دروشمەكانی ئیسلام پەروەردە بكەن.. پێویستە لەسەریان سنووری ئەو بەرپرسێتیە بزانن.. بابزانن ئەوانەی هەقی پەروەردەو ئاراستەكردن لە گەردنیاندایە, شارەزای ئەو واجبەی بن لەسەر شانیانە..

**سنووری ئەو بەرپرسیارێتیەش بەندە بەم شێوانەی لای خوارەوە:**

**١- رێنومایی منداڵان بكەن بۆ ئیمان بەخوا، بەدەسەڵاتە بێ پایانەكەی و, داهێنانە گونجاو پەسەندەكانی:**

ئەوەش بە رامان و بیرکردنەوە لە بەدیهێنراوانی ناو زەوی و ئاسمانەکان دەبێ لە تەمەنی پێگەیشتندا، چاکتر وایە هێدی هێدی ئەو شتانەی بۆ باسکرێت لە هەستیارەکانەوە بۆ شتە گونجاوو شیاوەکان، لە هەندەکیەوە بۆ هەمەکی، لە شتی ئاسانەوە بۆ شتە تێکەڵ و ئاوێتەکان.. هەتا لە کۆتایدا بە بەڵگە و بەقەناعەتەوە بگاتە ئیمانێکی تەواو لە دڵ و دەروونیدا جێگیر بێت.. ئەگەر منداڵ بیروباوەڕی لەسەر ئیمان جێگیر بوو, ئیتر ئەوانەی کاریان بەدرەوشتی و رووخاندنە ناتوانن دڵی ئاوەدانی بڕوخێنن، کاریگەری خراپیان نابێ بۆ عەقڵ و ئاوەزی پێگەیشتوی, هیچ کەسێك ناتوانێ نەفسی پاك و دامەزراوی بهەژێنێ.. چونکە تازە گەیشتۆتە ئیمانێکی جێگیرو, قەناعەتێکی تەواوو, یەقینێکی چەسپاو.

ئەم رێگایەش هێدی هێدی لە خوارەوە دەبیات بەرەو سەرەوە, لە هەست پێکراوەوە دەیبات بەرەو ئەو شتانەی عەقڵ دەرکیان پێ دەکات.. گەیشتن بەو راستیەش لەڕێی قورئانی پیرۆزەوە دەبێ, ئەمانەی لای خوارەوەش چەند ئایەتێکی درەوشاوەن لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان لەو بارەوە:

– ﴿ **هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لَكُمْ مِنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ* يُنْبِتُ لَكُمْ بِهِ الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخِيلَ وَالْأَعْنَابَ وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ* وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومُ مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ* وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ* وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ* وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَارًا وَسُبُلًا لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ* وَعَلَامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ * أَفَمَنْ يَخْلُقُ كَمَنْ لَا يَخْلُقُ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾. النحل: ١٠–١٧.** واتە: هەرخودایە لەئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێت، کە بەشێکی بۆ خواردنەوەی خۆتانەو، بەشێکیشی بۆ سەوزبوونی دارودرەخت و گژوگیایە، بۆ ئەوەی ئاژەڵەکاتتان تیایدا بلەوەڕێنن. خودا بەهۆی ئەو بارانەوە گەڵێك شتی بۆ ڕواندوون وەك کشتوکاڵ و، داری زەیتون ودارخورماو جۆرەها ترێ و، هەموو چەشتە میوەیەکی تر، هەموو ئەوانە بەڵگەیەکی ئاشکردن لەسەر بوون و تەنهابی خوداو تواناو دەسەڵاتە بێئەندازەکەی، بۆ ئەوانەی بیردەکەنەوەو

تێدەفکرێن. خودا بەفەرمانی خۆی شەوو رۆژو مانگ و خۆری بۆ رامکردوون، هەروەها ئەستێرەکانیش بەفەرمانەی ئەو زاتە رامهێنراون، بەڕاستی ئەوانە بەڵگەن لەسەر بوون و تاك تەنهایی و بێ وێنەیی خودا, بۆ ئەو کەسانەی بیرو هۆشی خۆیان دەخەنەکار. هەموو ئەو شتانەی کە خودا لەزەویدا بەدیهێناون و بۆی رەخساندوون، هەریەکەیان رەنگێکی تایبەتی هەیە، لەشینایی و دارودرەخت و گوڵ و گوڵزارو ئاژەڵ و ماڵات و کانە مەعدەنەکان و شتێکی تر، بێگومان ئەمانەش هەموویان بەڵگەن لەسەر گەورەیی و توانای خودا، بۆ ئەو کەسانەی سەرنج لەو دروستکراوانە دەدەن و یاداوەری وەردەگرن. هەر خودایە کە دەریای بۆ رەخساندوون، بۆ ئەوەی ماسی تێدابگرن و گوشتی تەڕو تازەی لێ بخۆن. هەروەها مرواری و مەرجان و شتی جوان و گرانبەهای تری تێدا دەربهێنن و بیکەنە خشڵ و خۆتانی پێ برازێننەوە، هەروەها ئێوە بەچاوی خۆتان دەبینن کە دەریاکانی بەشێوەیەك رەخساندووە کە کەشتی و پاپۆڕ بەسەریدا بڕوات، بۆ ئەوەی لە سایەی کەرەم بەخشتی خوداوە کاسپی و بازرگانی بکەن..بەڵکو بیرنکەنەوەو سوپاسی کەرەم و بەخششەکانی خودا بکەن. خودا چیاکانی لە سەرووی زەوی چەسپاندووە، تا زەوی جێگیر بێ و لەنگەر بگرێت.. ئەم چیایانە وەك مێخ وانەو بەناخی زەویدا چەقیون، زەوییان لە ئاستێکدا راگرتووە نایەڵن بترازێت و ژێراو ژورتان بکا، هەروەها بەهەزاران رووباری تێدا فەراهەمهێناوە، گەلێك رێگای لەسەر زەویدا راکێشاوە تاکو لەهات و چۆدا رێگا وێل نەکەن و بەهەڵە نەڕۆن. خودا نیشانەی بۆ ئەو رێگایانە داناوە تا خەڵکی رێی خۆیان دەربکەن و بزانن بەرەوکوێ دەچن و رێگایان لێ تێکنەچێ. هەروەها ئەستێرەشی کردووە بەنیشانە، تا ئەو کەسانەی بەشەودا هاتوچۆ دەکەن رێگای رۆشتنیان بزانن و وێڵ نەبن. ئایا ئەوەی کە بەدیهێنەری ئەم بونەوەرەیە، کەخوای بەزری بێ وێنەیە، وەك ئەوانە وایە کە ناتوانن هیچ شتێك دروستبکەن، وە ناتوانن هیچ زەرەرو زیانێك بگەیەنن، وەك بتەکان و بێجگە لە بتەکان..ئایا نابێت بیربکەنەوەو تێبگەن؟!.

– ﴿ **إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاء فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ**

**فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخِّرِ بَيْنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾.البقرة١٦٤.** واته: بەراستی هەر لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و, جیاوازی نێوان شەوو رۆژو, ئەو گەمی و کەشتیانەی کە دێن و دەچن لە دەریادا بەو شتانە کە قازانج دەگەیەنن بە خەڵك, وە ئەوەی کە خوا باراندی لەئاو پاشان زەوی پێ زیندوو کردەوە پاش مردنی, وە بڵاویکردەوە تێیدا لە هەموو جۆرە زیندەوەرێك, وە گێڕانی بایەکان بە هەموو لایەکدا, وە ئەو هەورانەی رامکردوون لەناوەندی ئاسمان و زەویدا, چەند بەڵگەن بۆ کەسانێك کە تێبگەن.

- **﴿فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ مِمَّ خُلِقَ* خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ* يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ* إِنَّهُ عَلَى رَجْعِهِ لَقَادِرٌ* يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ*فَمَا لَهُ مِنْ قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ﴾. الطارق: ٥ –١٠.** واتە: دەی با مرۆڤ سەرنج بدات لەچی دروەستکراوە, دروەستکراوە لە ئاوێکی هەڵقوڵاو کە دەردەچێت لە ناوەندی پشتی پیاوو ئێسکەکانی سنگی ژنەوە, بەراستی خوا بەدەسەڵاتە لەسەر زیندووکردنەوەی, لە رۆژێکدا هەرچی نهێنی هەیە ئاشکرا دەکرێ, ئەو نەهێزێك شك دەبات و نەپشتیوانێك کە رزگاری بکات.

- **﴿فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ (٢٤) أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا (٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩) وَحَدَائِقَ غُلْبًا (٣٠) وَفَاكِهَةً وَأَبًّا (٣١) مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٢)﴾. سورة عبس.** واتە: بامرۆڤ تەماشای نیعمەتەکانی خودا بکات، با تەماشای خواردنەکانی بکات خودا بۆی فەراهەمهێناوە، هەروەك خۆی و هەموو مرۆڤێکی تری لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون. بێکومان ئێمە بەخوڕ بارانمان باراندۆتە خوارەوە. زەویمان بۆ لەت لەت کردووە. دانەوێڵەمان تێدا رواندووە. هەروەها ترێ و سەوزەمان تێدا رواندووە. زەیتون و دارخورماش. باخ و باخاتی چڕو پڕو دارستانی پڕ لەدرختی هەمەچەشنە. هەموو چەشنە میوەیەك و گژوگیای لەوەڕگەمان تێدا سەوزکردووە, خودا هەموو ئەوانەی لەزەوی هێناوەتە دەرەوەو سەوزیکردوون, بۆ خواردنی خۆتان و، بۆ ماڵات و ئاژەڵەکانتان.. ئیتر چۆن ئیمان ناهێنن و بیر لە سەرەنجامی خۆتان ناکەنەوە؟!.

- **﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفاً أَلْوَانُهَا وَمِنَ**

**الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ*وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾. فاطر:٢٧-٢٨.** واتە: ئەی ئادەمیزادی خاوەن بیروهۆش! ئایا تۆ لەدروستکراوەکانی خوای پەروەردگاردا تواناو دەسەڵات وگەورەیی خودا نابینیت؟! سەرنجت نەداوە چۆن خودا لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت و، چەندەها جۆر میوەو سەوزەی تام و رەنگ جیاوازی پێ دەڕوێنێ؟! هەروەها تەماشای شاخەکان و رێگاو نەخش و خەتەکانیان و دۆڵ و شیوەکانیان بکە، دەبینیت چەندەها رەنگی چۆراوجۆرن رەنکی سپی و سورو رەشی تۆخ و تیریان تێدایە، هەریەکەیان شێوەیەك و رەنگێك دەنوێنێ و، هیچیان وەك ئەوی تریان نیە! ئایا هەریەکە لەمانە بەڵگەیەکی گەورەو ئاشکرا نین لەسەر تاك و تەنیایی و دەسەڵاتی رەهای خودای جوانکار؟!. هەروەها خودای گەورەو پەروەردگار ئادەمیزادو هەموو رۆیندە و ئاژەڵێکی بەشیوەیەکی وا دروستکردووە، کە رەنگ و رووی هەردانەیەك لە بەشێك لەم بەشانە بەتەواوەتی وەك رەنگ و رووی یەکێکی تریان نەبێت و جیاوازیەکی هەبێت، جازۆر بێت یان کەم، بەڕاستی ئەوانەی خاوەن زانیارین و زانان, ئەوانە باوەڕیان بەخودا هەیەو لێی دەترسن، بێگومان خودا خاوەن تواناو دەسەڵاتێکی بێ سنوورەو کەس ناتوانێت بەرامبەری بوەستێت، وە زۆریش لێخوشبووە.

- **﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ* وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ* تَبْصِرَةً وَذِكْرَى لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾. ق: ٦-٨.** واتە: ئایا ئەوانە سەیری ئاسمان ناکەن بەڕاسەریانەوە، کە چۆن ڕامانگرتووەو بەخۆرو مانگ و ئەستێرەکان رازاندومانەتەوە، بەبێ هیچ کەموکوڕیەك وە بەبێ ئەوەی کەلێنێکی تێدابێت. ئەی ئایا نابینن کە چۆن زەویمان پان و پۆڕو درێژکردوەو رامانخستووە، وە چیاکانمان تێدا چەقاندووە, تابیبەستنەوە بۆ ئەوەی نەلەرزێت، وە هەموو جۆرە میوەیەکمان بەجووتە تێدا رواندووە، کە نەشئەو خۆشی بەئادەمیزاد دەبەخشن؟!. ئەمانە هەمووی بیرخەرەوەیەکن بۆ هەموو بەندەیەك کە بەرەو لای خودای خۆی بگەڕێتەوە..

**٢ - چاندنی رۆحی گەردنکەچی و تەقواو خواپەرستی لەدڵ و دەروونی منداڵدا:**

ئەوەش بەسەرنجدانی دەسەڵات و توانای بێ پایانی خواو موعجیزەکانی، فەرمانڕەوایی مەزنی و گەورەیی لە هەموو شتێکدا.. لەوردو درشت.. بێ گیان و گیاندار.. لە رووەکی بەرهەمدارو درەختی بێ بەرهەم و زڕ.. لەو هەموو گوڵ و گوڵزارە قەشەنگ و رەنگاو رەنگە جوانانە.. لەو هەزاران هەزار بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرانە لە دروستکردنیاندا، کە چەندە داهێنانێکی جوانن.. دڵ لەوە زیاتر خۆی پێ ڕاناگیرێ تەنها ئەوەندە نەبێ بەخشوعەوە بلەزرێ لەبەردەم هێزو دەسەلاتی خوادا، نەفسیش هیچ چارەیەکی نیە جگە لە ترسان لە خواو کردنی بەچاودێر بەسەر خۆیەوە، ئەو کاتە لەناخەوە هەست بە چێژی شیرینی ئیمان و عبادەت بۆ خوا دەکات.

**هۆکارەکانی بەهێزکردنی خشوع و چەسپاندنی تەقوا لە نەفسی منداڵدا:** ئەویش بەڕاهێنانیەتی لەسەر خشوع لە نوێژدا لە تەمەنی لاویەوە، ئەدەبدادانی لەسەر گریان و دلتەنگی لە کاتی گوێگرتن لە قورئانی پیرۆز، ئەمانەش رەوشت و ئاکاری خواناسان و، دروشمی بەندە چاکەکانی خواو، تایبەتمەندێتی ئیماندارە راستگۆکانن.

با گوێ بگرین لە قورئانی پیرۆز کە چۆن ئەو کەسانە بەرزدەکاتەوەو پێیاندا هەڵدەدات کە خاوەن تەقواو گەردنکەچ و لە خوا ترسن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤمنوُنَ * الَّذيْنَ هُمْ فِي صَلاتِهِمْ خاشِعُونَ**﴾. **المؤمنون: ١– ٢**. واتە: بەڕاستی ئەو ئیماندارانە سەرکەوتو سەرفەراز بوون.. ئەوانەش ئەو کەسانەن لە نوێژەکانیاندا ملکەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراوون دڵیان لای خوای خۆیانە و بەخشوعەوە نوێژەکانیان دەکەن.

- ﴿ **اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَاباً مُّتَشَابِهاً مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَمَن يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ** ﴾. **الزمر٢٣**. واتە: خوا جوانترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە قورئانێکە ئایەتەکانی لەیەکچووی دووپات کراوەن, ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزووی پێدا دێت بە بیستنی قورئان, پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێت بەیادی خوا, ئەو قورئانە هیدایەتی خوایە, بەو قورئانە هیدایەتی کەسێك

دەکات کە بیەوێت, هەرکەسیش خوا گومڕای بکات ئەوە ڕێنمونی کەرێك بۆ ئەو نیە.

- ﴿وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ* الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ..﴾. **الحج٣٤**. واتە: مژدەی کامەرانی ڕۆژی دوایی بدە بەو کەسانەی بەهەموو دڵێکیانەوەو بەملکەچیەوە فەرمانەکانی خودا جێبەجێ دەکەن. ئەوانە کەسانێکن ئەگەر ناوی خودا لایاندا برا ترسی خوا دڵیان دەهەژێنێت و تەزووی پیادێت..

- ﴿ إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَن خَرُّوا سُجَّداً وَبُكِيّاً﴾. **مريم٥٨**. واتە: هەر کاتێك ئایەتەکانی خوای میهرەبانیان بۆ بخوێنرێتەوە لەبەر گەورەیی و هەیبەت و سامی خوای گەورە بەهەموو دڵێکیانەوە سەریان دەنایە زەوی و بەگریانەوە سەجدەیان دەبرد.

- ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّه وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾. **الحديد١٦**. واتە: ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران دڵیان بترسێ بەیادی خواو ئەو قورئانەی کە لە خواوە هاتۆتە خوارەوە؟.

ئەم گەردنکەچی و گریان و لە خوا ترسانە بووە.. کە پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم و، هاوەڵە بەڕێزەکانی و، پێشینە چاکەکان و خواناسان و عارفانی ڕێگای حەقیقەت و خواناسی لەسەری بوون.

* ئیبن مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ گوتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموم : قورئانم بەسەردا بخوێنە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من قورئانت بەسەردا بخوێنم کە قورئان بۆ تۆ دابەزیوە؟ فەرموی: پێم خۆشە گوێ بگرم بۆ ئێوە، منیش سورەتی(**النساء**)م بۆ خوێندەوە تاگەشتمە ئەم ئایەتە: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَـؤُلاء شَهِيداً﴾. **النساء٤١**. واتە: ئینجا حاڵی کافران چۆن بێت کاتێك هێنامان لە هەموو میللەتێکدا شایەتێك تۆیشمان هێنا ئەی پێغەمبەر! بەشایەت بەسەر ئا ئەوانەوە. پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموی: (**حَسبُكَ الآن**) ئیتر بەسەو بوەستە. کە ئاوڕم دایەوە بەلایدا دەبینم چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دێتەخوارەوە[1].

---

[1]- رواه البخاري: ٥٠٥٠, ومسلم:٢٤٧.

(أبی صالح) گێڕایەوە: خەڵکی یەمەن جەند کەسێکیان هاتن بۆ لای ئەبویەکر ڕەزای خوای لێ بێ قورئانیان دەخوێندەوەو دەگریان، ئەبوبەکر فەرموی: ئێمەش بەو جۆرە بووین تا دڵەکانمان ڕەق بوو.

هەواڵی گریان و خشوعی پیاوانی پێشین لە کاتی نوێژکردن و گوێ گرتن لە کاتی قورئان خوێندندا ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن، چیرۆك و بەسەرهاتی جوانیان لە کتێبەکانی پەروەردەو ڕەوشتدا باسیان زۆر لێوە کراوە..

هەندێك جار پەروەردەکار توشی زەحمەت و ماندوو بوون دەبێ تا منداڵ رابهێنێ و فێری گریان و گەردنکەچی بکات, بەڵام بەئاگادار کردنەوەو, کۆڵنەدان و, بەئارامگرتن دەبێت.. تا گەردنکەچی دەبێتە ڕەوشتی وخووی پێوە دەگرێ.

**قد ينفع الأدبُ الأولاد في صغر**

**وليس ينفعهم من بعده أدب**

**إنّ ! الغصون إذا عدلتها اعتدلت**

**ولا تلين ولو لينتَهُ الخُشب.**

واتە: لەسەرەتای منداڵیەوە منداڵان سوود وەردەگرن لە ئەدەبدادان و بەروەردەکردن، کاتێ گەورە بوون ئەدەب دادان هیچ سودیان پێ ناگەیەنێ ، تولْ بەتەڕی ئەگەر بتەوێ ڕاستی کەیتەوە ڕاست دەرەدەچێ، بەڵام کەبوو بەتەختە ڕاستکردنەوەی مەحاڵە.

ڕاهێنانی منداڵان لەسەر گەردنکەچی و ترسان لە خواو گریان لەکاتی قورئان خوێندا پێغەمبەری ئاماژەی پێکردووە: **(إقرأ القرآن وأبكوا, فإن لم تبكوا فتباكوا)** [1].

واتە: قورئان بخوێنن و بگرین، ئەگەر گریانتان نەهات ئەوا بەزۆر خۆتان بهێننە گریان. بگرین بۆ ئەو دڵەی کە قورئان کاری لێ ناکات ئەوەندە ڕەقبووە.

٣- وا پەروەردەبکرێن خوای گەورە لەهەموو هەڵس و کەوتێکیاندا بەچاودێر بزانن بەسەر خۆیانەوە: ئەوەیش بەڕاهێنانی دەبێت لەسەرەتای منداڵیەوە بەوەی کە خوای گەورە ئاگای لێیەتی و چاودێری دەکات، لە رازو نیازو شاراوەکانی ئاگادارە، ئاگادارە لە تروکاندنی چاوەکانی و ئەوەی لە ناو سنگیدا پەنهانە.. پێویستە ئامانج و

---

[1] - رواه الطبراني, وقال الشيخ الألباني: ضعيف, سنن إبن ماجة: ١٣٣٧.

مەبەستی گەورەی پەروەردەکار ئەوەبێ منداڵ رابهێنێ لەسەر ئەوەی خوای گەورە چاودێرە بەسەریەوە لە کردارو گوفتارو بیرکردنەوەو هەست و نەستیدا:

**لە کردارو گوفتاریدا:** منداڵ فێری ئەوە بکرێ کە هەموو ئەو کارو کردەوانەی دەیکات بەنیەتی پاکەوە بۆ خوای پەروەردگار ئەنجامیان بدات, بەوەش عیبادەتەکانی لە پێناوی رەزامەندی خوای گەوەردا بەدی دێت، دەبگاتە ریزی ئەو کەسانەی ئەم ئایەتە قورئانیە دەیانگرێتەوە: ﴿**وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ**﴾. **البينة:٥.** واتە: فەرمانیشیان هەر ئەوەندە پێنەدار بوو خوا پەرست بن و لە دینی ئەودا دڵپاك بن و بەرەو هەقیانەت برۆن و نوێژ بکەن و, زەکات بدەن, کە ئەمە دینی دروستە.

هەروەها دەبێت پەروەردەکار ئەو هەستە لە منداڵدا دروستبکات کە هیچ کاروکردەوەیەکی وەرناگیرێ تەنها ئەوانە نەبێت بەنیەتی پاکەوە بۆ خوای گەورە ئەنجامی دەدات, بە پێی ئەم فەرمودەیە: (**إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبَلُ مِنْ الْعَمَلِ إِلَّا مَا كَانَ لَهُ خَالِصًا وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ**)[١]. واتە: خوای گەورە هیچ کاروکردەوەیەك وەرناگرێ تەنها ئەوانە نەبێت بە چاکی و بەنیەتی پاکەوە بۆ خوا ئەنجامدرا بێت.

* وە ئەم فەرمودەیەش: (**إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى..** )[٢]. واتە: ئەو کارو کردەوانەی پاداشت و تۆڵەیان لەسەرە بەپێی نیازو مەبەستەکانن, بێگومان هەموو کەسێك بە گوێرەی نیەت و مەبەستی خۆی پاداشت و تۆڵەی بۆ دەنوسرێت..

**لە بیرکردنەوەیدا:** ئەویش بەزانینی ئەو بیرو رایانەی کە لە بەدیهێنەری بەدەسەڵاتی نزیکی دەکەنەوە.. ئەوانەی سوود بەخۆی و کۆمەڵگەکەی و هەموو خەڵك دەگەیەنن.. بەڵکو پێویستە منداڵ رابهێنرێت لەسەر ئەوەی کە دڵ و بیرو هۆش و ئاوەزو ئارەزووەکانی بکاتە شوێنکەوتەی ئەو بەرنامەو شەریعەتەی کە پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم هێناویەتی.. هەروەها پێویستە لەسەر لێپرسینەوە

---

1 - رواه أبو داود, وقال الشيخ الألباني: حسن صحيح, صحيح سنن النسائي: ٣١٤٠, صحيح الترغيب والترهيب: ١٣٣١/٢.

2 - مُتَّفَقٌ عَلَى صحتِهِ: أخرجه البخاري ٢/١ ( ١ ) ، ومسلم ٤٨/٦ ( ١٩٠٧ ) .

ئەدەبی دابدرێت تەنانەت دەربارەی خولیای خراپ و, بیروباوەڕی نامۆش.. بێگومان دەبێت منداڵ کۆتایی سورەتی(**البقرة**) لەبەر بکات لەگەڵ تەفسیرەکەی بەتێگەیشتنەوە: ﴿**لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٢٨٤) آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ (٢٨٥) لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (٢٨٦)**﴾. چونکە بە پێی فەرمودەی راست و دروست لە هەر کەسێك لە شەودا بیخوێنێت ئەبێتە هۆی پاراستن بۆی و بەسیەتی تا بەیانی[1].. هەروەها لەگەڵ ئەو رێنمایی و دوعایانەی کە ئەم ئایەتانە دەیانگرێتەوە لە ئاراستەکردنی بۆ لای خوا بەچاودێر زانین, لێپێچینەوەی نەفس, گەڕانەوە بۆ لای پەروەدگاری ئاسمانەکان و زەوی و, نزاو پاڕانەوە لێی.

**لە هەست و نەستیدا:** دەبێت منداڵ لەسەر هەموو هەست و نەستێکی جوان و پاك رابهێنرێت.. ئیرەیی بەکەس نەبات, رك و کینەی نەبێ, دووزمانی نەکات, لەزەت و خۆشی لە رابواردنە حەرامەکان وەرنەگرێت, ئیشتیهای ئارەزووە سەرکەشەکان نەکات.. هەر کاتێك شەیتان وەسوەسەیەکی خستە دڵیەوە, یان نەفسی فەرماندەر بە خراپەو تاوان فەرمانی پێکرد بە تاوان ئەوا دەبێ بزانێ و بیر لەوە بکاتەوە کە خوای پەروەردگار ئاگاداریەتی و دەیبینێ و چاودێرە بەسەریەوە.. بەو شێوەیەی کە پەروەدەکارو ئاراستەکەری یەکەم صلى الله عليه وسلم لە وەڵامی پرسیارەکەی جبریلدا دەربارەی ئیحسان فەرموی: (**أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فإِنَّهُ يَرَاكَ**)[2]. ئیحسان ئەوەیە خوا بپەرستیت وەك ئەوە چاوت لێی بێ، خۆ ئەگەر تۆ چاوت لەو نیە

---

[1]- البخاري مع الفتح: ٩٤/٩, و مسلم: ٥٥٤/١.

[2]- أخرجه : مسلم ٢٨/١ ( ٨ ) ( ١ ) .

بێگومان ئەو تۆ دەبینێ .

هەروەها قورئانیش لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێکردووە: ﴿**وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ * إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَواْ إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِّنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ**﴾. **الأعراف٢٠٠–٢٠١**. واتە: ئەگەر خەتەرەو خەیاڵ و وەسوەسەیەکت بۆ هات لەلایەنی شەیتانەوە, یەکسەر پەنا بگرە بەخوا, بەراستی هەر ئەو بیسەری زانایە. بەراستی ئەوانەی خواناس و پارێزکار بوون کاتێك خەتەرەو وەسوەسەیەکیان لە شەیتانەوە پێبگات یادی خوا دەکەن و خوایان بیردەکەوێتەوە.

دیاردەی ئەو فێرکردن و راهێنانە.. خورەوشت و ئاکاری پیاوچاکانی پێشین بووە منداڵەکانیان لەسەری پەروەردەکردووەو راهێناوە, ئیمام غەزالی لە کتێبی**(إحياء علوم الدين)دا** سەرگوزشتەیەکی لەم بارەوە هێناوەتەوەو دەڵێت: (سەهل کوڕی عبدالله التستری) گوتی: کاتێك کە تەمەنم سێ ساڵان بوو بەشەو هەڵدەسام لە خەو سەیری نوێژکردنی (محمد کوڕی سوار)م دەکرد کە خاڵی خۆم بوو, رۆژێکیان پێی وتم: ئایا یادی ئەو خودایە ناکەیت کە دروستیکردووی؟وتم چۆن یادی بکەم؟ وتی کاتێك لەناو جێگای خەوتنتدا ئەمدیو ئەودیو دەکەیت لەدڵی خۆتدا بێ ئەوەی زمانت بجولێنی سێ جار بڵێ: **(الله معي, الله ناظري, الله شاهدي)** واتە: خوا لەگەڵمایە, خوا چاودێرمە, خوا دەمبینێ و شایەتمە, منیش چەند شەوێك ئەوەم وت و پاشان پێم راگەیاند, ئەمجا وتی: لەمەولا شەوی حەوت جار بیڵێ, منیش وامکرد, پاشان چوومەوە خزمەتی و وتم وامکردووە, ئەمجارەیان پێی وتم: شەوی یازدە جار بیڵێ, منیش وتم, چێژو شیرینی ئەوە کەوتە دڵم, پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ئەوەدا خاڵم پێی وتم: بەردەوامبە لەسەری تا دەچیتە ناو گۆڕ, چونکە ئەوە سوودی دنیاو قیامەتی تێدایە, جا ئەوە ساڵانێکە لەسەری بەردەوامم, چێژو شیرینیەکم لە پەنهاندا بەدیکرد لەو کارەمدا, پاش ئەوە خاڵم پێی وتم: ئەی سەهل! هەر کەسێك خودای لەگەڵدا بێ و سەیری بکاو چاودێر بێ بەسەریەوەو شایەتی بێ, ئایا سەرپێچی فەرمانەکانی دەکات؟ ئاگاداربە لە سەرپێچیکردن.. سەهل رەحمەتی خوای لێ بێ بوو بەیەکێك لە عارفان و خواناسە پیاو چاکەکان.. بەهۆی ئەو ئەدەب و پەروەردەیەی خاڵیەوە, لە منداڵیەوە مانای ئیمان و

چاودێری و ڕەوشتی بەرزی چاند لە دڵ و دەروونیدا..

ئەگەر پەروەردەکاران ئەو ڕێبازو بەرنامەیە بگرنەبەر, باوکان و دایکان پەروەردەی منداڵەکانیان لەسەر ئەم بنەمایانە بکەن.. دەتوانن لە ماوەیەکەی کەمدا نەوەیەکی نوێی موسڵمان و خاوەن ئیمان بەخوا پێکبێنن, شانازی بکەن بە ئایین و مێژووی باو باپیریانەوە.. هەروەها دەتوانن ببنە خاوەنی کۆمەڵگەیەکی دوور لە بێباوەڕی, پاك لە بەدڕەوشتی و, ڕق و کینەو, تاوان و دوژمنکاری.

ئەم پەروەردە ئیمانیەی لێی دەدوێین, ئەوەیە کە هەندێك لە زانا گەورەکانی بواری پەروەردەو ڕەوشت لە وڵاتانی ڕۆژئاوا نەخشەیان بۆ کێشاوەو لە هەوڵی ئەوەدان بیکەنە هۆی ڕزگارکردنی کۆمەڵگە لە بێ باوەڕی و ڕیسوایی و تاوانکاری و سەرگەردانی.

**ئەمانەی لای خوارەوە هەندێك لە وتەکانیانە لەو بارەوە:**

- دوستوفسکی کە یەکێکە لە چیرۆك نووسە گەورەو بەناوبانگەکانی جیهانی ڕۆژئاوا ڕوونی دەکاتەوەو دەڵێ: ئەگەر ئادەمیزاد پشتی کردە خوای گەورەو دوورکەوتەوە لە خوا پەرستی شەیتانەکان دەیبەن بەرەو سەرەنجامێکی خراپ و نادیار.

- ڤۆڵتێر ئەدیبی فەرەنسی بەناوبانگ گاڵتە بەو کەسانە دەکات کە بێباوەڕو ماددە پەرست و بەگومانن دەڵێ: بۆچی بەگومانن لە بوونی خوا ئەگەر لەبەر ئەو نەبوایە هاوسەرەکەم خیانەتی زەوجی لێدەکردم و, خزمەتکارەکەشم دزی!!.

- دوکتۆر هنری لۆنگ کە پزیشکێکی دەروونی ئەمریکیە لە کتێبی( گەڕانەوە بۆ ئیمان)دا دەڵێ: بەراستی ئەو باوکانەی دەپرسن چۆن بۆ گەشەپێدانی ئاکارو ڕەوشتی جوان پەروەردەو فێرکردنی منداڵەکانیان, لە کاتێکدا خۆیان پێشتر بوونەتە هۆی کەمکردنەوەی کاریگەری ئایین لەسەر خورەوشتیان, بێگومان تووشی کێشەیەك بوونەتەوە چارەسەری نیە, هیچ شتێکیش جێگەی ئەو هێزە مەزنە ناگرێتەوە کە ئیمان بە پەروەردگاری بەدیهێنەر دروستی دەکات لەدڵی خەڵکدا..

- گۆڤاری حەج کە لە مەککە دەردەچوو لە بەشی سێیەمی ساڵی (٢٣)یدا دەگێڕێتەوەو دەنوسێت: سوتیلانای کە کچی ستالینی شیوعی سەرۆکی پێشوی ڕوسیا بوو بەهۆی ئایینەوە نیشتمان و منداڵەکانی بەجێهێشت, لە کاتێکدا ئەو لە

خانەوادەیەکی بێباوەڕدا گەورە بوو بوو کەسیان ناوی پەروەردگاریان نەدەزانی, بەڵام سوتیلانا کاتێ گەیشتە تەمەنی لاوی, بەبێ هیچ هۆکارێکی دەرەکی هەستێکی بەهێزی بۆ دروستبوو دەیگوت: بەراستی ژیان بەبێ ئیمان بەخوای پەروەردگار هیچ نرخێکی نیە, وەك چۆن ویژدان و دادپەروەری نابێت لەناو خەڵکدا بەبێ ئیمان بەخوا, لە ناخی خۆیدا هەستی بەوەکرد کە ئادەمیزاد چۆن پێویستی بە ئاوو هەوایە ئاوەهاش پێویستی بە ئیمان هەیە..

- فەیلەسوفێکی گەورە (کانت) رایگەیاندووەو دەڵێ: بەبێ ئەم سێ بیروباوەڕە رەوشت هیچ بوونێکی نیە: (باوەڕ بە بوونی پەرستراو واتە(الله), باوەڕ بە مانەوەی رۆح, باوەڕ بە لێپێچینەوە لە دوای مردن).

بە کورتی ئەوەی لەپێشەوە باسکرا ئەوەیە: ئیمان بەخوا بناغەو بنچینەی چاکسازی منداڵە, دەستەبەرکردنی پەروەردەی رەوشتی و دەروونیەتی.. برای خوێنەری بەڕێز ئەوەی بینیت وتەی زاناکانی جیهان بوو دەربارەی پەروەردەو رەوشت, کە چەندە پەیوەندی بەهێزو پتەوە لە نێوان ئیمان و رەوشت و, عەقیدەو کردەوەوە, بەویستی خوا لە باسی(بەرپرسیارێتی پەروەردەی رەوشتی)دا بەدرێژی باسی کاریگەری ئیمان دەکەین لەسەر ئاکاری منداڵ و پاککردنەوەی رەوشتی و, راستکردنەوەی لاریەکانی, خوا مەبەستمانە, داوای سەرکەوتن و کۆمەکی هەر لەو دەکەین هەر ئەویشە چاکترین پشتیوانە.

پوختەی قسە ئەوەیە: بەراستی بەرپرسیارێتی پەروەردەی ئیمانی لای پەروەردەکاران و دایکان و باوکان.. بەرپرسێتیەکی گەورەو گرنگە چونکە سەرچاوەی هەموو کاروکردەوە چاکەکانە, بەڵکو پاڵپشتێکی سەرەکیە بۆ چوونە ناو قەڵای ئیمان و, فیترەتی پاکی ئیسلامەتیەوە.. بەبێ ئەو پەروەردەیە منداڵ هەڵناسێ بە جێبەجێکردنی بەو بەرپرسێتیە, مانای ئینسانیەت نازانێ, نابێتە نمونەیەکی چاك و بەرز, مەبەست و ئامانجی خۆی نازانێ.. بەڵکو وەك ئاژەڵ ئەژی و غەمی هیچ شتێکی نیە تەنها ئەوەندە نەبێ سکی تێربێ و برسی نەبێ, هەواو ئارەزووە سەرکەشەکانی تێر بکاو, هاوڕێیەتی و تێکەڵی تاوانبارو چەقاوەسوەکان بکا, ئەو

کاتە دەچێتە ریزی بێباوەڕو گومڕایانەوە, خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ..﴾. محمد١٢. واتە: ئەوانەی بێباوەڕبوون رادەبوێرن وەك ئاژەڵ دەخۆن و دەلەوەڕێن, دۆزەخ شوێنی مانەوەیانە.

پێویستە پەروەردەکارو باوك لە هەر شوێن و کاتێکدا هەلیان بۆ هەڵکەوت لەدەستی خۆیانی نەدەن و ئەو هەلە بقۆزنەوە, بەڵگە بهێننەوە بۆ منداڵ لەسەر بوونی خوا, رێنماییان بکەن بۆ دامەزراوی لەسەر ئیمان و عەقیدە, ئەمەش شێوەو چۆنیەتی پەروەدەکاری یەکەم پێغەمبەری پێشەوا بووە صلی الله علیه وسلم کە هەمیشەو بەردەوام هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی منداڵان ئاراستە بکا بۆ لای هەر شتێك ئیمان و دڵنیایی جێگیرو دامەزراو بکا لە ناخیاندا و, شان و شەوکەتیان بەرزکاتەوە..

**ئەمانەی لای خوارەوە چۆنیەتی ئاراستەکردنی پێغەمبەری پێشەوان صلی الله علیه وسلم لەو بارەوە:**

* ئیبن عەباس رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: رۆژێکیان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەسەر وڵاخەکەیەوە بوو منیشی لە پاشکوی خۆیەوە سوار کردبوو، بەمنی فەرموو: (**يَا غُلَامُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ احْفَظْ اللَّهَ يَحْفَظْكَ احْفَظْ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلْ اللَّهَ وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ رُفِعَتْ الْأَقْلَامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ**)[1]. واتە: ئەی غولام رۆڵە گیان! چەند وشەیەکت فێردەکەم لەبەریان بکە: سنووری ئایینەکەی خوا بپارێزە، خوایش دەتپارێزێت, سنووی ئاینەکەی خوا بپارێزەو فەرمانەکانی جێبەجێ بکە دەبینی خوداش دەبێتە کۆمەکت و پشیتوانیت لێدەکات، هەرکات داواتکرد تەنها لە خودا بپاڕێژەوەو داوابکە، هەرکات داوای کۆمەکیت کرد داوای کۆمەکی لەخوا بکە پشت تەنها بەو ببەستە، ئەوەش بزانە گەر هەموو خەڵك کۆببنەوەو بیانەوێ قازانجێکت پێ بگەیەنن لە شتێکدا، جگە لەوەی خوا بۆی نوسیبیت، ناتوانن شتێك قازانجت پێ

[1] - أخرجه الترمذي, وقال الشيخ الألباني: صحيح, جامع الترمذي:٤/ ٦٦٧ برقم: ٢٥١٦.

بگەیەنن, خۆ ئەگەر کۆبوونەوە بۆ ئەوەی شتێك زیانت پێ بگەبەنن، ناتوانن زیانت پێ بگەبەنن مەگەر ئەوەی خوا بۆی نووسیویت، کاغەزو قەڵەم پێچراونەتەوەو هەڵگیراون و نوسراوەکان وشك بوونەتەوە.

لە ریوایەتێکی تردا ئەمەشی بۆ زیادکراوە: ( **احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ أَمَامَكَ، تَعرَّفْ إِلَى اللهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفكَ فِي الشِّدَّةِ، وَاعْلَمْ : أَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبكَ، وَمَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَاعْلَمْ: أَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ، وَأَنَّ الفَرَجَ مَعَ الكَرْبِ، وَأَنَّ مَعَ العُسْرِ يُسْراً).** واتە: لە کاتی خۆشیدا خوا بناسەو خۆتی پێ بناسێنە، لەکاتی تەنگانەدا دێت بەهاناتەوەو دەتناسێت و دەروی خێرت لێدەکاتەوە، ئەوەش بزانە: هەرشتێك بەشی خەڵکی تر بێت ناکەوێتە دەستت, ئەوەی بۆ تۆ دیاری کرابێ هەردەستت دەکەوێت و دێت بۆلات, ئەوەش بزانە سەرکەوتن لەگەڵ خوگرتن و ئارامیدایە، فەرەحی و دەروو لێکردنەوەش لەگەڵ تەنگانەو ناخوشیدایە، لەگەڵ ناخوشیدا خۆشی دێت[1].

لە کۆتایی ئەم باسەدا پێشنیار دەکەین بۆ مامۆستایان و باوکان و دایکان.. کە چاکترین کتێب هەڵبژێرن بۆ پەروەردەو فێرکردنی عەقیدەو بیروباوەڕی یەکتاپەرستی بە قوتابی و منداڵەکانیان لەتەمەنی گەشەکردنیانەوە قۆناغ لەدوای قۆناغ هەر قۆناغێ بگونجێ لەگەڵ تەمەنی منداڵ و پێگەیشتن و رۆشنبیریدا..

قوناغی یەکەم - لەنێوان دە ساڵی تا پانزە ساڵی:

١ -کتێبی **(المعرفة)** دانراوی (عبد الكريم رفاعی).

٢ - کتێبی(**العقائد**) دانراوی پێشەوا حەسەن بەننا.

٣ - کتێبی(**جواهر الكلامية**) دانراوی شێخ تاهیر جەزائیری .

قوناغی دووەم - لەنێوان تەمەنی بالغ بوون بۆ بیست ساڵی:

١ - کتێبی(**أصول العقائد**) دانراوی مامۆستا عبدالله عروانی.

٢ - کتێبی(**الوجود الحق** ) دانراوی حەسەن هوەیدی .

٣ -کتێبی (**الشبهات و ردود**) دانراوی د. عبدالله ناصح عەلوان.

---

[1] - صحيح رواه حاكم والطبراني و أحمد: ٣٠٧/١, , وأنظرصحيح جامع: ٧٩٥٧.

قۆناغی سێیەم - لەدوای بیست ساڵی :

١ - کتێبی(**کبری يقينيات الكونية**) دانراوی (**محمد سعيد رمضان البوطي**).

٢ - کتێبی(**الله جل جلالة**) دانراوی: سەعید حەوا.

٣ - کتێبی (**قصة الايمان**) دانراوی (نديم جسر).

لەدوای قوناغی دووەم و سێیەمەوە لاوەکان ئەتوانن ئەم سەرچاوە عەقیدەیی و فیکریانەی تر بکڕن و بخوێننەوە چونکە ئیمانیان زیاد دەبێ و, لایەنی عەقیدەیان جێگیرو دامەزراو دەکات و, سوودی زۆریان لێ وەردەگرن:

١ - (**الدين فى مواجهة العلم**) دانراوی مامۆستا (وحيد الدين خان).

٢ - (**الاسلام يتحدى**) دانراوی مامۆستا (وحيد الدين خان).

٣ - (**الله يتجلى فى عصر العلم**) دانراوی کۆمەڵێ لە زانایانی رۆژئاوا.

٤ - (**العلم يدعوا الى الايمان**) دانراوی کریسی موریسون.

٥ - (**الله والعلم الحديث**) دانراوی (عبد الرزاق نوفل).

٦ - (**طب فى محراب الايمان**) دانراوی (د.خالص كنجو).

٧ - (**قصة الهداية**) دانراوی دکتۆر عبدالله ناصح علوان.

جگە لەمانەش چەندەها کتێبی تر کە ئیمان و بیروباوەڕ پتەو دەکەن، مانای عەقیدەو ئیسلام لەدڵ و دەرووندا جێگیرو دامەزراو دەکەن. ئەگەر منداڵ تێگەیشتوو رۆشنبیر بوو ئەوە دەتوانێت تا قۆناغی زانکۆ دەتوانێ ئەم کتێبانە بخوێنێتەوە, بەڵام ئەگەر منداڵ قۆناغی سەرەتایی تەواو نەکردبوو, وازی لە خوێندن هێنا بۆ دەستەبەرکردنی بژێوی ژیان, ئەوا پێویستە لەسەر باوکی هەموو هەوڵێك بخاتەگەڕ بۆ فێرکردنی بیروباوەڕی یەکتاپەرستی لە کاتێکدا کە بەتاڵ و بێ کاربوو, ئەویش بەوە دەبێ کە مامۆستای کارامەی بۆ هەڵبژێرێت تا لەسەر دەستیدا فێری بنەماکانی ئیمان بێ و, بیروباوەڕی یەکتاپەرستی پاك لە دەروونیدا جێگیر بێ, هەتا بەروونی بۆی دەرکەوێت و بزانێ خوای گەورە چی پێ خۆشە, چی دروستە, چی دروست نیە.. ئەگەر ئاوەها بوو ئەو کاتە لەسەر پەروەردەیەکی ئیمانی پوخت گەشەدەکات.. ئیتر گومان و دوو دڵی نایهەژێنێ و ناکەوێتە شوێن بیروباوەڕی گومڕایی و سەرگەردان نابێ!!.

# بەندی دووەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی رەوشتی

مەبەست لە پەروەردەی رەوشتی: کۆمەڵێك بیرباوەڕی رەوشت و ئاکارو ئادابی جوان و ویژدانیە کە منداڵ زیاد لە هەموو شتێك پێوستی پێیەتی، کە پێویستە هەر لەسەرەتاوە منداڵ فێریان بێ و رابهێنرێ لەسەریان تا ئەو کاتەی پێدەگات و فام و هۆش دەکاتەوەو هەتا دەبێتە لاوێك و دەکەوێتە ناو ناخۆشیەکانی ژیان و بەرگەیان دەگرێت.. بێگومان هیچ موناقەشەی تێدا ناکرێ کە نمونەی ئەو رەوشت و ئاکارە بەرزو ویژدانیانە بەرهەمێکن لە بەرهەمەکانی ئیمانی جێگیرو, پەروەردەبوون لەسەر ئایینی راست و دروست.

ئەگەر منداڵ لەسەرەتاوە لەسەر باوەڕ بەخوای پەروەردگار گەشەبکا, پەروەردەبکرێ لەسەر ترسان لە خوا، خوای گەورە بەچاودێر بزانێ بەسەر خۆیەوە، پشت و پەنای هەر بەو بێ ، داوای یارمەتی و کۆمەکی هەر لەو بکا، تەسلیم بێت بەخوای گەورە لە خۆشی و ناخۆشیدا.. ئەوە خووی بەفیترەتی پاکی خۆیەوە گرتووەو وەڵامی ویژدانی خۆی داوەتەوە، هەموو رێزو چاکەیەکی قبوڵ کردووە, راهاتووە لەسەر هەموو کردەوەیەکی جوان و خووڕەوشتێکی بەرز.. چونکە ئەو ئایینە لە ناخیدا ڕەگی داکوتاوە، چاودێری خوایی جێگیر بووە لە ناخ و ویژدانیدا، موحاسەبەی نەفسی زاڵبووە بەسەر بیرو هۆشییدا.. هەموو ئەمانە وادەکات لە منداڵ دووربکەوێتەوە لە هەرچی بەدڕەوشتی و خراپەو تاوانە، هەروەها خۆی بپارێزێ لە هەرچی دابونەریتی خراپی نەفامیە.. بەڵکو روودەکاتە خێرو چاکەو خوویان پێوەدەگرێ, شەیدای رەوشتە بەرزو ئاکارە جوانەکان دەبێ و, دەبنە جوانترین و بەرزترین رەوشت و سیفاتی..

ئەوەش زیاتر لەسەر ئەمە دڵنیامان دەکاتەوە سەرکەوتنی زانستی ئەزمونی زۆربەی ئەو باوکە ئیماندارانەیە کە لەگەڵ منداڵەکانیاندا گرتویانەتەبەر, وە زۆربەی ئەو سەرپەرشتیارو پەروەردەکارانەیە لەگەڵ موریدو قوتابیەکانیاندا, ئەم ئەزمونەش شتێکی ئاشکرایە لە ژیان و بەسەرهاتی پیاوانی پێشین و, جیهانی واقیعدا.. پێشتر لەو بارەوە هەڵوێستی (موحەممەدی کوڕی سوار)مان بۆ باسکردن لەگەڵ

خوشکەزاکەیدا کە چۆن پەروەردەی کرد لەسەر ئیمان و یژدان و دەروونی پاککردەوە, بینیمان چۆن دەروونی چاك بوو بەو راهێنانەی خاڵی لەسەر خوای گەورە بەچاودێر زانین و، لە خوا ترسان و، پشت و پەنا پێ بەستنی.. ئەوەش بە وتنەوەی ئەم وشانە( **الله معي , الله ناضر إليَّ, الله شاهدي)** لە نهێنی و ئاشکرادا, لە تەنهایی و قەرەباڵغیدا.

بێگومان کاتێ پەروەردەی منداڵ دووربوو لە بیروباوەڕی ئیسلام و, ئاڕاستەی دیینی لێ داماڵڕاو، پەیوەندی لەگەڵ خوای گەورەدا پچڕان.. ئەو منداڵە توشی هەڵوەشانەوەی ڕەوشتی دەبێ و لەسەر گومڕایی و بێباوەری گەورە دەبێ، بەڵکو شوینکەوتەی هەواو ئارەزووی دەبێ، لە شوێن داواکاریەکانی نەفسی فەرماندەر بەخراپە دڕوات، شەیتان وەسوەسە دەخاتە دڵی و دەیبات بەرەو رەوشت و ئارەزووە نزمەکان.

ئادەمیزاد چوار لایەنی رەوشتی نەفسی هەیە

١ - **(الهاديء المسالم)** واتە: لایەنی هێمن و بێوەیی.

٢ - **(البهيمي)** واتە: لایەنی ئاژەڵی.

٣ - **(العصبي)** واتە: لایەنی دەمارگیری.

٤ - **(الشيطاني)** واتە: لایەنی شەیتانی.

١ - ئەگەر حەزوو کردارو ئارەزووکانی لە جۆری هێمن و بێوەی بوو ئەوا ژیانێکی بێ ئاگایی و گێل و نەزانانە دەباتەسەر، زیندوویەکە وەك مردوو دەژی، ئامادەیە وەك ونبوو, کەس هەست بەژیانی ناکات و سوودی بۆ کەس نیە، هیچ کەلێن و بۆشاییەك لەدوای مردنی بەجێ ناهێڵێ، وەك شاعیر دەڵێ :

**فذاك الذي إن عاش لم يُنتفع بـه**

**وإن مات لاتبكي عليه أقاربـه.**

واتە: ئەوەی لە ژیاندا کەس سوودی لێ نەبینێ، کاتێ کە مرد خزمەکانیشی بۆی ناگرین.

٢ - ئەگەر لایەنی ئاژەڵی سەرکەوت بەسەر لایەنی نەفسیدا رایدەکێشێ بەدوای حەزو ئارەزووە سەرکەشەکانیدا, هەموو بەربەستە حەرامکراوەکان پێشێل دەکا،

هەموو ڕێگایەکی حەرام دەگرێتەبەر بۆ گەیشتن بە حەزو ئارەزووەکانی.. گوێ شەرم و شکۆ نایگێڕێتەوە, ناترسێ لەئابروو چوونی، ویژدانی سەرکوتی ناکات، ژیری و عەقڵی بەرگری لێناکا، ئەویش وەك ئەبو نەواس شاعیری گەورە عەرەب لەم شیعرەدا گوتویەتی دەڵێ:

**إنمّا الدنيا طعام وشراب وندام**

**فإذا فاتك هذا فعلى الدنيا السلام.**

واتە: بەڕاستی دنیا بریتیە لە خواردن و خواردنەوەو مێز ڕازاندنەوە بۆ مەی نۆشین، ئەکەر ئەمانەت لەدەستدا، ئەوە خوا حافیزیت لە دنیا کردووە[١].

٣- ئەگەر جۆری دەرماگیری زاڵبوو بەسەریدا ئیتر هەموو هیواو ئاواتێکی لوت بەرزی دەبێت لەسەر زەویدا، خۆ بەگەورە دەگرێ و فیز بەسەر خەڵکدا دەکا, خۆدەرخستن پیشەی دەبێ, ئەگەر دەسەڵاتی کەوتەدەست، بەزمان فەخرو شانازی دەکات، بەکردەوەکانی دەنازێ و پۆرت لێ دەدا، فڕوفێڵ لە خەڵك دەکات, هیچ بەلایەوە گرنگ نیە لەو پێناوەدا لە کەللەی سەری مرۆڤەکان کوشکێ بونیاد بنێ و بەخوێنی بێتاوان و پیاوچاکان نەخش و نیگارەکانی بیڕازێنێتەوە، دروشمی وتەی ئەم شاعیرە دەبێ کە دەڵێت:

**لنا الدنيا ومن أمسى عليها**

**ونبطش حين نبطش قادرينا**

**بغاة ظالمين وما ظُلما**

**ولكنا سنبدأ ظالمينا**

**إذا بلغ الرضيع فطاما**

**تخرّ له الجبابر ساجدينا.**

٤- کاتێك لایەنی شەیتانی زاڵبوو ئەوا پیلان ئەگێرێ، جیاوازی دەخاتە نێوان خۆشەویستان، مین دادەنی بۆ ئەوەی بتەقێتەوەو خەڵك لەناو بەرێ، دەریاو روبارەکان

---

[1] - ئەم شیعرانەی ئەبو نەواس خەڵك هاندەدات بۆ خواردن خواردنەوەی مەی نۆشین و رابواردن.. بێگومان ئەگەر دنیا هەرئەوەندە نرخی بێ ئەوا ئاژەڵەکان لە مرۆڤ زیاتر دەخۆن و دەخۆنەوەو رادەبوێرن!!. وەرگێڕ.

ژەهراوی دەکا بۆ کوشتن و لەناوبردنی مرۆڤەکان، ئاوەکان لێڵ دەکات بۆ ئەوەی راوی خۆی بکا، گوناهو تاوان دەڕازێنێتەوەو جوانیان دەکات، بە زیناکردن فریو دەخوات، کێشەو دووبەرەکی دەخاتە نێوان خەڵکەوە، لەگەڵ ئەم شاعیرەدا دەڵێت:

**إذا أنت لم تنفع فضر فإنما**

**يُرجىّ الفتى كيما يضر وينفعا.**

واتە : ئەگەر تۆ قازانج و سوودت نیە زیان بگەیەنە, بەڕاستی هیواو ئاواتی گەنج ئەوەیە کەی زیان بگەیەنێ ئەو کاتە قازانجی کردووەو سوودی گەیاندووە.

بەو شێوەیە هەریەکێ لەوانە نەفسی فەرماندەر بەخراپە دەیخولێنێتەوە، حەزو ئارەزووەکانی بۆ کوێیان بوێت دەیبەن، ملکەچی حەزوو ئارەزووی دەبێ، ئارەزووەکانی کوێرو کەڕی دەکەن و دەبێتە بەندەی ئارەزووەکانی و ئەیانپەرستێ, خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿**وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ..**﴾. **القصص ٥.** واتە: کێ لەو کەسە گومڕا ترە کە شۆین ئارەزووەکانی خۆی بکەوێت، بێ رێنموونی لەلایەن خواوە..

کورتەی ئەوەی لە پێشەوە باسکرا ئەوە دەگەیەنێ: پەروەردەی ئیمانی هاوسەنگی حەزو ئارەووە سەرکەشەکان رادەگرێ، خراپە و خوارو خێچی راست دەکاتەوە، چاکسازی نەفسی مرۆڤ دەکا.. بەبێ ئەوەش چاکسازی ناکرێ, هەست بەئارامی و دامەزراوی ناکرێ، خوڕەوشت راست و دروست نابێ..

ئەوەش پەیوەندیەکی پتەوە لەنێوان ئیمان و خوڕەوشتدا، پەیوەندیەکی بەتین و پتەوە لەنێوان بیروباوەڕو کردوەوەدا, زانایانی بواری پەروەردەو کۆمەڵایەتی رۆژئاوا خەڵکیان لێ ئاگادار کردۆتەوە، لەناو زۆربەی گەلانی جیهاندا بیرو بۆچوونەکانیان بڵاوکردۆتەوەو, خەڵکیان بۆ ئاڕاستەکردووە.. سەلماندویانە بۆ خەڵك کە بەبێ ئایین ژیان ئاشتی و ئارامی بەخۆیەوە نابینێ، بەبێ باوەڕبوون بەخوا چاکسازی لەکۆمەڵگەدا ناکرێ و، خوڕەوشتیان راست نابێتەوە..

**ئەوەش ئێوەو هەندێ لە بیرو بۆچوون و ئاڕاستەکانیان لەو بارەوە:**

- (فیختە) فەیلەسوفی ناسراوی ئەڵمانی دەڵێ: رەوشت بەبێ ئایین گەمەو گاڵتەیە.

- (گاندی) سەرۆکی ناسراوی پێشوی هیندستان دەڵێ: بەڕاستی ئایین و ئاکارو ڕەوشتە بەرزەکان هەریەك شتن و هەڵناگرێ لێك جیابکرێنەوە، لێك جوودانین و پارچە پارچە ناکرێن.. بەڕاستی ئایین وەك ڕۆحە وایە بۆ ڕەوشت، ڕەوشتیش وەك ژینگە وایە بۆ ڕۆح، بە عیبارەتێکی تر ئایین خۆراك و توشێوی ڕەوشتە گەشەی پێدەدات و ئەیژێنێتەوە، هەروەك چۆن ئاو خۆراك و توشێوی کشتوکاڵەو گەشەی پێدەکات.

- (دینغ) قازی بەریتانی دەربارەی بەدڕەوشتیەکانی وەزیری بەریتانی پێشوو وتویەتی: بەبێ ئایین مەحاڵە خوڕەوشتی جوان بەدی بهێنرێت، بەبێ خوڕەوشتی جوانیش مەحاڵە یاسا بچەسپێ و دەوری خۆی ببێنی!!.. ئایین تاکە سەرچاوەیەکی پاکە بەویش ڕەوشتی چاك لە خراپ جیادەکرێتەوەو دەناسرێ, ئاییینە مرۆڤ بە نمونەی بەرزەوە دەبەستێتەوە، کاری بۆ دەکا، هەر ئاینە خود پەرستی مرۆڤەکان وەلادەنێ و, زاڵدەبێ بەسەر دابونەریتە خراپەکانیدا, ئاییینە هەڵچوونە ناسروشتیەکانی دادەمرکێنێتەوەو, ویژدانی زیندووی پەروەردە دەکات لەسەر ئەو بنچینەو بنەمایەش کۆشکی ڕەوشتە بەرزەکان بنیات دەنرێ.

- (کانت) فەیلەسوف وەك لە پێشەوە باسکرا دەڵێ: بەبێ ئەم سێ بیروباوەڕانە ڕەوشتی جوان هیچ بوونێکی نابێ: باوەڕ بەبوونی خوای پەروەردگار، باوەڕ بە جاویدانی ڕۆح و نەفەوتانی، باوەڕ لێپێچینەوە لە دوای مردن.

بەلاتانەوە سەیر نەبێ دوای ئەوانەی لە پێشەوە باسکران کە ئیسلام چەندە بایەخ و گرنگی زۆری بەلایەنی پەروەردەی ڕەوشتی منداڵان داوە, ئاراستەی ڕاست و دروستی داناوە بۆ ئەو مەبەستە, تاکو منداڵان پەروەردەبن و ڕابهێنرێن لەسەر ئاکاری بەرزو ڕەوشتی جوان!.

ئەمانەی لای خوارەوەش گرنگترین پەندو ئامۆژگاری و ئاڕاستەکردنێکن کە شەریعەتی پاك و پیرۆزی ئیسلام داینا‌ون بۆ پەروەردەکردنی منداڵ لە بواری ڕەوشتی بەرزو ئاکاری جوانەوە:

* ئەبو ئەیوب لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(مَا نَحَلَ وَالِدٌ وَلَدًا مِنْ نَحْلٍ أَفْضَلَ مِنْ أَدَبٍ حَسَنٍ)**[1].

[1] رواه البخاري في التأريخ الكبير: ٤٢٢/١ برقم ١٢٥٦, وأخرجه الترمذي: ٣٣٨/٤.

واتە: هیچ باوكێك شتێكی نە بەخشیوە بە منداڵەكەی چاكتر بێت لە ئەدەبی جوان.

* ئیبن عەباس رەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**أَكْرِمُوا أَوْلَادَكُمْ وَأَحْسِنُوا أَدَبَهُمْ**)[1]. واتە: رێز لە منداڵەكانتان بگرن و بەچاكی پەروەردەیان بكەن.

* خەلیفەی راشید عەلی كوڕی ئەبو تالیب رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**علموا أولادكُم وأهليكم الخير وأدبهم**)[2]. واتە: منداڵەكانتان و خانەوادەكانتان فێری چاكەو ئەدەبی جوان بكەن.

* ئیبن عەباس رەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**من حق الولد على الوالد أن يحسن أدبه , ويحسن إسمه**)[3]. واتە: حەقی منداڵ لەسەر باوكی ئەوەیە فێری ئەدەب و رەوشتی جوانی بكاو, ناوێكی چاكی لێ بنێ.

* ئەنەس رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: () منداڵ لە رۆژی حەوتەمی تەمەنیدا گوێزەبانەی بۆ دەكرێ, ناوی لێدەنرێت, سەری دەتاشرێ و پیسی و ئازاری لێ لادەبرێ, كاتێ تەمەنی گەیشتە شەش ساڵی فێری ئەدەب و رەوشتی جوان دەكرێ، لە نۆ ساڵیدا جێگای خەوتنی جیادەكرێتەوە، كاتی گەشتە تەمەنی سیانزە ساڵی لەسەر نوێژ نەكردن و رۆژوو نەگرتن لێی دەدرێ، لەشانزە ساڵیدا باوكی ژنی بۆ دەهێنێ و دەستی دەگرێ و پێی دەڵێ: رەوشتی جوانم فێركردی, ئەدەبم دادای, ژنم بۆ هێنای, ئیتر پەنادەگرم بە خوا لە بەلاو ناخۆشیەكانت لە دنیادا، وە لە سزاو ئازاری رۆژی قیامەتیشت[4].

ئەم فەرمودانەی باسكران دەریدەخەن بۆ پەروەردەكاران بەتایبەتی باوكان و دایكان كە چەندە بەرپرسێتیەكی گەورەیان لە ئەستۆدایە بەرامبەر بە پەروەردەكردن و

---

[1] - قال الشيخ الألباني: ضعيف, سنن إبن ماجة: ٣٦٧١, ضعيف الترغيب والترهيب: ٢/ ١٢٣١.

[2] - رواه عبدالرزاق وسعيد إبن منصور.

[3] - أخرجه البيهقي, تحقيق الألباني: (ضعيف) انظر حديث رقم: ٢٧٣٣ في ضعيف الجامع.

[4] - روه إبن حبان.

ئەدەب دادانی منداڵەکانیان لەسەر چاکەو، ڕاهێنانیان لەسەر بیروباوەڕو بنەماکانی ڕەوشتە بەرزو جوانەکان.

بەرپرسێتیان لەو بوارەدا بەرپرسێتیەکی گشتییەو پەیوەندی هەیە بەهەموو ئەو شتانەی کە دڵ و دەروونیان پاك دەکاتەوەو، خوارو خێچیان ڕاست دەکاتەوە، لە ڕەوشت نزمیەوە دەیانبات بەرەو ڕەوشت بەزری و، مامەڵەکردنی چاك لەگەڵ خەڵکانی تردا..

ئەوان بەرپرسن لەوەی لەسەرەتاوە منداڵەکانیان ڕابهێنن لەسەر ڕاستگۆیی، پاراستنی ئەمانەت، دامەرزاوی، خۆنەویستی، فریاکەوتنی لێقەوماوان و ڕۆشتن بەدەمیانەوە، ڕێزگرتن لە میوان وە گەورەساڵان، چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ، ئەوین و خۆشەویستی بۆ کەسانی تر..

ئەوان بەرپرسن لە پاککردنەوەی زمانیان لە جنێودان و قسەی ناشیرین و، هەرشتێ پەیوەندی هەبێ بەلەکەدارکردنی ڕەوشت و خراپ پەروەردە کردنیانەوە..

بەرپرسن لە بەرزکردنەوەی ئاستیان، پارستنیان لە ڕەوشت نزمی و، دابونەریتی خراپ و ڕەوشتی ناشیرین و، هەرشتێ زیان بگەیەنێ بەشەرەف و کەرامەت و پیاوەتیان..

بەرپرسن لە ڕاهێنانیان لەسەر هەستی مرۆڤایەتی بەرز، هەست و سۆزی ڕەسەن، وەك چاکە لەگەڵ هەتیوان، یارمەتیدانی هەژاران و بەزەیی هاتنەوە بە بێوەژناندا..

ئەمانەو چەندەها بەرپرسێتی گەورەو گشتی تر کە پەیوەندیان هەیە بەپاککردنەوەی خورەوشتیان لە هەموو جۆرە کارێکی ناشایستەو نەشیاو..

مادەم پەروەردەی چاك لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بە پلەی یەکەم پشت بەهێزی چاودێری و تێبینی دەبەستێ.. زۆر جێگەی خۆیەتی کە باوکان و دایکان و مامۆستایان و، هەرکەسێ گرنگی دەدات بە پەروەردەی ڕەوشتی.. تێبینی ئەم چوار دیاردانە بکات لە منداڵانداو گرنگی پێبدات، چونکە ئەمانە خراپترین کردەوەن، نزمترین ڕەوشت و، سووك و ریسواترین سیفاتن:

١ - دیاردەی درۆکردن. ٢ - دیاردەی دزیکردن.

٣- دیاردەی جنێودان و دەم پیسی.        ٤- دیاردەی بەدرەوشتی و بەرەڵایی.

**١- دیاردەی درۆکردن:**

بێگومان درۆکردن لە روانگەی ئیسلامەوە خراپیترین دیاردەیە شتێکی زۆر ناشیرینە، پێویستە لەسەر پەروەردەکاران منداڵانی لێ بپارێزن, هەموو هەوڵێکیان بخەنەگەڕ بۆ لە ناوبردنی ئەو دیاردەیە، گرنگی زۆر بدەن بەو لایەنەو، لە رەگەوە لە دڵ و دەروونی منداڵدا هەڵیکێشن، وایان فێرکەن هەڵبێن لە درۆکردن و دوورکەونەوە لە پیسی نیفاق و دوورِوویی.

- ئەوەندە بەسە بۆ پیسی و خراپی درۆکردن کە ئیسلام لە ریزی نیشانەکانی دووڕوویدا داینـاوە: عبداللە کوڕی عەمری کوڕی عاص رەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوەو کە پیغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمویەتی: **(أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْ نِفَاقٍ حَتَّى يَدَعَهَا إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ)**[١]. واتە: هەر کەسێك ئەم چوار سیفەتەی تێدابوو ئەوە مونافیقێکی تەواو ناپاکە, هەر کەسێك یەکێکیانی تێدابێت ئەوە نیشانەیەکی مونافیقی تێدایە تاکو وازی لێدەهێنێ: لەکاتی گفتوگۆدا درۆبکا، ئەگەر ئەمانەتێکان دایەدەستی خیانەتی لێبکات, ئەگەر بەڵێن و پەیمانیدا نەیباتەسەرو بێ پەیمان دەرچێ، کاتێ داوایەکی هەبوو لەسەر کەسێ ناهەقی لێدەکاو بەهەق رازی نابێ و بەهەق و ناهەق دەیەوێ قسەی خۆی سەرکەوێ.

* وە بەسە بۆ خراپی و ناشیرینی درۆکردن کە دەبێە هۆی سزای سەخت بۆ خاوەنەکەی لە رۆژی قیامەتدا، ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاوەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمویەتی: **(ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: شَيْخٌ زَانٍ, وَمَلِكٌ كَذَّابٌ, وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ)**[٢]. واتە: سێ کەس لە قیامەتدا خودا نەقسەیان لەگەڵ دەکات، نەپاکیان دەکاتەوەو نەتەماشایان دەکات سەرەڕای ئەوەش سزای سەخت و بەسۆیان دەدات: پیری شەرواڵ

---

[1] - متفقٌ عَلَيْهِ:أخرجه البخاري ١٥/١ ( ٣٤ ) ، ومسلم ٥٦/١ ( ٥٨ ) ( ١٠٦ ) .

[2] - أخرجه مسلم ٧٢/١ ( ١٠٧ ) ( ١٧٢ ) .

پس و زیناکەر، پاشاو فەرمانڕەوای درۆزن، هەژاری لوت بەرزو خۆ بەگەورەزان.

* ئەوەندە بەسە بۆ پیسی و خراپی درۆکردن کە ئەوەی بەردەوام بێ لەسەری دەچێتە ریزی درۆزنان و سەرەنجامی بۆ ناو ئاگری دۆزەخە: عبداللە کوڕی مەسعود رەزای خوای لێ بێ گێڕاوەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمویەتی: **(إِيَّاكُم وَالْكَذِبَ, فإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ عِندَ اللهِ كَذَّابًا)**[1]. واتە: ئێوە ئاگادربن و خۆتان بپارێزن لە درۆکردن, چونکە درۆکردن مرۆڤ دەبات بەرەو خراپەو تاوان, خراپەو تاوانیش بەرەو ئاگری دۆزەخ, پیاو بەردەوام ئەوەندە درۆدەکات تا لای خوای گەورە بەدرۆزن دێتە هەژمارو ناوی لەریزی درۆزنان دەنوسرێ.

* ئەوەندە بەسە بۆ پیسی و خراپی درۆکردن ئیسلام بە خیانەتی گەورەی وەسف کردووە: سوفیانی کوڕی ئوسەید رەزای خوای لێ بێ فەرموی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم دەیفەرموو: **(كَبُرَتْ خِيَانَةً أَنْ تُحَدِّثَ أَخَاكَ حَدِيثًا هُوَ لَكَ بِهِ مُصَدِّقٌ وَأَنْتَ لَهُ بِهِ كَاذِبٌ)**[2]. واتە: گەورەترین خیانەت ئەوەیە تۆ قسەیەك بکەی بۆ برا موسوڵمانەکەت ئەو بەڕاستی بزانێ، بەڵام تۆ درۆی لەگەڵدا بکەیت.

ئا ئەوە دیاردەی درۆکردن و سەرەنجامی درۆزنەکان بوو بۆیە پێویستە لەسەر پەروەردەکاران منداڵانی لێ بپاریزن، لە زیان و سەرەنجامی بیان ترسێنن و تێیان بگەیەنن تا نەکەونە داوی و لە رێگەی راست لایان نەدات..

مادەم پەروەردی چاك لە روانگەی پەروەردەکارانەوە پشت ئەستوورە بە پێشەنگی چاکەوە.. چاکتر وایە بۆ هەموو بەرپرسێك و پەروەردەکارێ درۆنەکەن بۆ بێ دەنگکردن و ئاشتکردنەوەو هێورکردنەوەی توڕەیی منداڵەکانیان.. چونکە ئەگەر درۆیانکرد لەگەڵیان ئەوە رایاندەهێن لەسەر درۆکردن و دەبنە پێشەنگێکی خراپ بۆیان و فێری درۆکردنیان دەکەن، کە ئەوەش سووك و ریسواترین رەوشتە.. ئەمە جگە لەوەی متمانە و سیقەیان بەقسەی پەروەردەکارەکەیان نامێنێ، ئیتر پەندو ئامۆژگاریەکانیان

1- متفقٌ عَلَيْهِ: البخاري:٦٠٩٤, ومسلم:٢٦٠٧.

2- قال الشيخ الألباني: ضعيف, سنن أبو داود : ٤٩٧١, مشكاة المصابيح: ٤٨٤٥/٣.

کاریگەری نابێ لە سەریان.

لەبەر ئەمەیە دەبینین پەروەردەکارو پێشەنگی چاکی یەکەم پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم هۆشیاری داوە بە دۆستان و پەروەدەکاران کە درۆنەکەن لەبەردەم منداڵەکانیاندا بابەگاڵتەشەوە بێت یان بۆ دڵخۆشکردنیان بێ، تاکو لای خودا بەدرۆیەك بۆیان تۆمار نەکرێ..

* (عبداللە کوڕی عامر) رەزای خوای لێ بێ فەرموی: **(دَعَتْنِي أُمِّي يَوْمًا وَرَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ قَاعِدٌ فِي بَيْتِنَا فَقَالَتْ: هَا تَعَالَ أُعْطِيكَ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَا أَرَدْتِ أَنْ تُعْطِيه, قَالَتْ: أُعْطِيهِ تَمْرًا فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَا إِنَّكِ لَوْ لَمْ تُعْطِهِ شَيْئًا كُتِبَتْ عَلَيْكِ كِذْبَةٌ)**[1]. واتە: رۆژێکیان دایکم بانگی کردم و گوتی: ها وەرە بتدەمێ، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەماڵمان دانیشتبوو فەرموی: ئەتەوێ چی بدەیتێ؟. وتی: ئەمەوێ خورمای بدەمێ. پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: ئەگەر شتێکی نەدەیتی ئەوە درۆیەکت لەسەر تۆمار دەکرێت.

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاوەتیەوە کە پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(مَنْ قَالَ لِصَبِيٍ تَعَالَ هَاكَ ثُمَّ لَمْ يُعْطِهِ فَهِيَ كَذْبَةٌ)**[2]. واتە: هەرکەسێك بەمنداڵەکەی بڵێ هانێ بیگرە، بەڵام هیچی پێنەدات ئەوە درۆیەکی کردووە.

یەکێك لەو بەسەرهاتە دانسقەو بەکەڵکانەی بۆمان دەگێڕنەوە لەارەی ئەوەی کە پێشاینانی چاك چۆن منداڵەکانیان راهێناوە لەسەر راستگۆیی و پەیمان و بەڵێنیان لێ وەردەگرتن کە درۆنەکەن ئەوەیە, کە خواناس و پیاو چاك شێخ(عبدالقادر)ی گەیلانی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کاتێك لەماڵ دەرچووم بەرەو بەغدای شاری زانست و زانیاری و ئاشتی, پایتەختی هارونە رەشید، دایکم چل دیناری پێدام بۆ خەرجی رۆژانەم و پەیمانی لێوەرگرتم کە راستگۆبم و هەرگیز درۆنەکەم، کاتێك گەیشتینە دەوروبەری

---

[1] - صحيح رواه أبو داود :٤٣٣٩ والبيهقي, سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٣٧٤/٤ برقم: ٧٤٨.

[2] - رواه أحمد, سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٣٧٤/٤ برقم: ٧٤٨.

هەمەدان کۆمەڵێ چەتەو دزو جەردەمان لێ پەیدابوو کاروانەکەیان رووتکردنیەوەو هەرچیەکمان پێبوو لێیان سەندین, یەکێك لەدزەکان دای بەلای مندا وتی هیچت پێیە؟ گوتم: چل دینارم پێیە, وا گومانی برد گاڵتەی لەگەڵ دەکەم لێیداو رۆشت، یەکێکی تریان منی بینی وتی: هیچت پێیە؟ گوتم: چل دینارم پێیە، بردمی بۆ لای گەورەکەیان سەرۆکی چەتەکان، ئەویش پرسیاری لێکردم و وتی: چی وای لێکردی راستی بلێی؟ گ: بەڵێن و پەیمانم داوە بەدایکم کە درۆنەکەم، ترسام خیانەت لە پەیمان و بەڵێنەکەی بکەم!!.. سەرۆکی چەتەکان ترسی لێ نیشت کراسەکەی خۆی دادڕی و هاواریکرد وتی: تۆ ترسای خیانەت لە بەڵێن و پەیمانەکەی دایکت بکەیت, بەڵام من ناترسم خیانەت لە بەڵێن و پەیمانی خوای پەروەردگار دەکەم؟!!.. پاشان فەرمانی دەرکرد هەرچی شمەکی کاروانیەکان هەیە بیگێڕنەوە بۆیان، وتیشی: ئەوا من تەوبەم کردو پەشیمانم دەگەڕێمەوە بۆ لای خوا لەسەر دەستی تۆدا، ئەوانەشی لەگەڵی بوون هەر هەموویان بەجارێ وتیان: تۆ گەورەی ئێمە بووی لە چەتەیی و راورووتکردندا، دەبێ لە ئەمڕۆ بەدواوە گەورەشمان بیت لە گەڕانەوە بۆ لای خوادا، هەموویان بە بەرەکەتی ئەو راستگۆییە تەوبەیان کردو گەڕانەوە.

**٢ - دیاردەی دزیکردن:**

ئەم دیاردەیەش مەترسی لە درۆکردن کەمتر نیە، زۆر بەربڵاوە بەتاییەتی لەو ژینگە دواکەوتوانەی کە ئیسلام تێیدا پەیڕەو ناکرێ و خەڵك پەروەردە ناکرێن لەسەر بیروباوەڕی پەروەردەی ئیمانی..

وەك ئاشکرایە ئەگەر منداڵ هەر لەسەرەتاوە پەروەردەیەکی چاك نەکراو گەشەی نەکرد لەسەر ترسان لە خوا، خوای گەورەی بەچاودێر نەزانی بەسەر خۆیەوە، رانەهێرا لەسەر دانەوەی ئەمانەت و بەجێهیانی ئەو مافانەی لە ئەستۆیدایە.. بێگومان ئەو منداڵە فێری فڕوفێڵ و خیانەت و دزیکردن دەبێ و هێدی هێدی رادێت لەسەریانئەو کاتە بەلایەوە ئاسایی دەبێت خواردنی ماڵ و سامانی کەسانی تر بە ناهەق، بەڵکو دەبێتە شەقاوەیەکی وەها کۆمەڵگە خۆی لێ بپارێزێ و، پەنابگرن بەخوا لە کردەوە خراپەکانی..

جا لەبەر ئەوە پێویستە پەروەردەکاران و باوك و دایك چاودێری وردی منداڵەکانیان بکەن لەو دیاردە دزیۆە دووریان بخەنەوە، لە دڵیاندا چاودێری خوایی بچێنن، ترس و لەرزی خوا بخەنە دڵیانەوە، هەروەها ئاگاداریان بکەنەوە لە سەرەنجام و خراپەی دیاردەی دزیکردن، بە سزای سەختی ڕۆژی قیامەت بیان ترسێنن..

ئەوەی جێگەی داخە زۆر لە باوکان و دایکان چاودێری منداڵەکانیان ناکەن بەتەواوی کاتێك دەبینن شمەك و پارەیان پێیە.. هەر ئەوەندە بانگ دەکەنە منداڵەکانیان و دەڵێن: لە کوێتان بووە؟ ئەوانیش دەڵێن: لەسەر ئەو شەقامە کەوتبوو هەڵمان گرتەوە، یان یەکێك لە هاوڕێکانمان بەدیاری بۆی هێناین.. ئیتر ئەوانیش خێرا باوەڕیان پێدەکەن بێ ئەوەی لێی بکۆڵنەوە!!..

شتێکی سروشتیە منداڵ بیانو بەهانەی بەتاڵ بۆ کارە دزێوەکانی خۆی دێنیتەوە لە ترسی ئەوەی نەبادا تۆمەتی بۆ درووستبکەن و ئابڕووی بچێت، هەروەها شتێکی سروشتیە ئەگەر منداڵ لەلایەن پەروەردەکارەکەیەوە گرنگی پێنەدراو لێکۆڵینەوەی وردی لەگەڵدا نەکرا ئەوا دەکەوێتە ناو زەلکاوی خراپەکاری و تاوانەوە.

لەوانەش خراپتر ئەوەیە ئەگەر یەکێ لە دایك و باوکی هەڵێناو ڕێگەی بۆ خۆشکرد دزی بکا، بێگومان ئەو منداڵە تێیدا قووڵ دەبێتەوەو بەلایەوە شتێکی زۆر ئاسایی دەبێ، وەك شاعیر دەڵێ:

**وهل يرجى لأطفال كمال**

**إذا ارتضعوا من ثُديِّ الناقصات.**

واتە: ئایا ئومێد بە منداڵانێك دەکەی تەواو چاك بن، لە کاتێکدا بە شیری ناتەواوەکان گۆشکرابن.

- یەکێك لە دادگا شەرعیەکان حوکمی دادگایی کردنی دزێکی دەرکرد بەوەی کە دەبێت دەستی ببڕدرێت، کاتێك ڕۆژی دادگایی کردنەکەی هاتە پێشەوە، بەدەنگی بەرز پێی وتن: پێش ئەوەی ئێوە دەستی من ببڕن دەبێ من زمانی دایکم ببڕم، چونکە من یەکەم جار هێلکەیەکی ماڵی دراوسێکەمانم دزی, دایکم سەرزەنشت و لۆمەی نەکردم پێی نەوتم: دەبێ بیگەڕێنیەتەوە بۆ ماڵی دراوسێکەمان، بەڵکو هەلهەلەی خۆشی لێداو

وتی: سوپاس بۆ خوا کوڕەکەم بووە بەپیاو، ئەگەر زمانی دایکم نەبوایە, ئەوا نەدەبوومە دز لەناو کۆمەڵگەداو سەرەنجامم بەم شێوەیە نەدەبوو[1].

ئەوە ئیوە ئەی کۆمەڵی باوکان و دایکان چەند نمونەیەك لەسەر خۆراگری و بەردەوامی منداڵانی پێشین و سوربوونیان لەسەر بەجێهێنانی مافەکان و پابەند بوونیان لەسەر پاراستن و دانەوەی ئەمانەت, خیانەت نەکردن, خوا بە چاودێر زانین بەسەر خۆیانەوە لە نهێنی و ئاشکرادا, وە لەهەر جێگاو بارو حاڵەتێکدا بوونایە,.

- عومەری کوڕی خەتاب رەزای خوای لێ بێ بڕیاریدا کە نابێت کەس ئاو تێکەڵ بەشیر بکات بۆ ئەوەی ماستەکەیان زۆربێ و بیفرۆشن بەنرخێکی زیاتر.. ئەوەبوو شەو بەکوڵانەکانی مەدینەدا دەگەڕا گوێی لە مشتومڕی دایك و کچێك بوو، دایکەکە دەیویست ئاو بکاتە ناو شیرەکەوە، کچەکەی پێی وت: دایە گیان ئاوی تێکەڵاو مەکە خەلیفەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب فەرمانی دەرکردووە ئاو نەکرێتە ناو شیرەوە، دایکی وتی: کچم عومەر خەوتووە، کچەکەش وتی: دایە گیان خۆ خوای عومەر نەخەوتووەو دەمان بینێ!!. بەیانی عومەر چوو بۆ ماڵیان و کچەکەی داواکرد بۆ کوڕێکی خۆی، ئەو کچە لەبەر ئەوەی خۆی بە دوورگرت لە حەرام و خوای گەورەی بەچاودێر زانی بەسەر خۆیانەوە, لە کچی ژنێکی فەقیرو هەژارەوە بوو بەبوکی خەلیفەی موسوڵمانان.. ئایا قانون و یاسای دەستکرد دەتوانن ئەوەبکەن؟! دەتوانن چاودێر بن بەسەر هەموو تاوانبارو دزێکەوەو دەستگیری بکەن؟ بێگومان نەخێر مەگەر بەدەگمەن، قانون و یاسا کۆڵەوارە لەو بوارانەدا.. بەڵام ئیمان بەخوداو چاودێری خوایی ئەو بوارە پڕدەکاتەوە..

- عومەر رەزای خوای لێ بێ لە سەفەرێکیدا بەرەو مەککە لەکێوێکدا شوانێکی بینی مەڕی دەلەوەڕاند، عومەر شوانەکەی تاقیکردەوە فەرموی: ئەی شوانەکە! یەکێك لەم مەڕانەمان پێ بفرۆشە، ئەویش وتی: من بەندەم ناتوانم بەبێ مۆڵەتی گەورەکەم بیفرۆشم, عومەر فەرموی: لای گەورەکەت بڵێ گورگ خواردویەتی,

[1] - مامۆستا(مصطفى السباعي) لە کتێبی(أخلاقنا الإجتماعية)لاپەڕە ١٦٢.

شوانەکە وتی: ئەی خوا لە کوێیە؟ ئایا خوا ئاگای لێ نیە؟ عومەر دەستیکرد بەگریان و پاشان لەگەڵ شوانەکەدا چوو بۆ لای گەورەکەی لێی کڕی و ئازادی کرد, ئینجا پێی وت: ئەی بەندەکە لە دنیادا بەهۆی ئەو وشەیەوە رزگات بوو لە کۆیلەیی، هیوادارم خوای گەورەش لە قیامەتدا رزگات بکات لە سزای سەختی دۆزەخ.

**٣- دیاردەی جنێودان و دەم پیسی:**

ناشیرینترین دیارەی بەربڵاوی ناو منداڵان جنێودان و دەم پیسیە، بەتایبەتی لەو شوێنانەی کە دوورن لە پەروەردەی ئیسلامی و رێنماییەکانی قورئان.. هۆی ئەم دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار:

**یەکەم- پێشەنگی خراپ:**

منداڵ کاتێك گوێبیستی وتەی ناشیرین و جونێودان دەبێ لەلایەن دایك و باوکیەوە یان یەکێکیانەوە.. بێگومان وتەکانیان دوپات دەکاتەوەو رادێت لەسەریان و خویان پێوە دەگرێ.. لە کۆتایدا ئەویش هەر وتەی ناشیرین لە زاری دەردەچێ و، بەدرۆو خراپە دەدوێ و, جنێوفرۆش دەدردەچێ.

**دووەم- تێکەڵاوی هاوڕێی خراب:**

منداڵ ئەگەر بەرەڵای جادەو کۆڵانەکان کرا، وازی لێهێنرا بۆ هاوڕێی خراپ.. زۆر بە ئاسانی لەوانەوە فێری وتەی ناشیرین و جنێودان و نەفرتکردن دەبێ، فێری جۆرەها خوڕەوشتی ناشیرین دەبێ، لەسەر پەروەردەیەکی خراپ گەشەدەکات, ئاکار و رەوشتی ناپەسەند دەبێ.

لەبەر ئەم هۆیانەی سەرەوە پێویستە لەسەر دایکان و باوکان و پەروەردەکارلن هەموویان پێشەنگێکی چاك بن بۆ منداڵەکانیان بەگفتوگۆی جوان و شیرین بیان دوێنن، زمانیان پاك راگرن.. هەر وەکو پێویستە لەسەریان لە یاری کۆڵان و جادەو تێکەڵاوی هاوڕێی چەقاوەسو خراپ بیانپارێزن و بەدووریان بگرن، تا نەکەونە داوی لادان و خراپەکانیانەوە، لەرێی راست لایان نەدەن، خوڕەوشتی ناشیرینی لەوانەوە وەرنەگرن.. هەروەها پێویستە لەسەریان چاودێری بەلاکانی زمانیان بن و لە زیانەکانی ئاگاداریان بکەنەوە، تا سەرەنجام نەبێتە هۆی رووشانی کەسێتی و ریسواکردن و

نەمانی هەیبەتیان و، نانەوەی ئاژاروەو دووبەرەکی لەنێو ریزەکانی کۆمەڵگەدا.

ئەمانەی لای خواردەوەش چەند پەندو ئامۆژگاریەکی پێغەمبەری پێشەوان صلی الله علیه وسلم و دەربارەی قەدەغەکردنی جنێودان و وتەی ناشیرین:

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(سِبَابِ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ)**[1]. واتە: جنێودان بەموسڵمان دەرچوونە لە فەرمان و شەرعی خوا، کوشتنیشی کوفرو بێباوەڕییە.

* **(إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ أَنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ قَالَ يَسُبُّ الرَّجُلُ أَبَا الرَّجُلِ فَيَسُبُّ أَبَاهُ وَيَسُبُّ أُمَّهُ)**[2]. واتە: تاوانێکی گەلێك گەورەیە پیاو نەفرەت بکات لە دایك و باوکی خۆی، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! صلی الله علیه وسلم: جۆن پیاو نەفرەت دەکات لە باوك و دایکی خۆی, ئایا شتی وا هەیە؟ فەرموی: ئەو جنیۆدەدات بەباوکی پیاوێك، ئەویش جنێودەدات بەباوکی ئەو، هەروەها ئەو جنیۆدەدات بەدایکی ئەو, ئەویش جنیۆدەدات بەدایکی ئەو, ئەو دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵك جنیۆ بەدایك و باوکی بدەن, کەواتە وەك ئەوە وایە خۆی جنیۆی پێدابن.

* **(إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لَهَا بَالًا يَهْوِي بِهَا فِي جَهَنَّمَ)**[3]. واتە: بەندەیەك وتەیەك لەدەمی دێتە دەرەوەو قسەیەك دەکات، خۆی ئەوەندە گوێی ناداتێ و بەلایەوە ئاسابیە، کەچی دەبێتە هۆی تورەیی و نارەزایی خوای گەورەو، بەهۆی ئەو وتەیەوە کە ئەوەندە نارەوایە تلی دەکاتەوە لەناو دۆرەخدا.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە موعازی فەرموو: **(وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ عَلَى وُجُوهِهِمْ فِي النَّارِ إِلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ)**[4]. واتە: ئەی ئایا خەڵك لەسەر رووخسارو دەم و چاویان دەکێشنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، تەنها لەبەر درویێنەی دراسی زمانیانەوە

---

[1] - متفق علیه: أخرجه البخاري ١٩/١ (٤٨) ، ومسلم ٥٧/١ (٦٤) (١١٦) ., وأحمد: ٣٨٥/١.

[2] - أخرجه البخاري ٣/٨ ( ٥٩٧٣ ) ، ومسلم ٦٤/١ ( ٩٠ ) ( ١٤٦ ).

[3] - أخرجه البخاري في الرقاق: ١٢٥/٨ (٦٤٧٨, وأحمد: ٣٣٤/٢.

[4] - صحيح جامع الترمذي: ١١/٥ برقم: ٢٦١٦, وأحمد: ٢١٠٠٨.

نیه؟ كه وتەی ناشیرین و جنێوو نەفرەتی خەڵكیان پێكردووه.

* (لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ وَلَا اللَّعَّانِ وَلَا الْفَاحِشِ وَلَا الْبَذِيءِ)[1]. واته: بۆ موسوڵمان ناشێت توانج وتانه و تەشەر بدات لەخەڵك و نەفرین كەربێ, هەرزەگۆ بێ و جنێوفرۆش و زمان پیس بێ.

جەنده جوانه منداڵ وتەی جوان و شیرین بێ و لەسەر خۆ بدوێ، زمانی پاك بێ و قسەی چاك نەبێ لەرزای نەیەتەدەرەوە، چەند بەجێیه ئەدەبی دادرابێت لەسەر گفتوگۆی شیرین لەگەڵ خەڵكدا، وتەی ناشیرین و نەفرەتكردن و جنێوی لێ نەبیسرێ و ئازاری كەس نەدات!!.. ئەو منداڵەی ئاوەها بوو بێگومان رێیحانەیەكە لەناو ماڵدا، بەرێزو بەشەهامەت دەبێت لەناو خەڵكدا.

ئەی باوكان و دایكان ئەوەش ئێوەو نمونەیەك لە زمان پاراوی منداڵانی پیاو چاكە پێشینەكان روونی دەكاتەوە چەندە زمان شیرین و قسەزان بوون, وە چۆن منداڵان لە رابردوودا گفت و گۆیان كردووە:

لەسەردەمی (هیشامی كوڕی عبدالملك)دا گرانی و وشكەساڵی روویكردە بیابانەكان و قات و قڕی بوو، نوێنەری هۆزەكان سكاڵایان دەهێنا بۆ لای خەلیفە هیشام, كاتێ نوێنەریان هاتە خزمەتی و دیاریان پێشكەش كرد منداڵێكی چواردە ساڵانەیان لەگەڵدا بوو بەناوی (درواس كوڕی حبیب)، خەلیفە هیشام سەیریكرد درواس ئەوەندە منداڵە، بەدەرگەوانەكەی دیوانی خەلافەتی وت: ئەم دیوەخانەی من قەدرو رێزی نەماوە كێ بیەوێ دێتە ژوورەوە تەنانەت ئەگەر منداڵیش بێ؟!. درواس زانی مەبەستی ئەوە هەڵی دایەو گوتی: ئەی پێشەوای ئیمانداران! هاتنە ژوورەوەی من هیچ لە دەسەڵاتی تۆی كەم نەكردۆتەوە، بەڵام من پێی رێزداربووم، ئەی پێشەوای ئیمانداران! سێ ساڵە تووشی گرانی و قاتوقڕی و وشكەساڵی هاتووین: ساڵێك پیوو چەوری توایەوەو نەما، ساڵی دووەم لاواز بووین و گۆشت بە ئێسقانەكانمانەوە نەما، ساڵی سێیەمێش وا خەریكە ئێسقانەكانمان نامێنێ، كەچی ماڵ و سامانی زۆرو بێ

---

[1] - صحيح ظلال الجنة: ١٠١٤/٢, والترمذي: ١٩٧/٢٤٦ برقم: ١٩٠٠, والبيهقي في السنن:١٩٣/١٠.

شومار لەژێر دەستی ئێوەدایە، ئەگەر ئەو ماڵە هی خودایە دابەشی بکە بەسەر بەندە هەژارەکانی خوادا، ئەگەر هی بەندەکانیشە ئیتر بۆچی لێت شاردونەتەوە؟ خۆ ئەگەر ئەو ماڵ و سامانە هی خۆشتە بیکە بەخێرو بەشی هەژارانی لێ بدە, جونکە خوای گەورە پاداشتی خێرۆمەندو چاکەکاران ون ناکات بەچەند قات پاداشتیان دەداتەوە, ئەی پێشەوای ئیمانداران! بزانە پێشەواو سەرکردە بۆ ژێردەستەکانی وەك رۆح وایە بۆ جەستە، جەستەش بەبێ رۆح ناژی, ئەوەندە وتەکانی شیرین و جوان بوو پێشەوا گوێی بۆ راگرت و فەرمانیدا سەد هەزار درهەم بدەن بەبیابان نشینەکان و، سەد هەزاریش بدەن بە درواس, درواس گوتی: ئەی پێشەوای ئیمانداران! ئەوەی منیش بگێڕەرەوە بیدە بەبیایان نشینەکان، چونکە من پێم خۆش نیە ئەوەندە نەبەخشی بەئەهلی ناوچەکەم بەشیان نەکات، هیشام پێی وت: درواس ئەی تۆ چ پیۆیستیەکت هەیە بۆ خۆت تابۆتی جێبەجێ بکەم؟ وتی: من هیچ پێویستیەکم نیە جگە لە پێویستی گشتی موسوڵمان!!.

### ٤- دیاروەی بەدرەوشتی و بەرەڵایی:

ناشیرینترین دیاردە کە لەم سەدەیەدا بڵاوبۆتەوە لەناو کوڕان و کچانی موسڵمانانداو, کە بەسەردەمی چەرخی بیستەم و پێشکەوتن و سیستەمی نوێی جیهانی ناسراوە، دیاردەی بەدرەوشتی و بەرەڵاییە کە گەنج و لاوەکان کوێرانە لاسایی بێگانە دەکەنەوەو بست بەبست شوێنی گاور و جوەکان دەکەون و شانازیشی پێوە دەکەن، بەبێ ویژدانانە شوێن ئەو ڕەوتە بەدرەوشتیە دەکەون لەناو کۆمەڵگەی موسوڵماناندا بڵاوبۆتەوە بەبێ هیچ بەربەستێکی ئایینی.. وەك ئەوەی کە ژیان تەنها بریتی بێ لە شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووە نزمەکان و, خۆشی و رابواردنە حەرامە لەناو چووەکان.. خۆ ئەگەر ئەوەیان لەدەست دەرچوو ئەوە دنیایان لەدەست دەرچووەو ماڵ ئاوایی لە دنیا دەکەن!!.

هەندێ لە مێشك پووچەکان وا گومان دەبەن هەستان بەسەماکردن بەڕووتی و, تێکەڵاوی ناشەرعی نیشانەی مۆدێرنی و پێشکەوتنە، پێوانەی نوێگەراییان بەو شوێنکەوتنە کوێرانەیە دەکەن, بەڵام با چاك بزانن ئەوانە دەروونیان رووخاوە،

کەسایەتیان لە دەستداوە پێش ئەوەی لەمەیدانی بەرگریکردن و تێکۆشاندا چۆك دادەن و بڕوخێن..

هەیانە هیچ کێشەیەکی نیە لە ژیاندا تەنها گرنگیدان بەروخسار نەبێت، یان ئەو لەنجەو لارو خۆ بادان و مەکرو نازە نەبێ کە دەیکات بەسەر شۆستەو شەقامەکاندا، یا ئەو دەنگ خاوکردنەوەو جموجوڵانە نەبێ کە دەیکات لە کاتی گفتوگۆکردندا، یاخود گەڕان بەدوای ئافرەتێکی بەرەڵای وەك خۆیدا بۆ ئەوەی بیکاتە هاوڕێی خۆی و کاری بەرەڵایی لەگەڵدا ئەنجامدات پیاوەتی و کەسایەتی خۆی بکاتە قوربانی.. ئیتر ئاوەها بەو شێوەیە لە خراپەیەکەوە دەڕوات بەرەو خراپەیەکی تر.. تا سەرەنجام دەکەوێتە ناو ئاگری ئەو بەرەڵایی و بەدرەوشتیەوەو بەهیلاك دەچێ..

**كـل مـن أهمل ذاتيتـه**

**فهو أولى الناس طُرًّا بالفناء**

**لن يرى في الدهر شخصيته**

**كل من قلد عيش الغربـاء.**

واتە: هەر کەسێ پیاوەتی و شەهامەتی خۆی پشتگوێ بخات, ئەوە یەکەم کەسێکە سەراپا بەرەو تیاچوون دەڕوات، هەرگیز لە ژیانیدا کەسایەتی خۆی نابینێتەوە, ئەو کەسەی کوێرانە لاسایی بێگانە بکاتەوە.

بێگومان پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم بەرنامەی زانستی بۆ باوکان و دایکان و دۆستان و پەروەردەکاران روونکردۆتەوە, دروشمی راست و دروستی بۆ دیاریکردوون کە چۆن منداڵەکانیان لەسەر رەوەشتی جوان و، کەسایەتی هەڵبژاردەی ئیسلامی پەروەردەبکەن..

ئەمانەش چەند بەندێکن لەبەندەکانی ئەو دەستورو بەرنامەیە:

**١ - وریای کردوونەتەوە هۆشداری داوە بە لاسایکردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانە:**

* پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: **(خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ حفُوا الشَّوَارِبَ وَأعفُوا اللِّحَى)**[1]. **وفي رواية مسلم (جُزُّوا الشَّوَارِبَ وَأَرْخُوا اللِّحَى خَالِفُوا**

[1] - صحيح البخاري ومسلم, غاية المرام: ١٠٨.

**الْمَجُوسَ)**[1]. واتە: خۆتان جیاکەنەوە لە هاوەڵ بۆ خوا دانەران و وەك ئەوان مەكەن: ریشتان بەردەنەوەو، سمێڵتان کورت کەنەوە. لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: سمێڵتان کورت کەنەوەو, ریشتان بەردەنەوەو، خۆتان جیاکەنەوە لە ئاگر پەرستان.

* **(لَيْسَ مِنَّا مَنْ تَشَبَّهَ بِغَيْرِنَا لَا تَشَبَّهُوا بِالْيَهُودِ وَلَا بِالنَّصَارَى)**[2]. واتە: لەسەر بەرنامەو رێبازی ئێمە نیە ئەو کەسەی لاسایی جگە لە خۆمان بکاتەوە، لاسایی گاورو جوەکان مەکەنەوە.

* **(مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ)**[3]. واتە: هەرکەسێ خۆی بەکۆمەڵ و نەتەوەیەك بچوێنێت و لاساییان بکاتەوە ئەوە لەوانە.

* **(لا يكُنُ أحدُكُم إِمَّعَةً يقُولُ: أنا مَع الناس, إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَحْسَنْتَ, وَإِنْ أَسَاءُوا أَسَأْتَ, ولَكِنْ وَطِّنُوا أَنْفُسَكُمْ إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَنْ تُحْسِنُوا وَإِنْ أَسَاءُوا أَنْ تَجتنبوا اساءتهم)**[4]. واتە: با هیچ کەسێك نەڵێ من لەگەڵ خەڵکدام، ئەگەر خەڵك چاك بوون ئەوا منیش چاك دەبم، خۆ ئەگەر خراپیش بوون منیش خراب دەبم، بەڵکو وابن ئەگەر خەڵك چاك بوون ئەوا ئێوەش چاك بن، ئەگەر خراپیش بوون بەدووربن لە خراپەکانیان.

ئەی خوێندەوارەکان! دەبێ جیاوازی بکرێت لە نێوان ئەو شتانەی کە لە بێگانەوە وەری دەگرین, یان ئەوانەی وەری ناگرین:

یەکەم- ئەوەی دروستە لێیان وەرگرین: پێوسیتە زانیاری بەسوودیان لێ وەربگرین لە بوارەکانی پزیشکی, ئەندازیاری، فیزیا, کیمیا، کەرەسەی جەنگی، نهێنیی چەکە ئەتۆمیەکان, حەقیقەتەکانی ماددەو باقی ئەو شتانەی دەبنە هۆی پێشکەوتنی کۆمەڵ لە رووی شارستانیەوە، ئەوانەش ئەم ئایەت و فەرمووودانە دەیانگرێتەوە:

* ئەنەس رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ)**[5]. واتە: داواکردن و فێربوونی

---

1- صحيح رواه مسلم: ٣٨٢-٣٨٣, تحقيق الألباني : (صحيح) انظر حديث رقم: ٣٠٩٢ في صحيح الجامع.

2- قال الشيخ الألباني : حسن في جامع الترمذي: ٥٦/٥ برقم: ٢٦٩٥ .

3- رواه أبوداود: ٤٠٣١, وأحمد في مسنده: ٥٠/٢, صحيح غاية المرام: ١٠٩.

4- رواه الترمذي: ٧/ ٣٩٠ برقم: ١٩٣٠.

5- رواه إبن ماجة: ٢٦٠/١ برقم: ٢٢٠.

زانست و زانیاری بەسوود واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك.

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ فَحَيْثُ وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا**) [1]. واتە: حیکمەت ونبووی هەموو ئیمانداریکە، لەهەر کوێیەك دۆزیەوە ئەو شایستەترە بۆی هەڵیگرێتەوە.

بەگشتی ئەم ئایەتەش کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ**﴾. **الأنفال٦٠.** واتە: هەرچی لە تواناتاندا هەیە لە کەرەسەی جەنگی بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام ئامادەی بکەن.

دووەم- ئەوەی حەرامە لێیان وەربگرین: پێوستیە ئەو شتانەیان لێ وەرنەگرین کە حەرامن وەك لاسایکردنەوەیان لە جل و بەرگی کورت و تەنگ و تەسك لەبەرکردن, شۆینکەوتنی کوێرانەی دابونەریت و ئاکارە نەفامیەکان، هەموو ئەو دیاردە ناشایستەو نەشیاوانەی کە ناگونجێن لەگەڵ دابونەریتی نەتەوەی ئیسلامدا.. چونکە دەبنە هۆی توانەوەی کەسایەتی و ونکردنی خودو، روخانی رۆح و ئیرادەو، لەناوبردنی رەوشتی بەرزو چاك لەناو کۆمەڵگەدا.

**٢- قەدەغە کردنی رۆچوون لەناو نازو نیعمەتدا:**

* عومەری کوڕی خەتاب نامەی دەنوسی و دەینارد بۆ موسڵمانانی دانیشتووی ناو وڵاتی فارس و دەیفەرموو: (**إيّاكم والتنعم وزيّ أهل الشرك**) [2]. واتە: خۆتان بپارێزن لە رۆچوون لە خۆشی و نیعمەتەکانی دنیا, هەروەها لە جل و بەرگی هاوەڵ بۆ خوا دانەران بەدوور بن و لەبەری مەکەن.

* لە ریوایەتی ئیمام ئەحمەددا: (**ذروا التنعم وزيّ أهل العجم**). واتە: بەدووربن لە نازو نیمعەتەکانی ژیانی دنیاو، جل و بەرگ و پۆشاکی ئەهلی عەجەم واتە: فارسەکان.

---

1- رواه الترمذي: ٣٠١/٩ برقم: ٢٦١١, والعسكري والقضاعي.

2- رواه البخاري ومسلم.

* ئیمام ئەحمەدو ئەبو نەعیم لە موعازەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووە: **(إِيَّاكَ وَالتَّنَعُّمَ فَإِنَّ عِبَادَ اللَّهِ لَيْسُوا بِالْمُتَنَعِّمِينَ)** [1]. واتە: خۆتان بپارێزن لە ڕۆچوون لە خۆشی و نیعمەتەکانی دنیا, چونکە بەندەکانی خوای پەروەردگار لە کەسانە نین کە ڕۆچوون لە خۆشی و نیعمەتەکاندا.

مەبەست لە نازو نیعمت ڕۆچوون و زێدەڕەوییە لە خۆشی و ڕابوادنەکانی دنیاو ئەوانەی دەبنە هۆی خۆشگوزەرانی, بێگومان شاراوە نیە لای کەس ئەو دیاردەیە دەبێتە هۆی حەوانەوەی بەردەوام و دواکەوتن لە بەجێهانی ئەرکەکانی سەرشان لە بەرامبەر بانگەوازو تێکۆشان لە ڕێی خواو، خزانە ناو ڕابواردن و بەرەڵایی و لادان، سەرەنجامیش دەبێتە هۆی بڵاوبونەوەی جۆرەها نەخۆشی ترسناك و پەککەوتەیی..

٣- قەدەغەکردنی گوێ گرتن لە گۆرانی و مۆسیقای بەرەڵایی:

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ بَعَثَنِي رَحْمَةً وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ وَأَمَرَنِي أَنْ أَمْحَقَ الْمَزَامِيرَ, وَالخمور, وَالْكَبَارَاتِ يَعْنِي الْبَرَابِطَ وَالْمَعَازِفَ وَالْأَوْثَانَ الَّتِي كَانَتْ تُعْبَدُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ)** [2]. واتە: خوای گەورە منی ڕەوانە کردووە بەڕەحمەت و بەزەیی و بەڕێ نیشاندەر بۆ هەموو جیهانیان, فەرمانیشی پێکردووم کە ئەم شتانە لەناوبەرم و نەیانهێڵم لەناو موسڵمانانداد: زورناو سازو هەموو جۆرەکانی مۆسیقا, مەیی و ئەو شتانەی مرۆڤ سەرخۆش دەکەن, هەروەها ئەو بتانەی کە لەسەردەمی نەفامیدا دەیانپەرستن و بەندایەتیان بۆ دەکردن.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الْحِرَ وَالْحَرِيرَ وَالْخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ)** [3]. واتە: لە ئومەتەکەمدا کەسانێك پەیدا دەبن کە زیناکردن و، پۆشینی جل و بەرگی ئاوریشم و، خواردنەوەی مەیی و عەرەق و، مۆسیقاو ئالەتەکانی تری گۆرانی وتن حەڵاڵ دەکەن و بەحەرامی نازانن، لەکاتێکدا

[1] - رواه أحمد في مسنده: ٨٢/٤٥ برقم: ٢١٠٨٩.

[2] - رواه أحمد في مسنده: ١٨٥/٤٥ برقم: ٢١١٩٠.

[3] - رواه البخاري: ٥١/١٠ في الفتح الباري, وأحمد و إبن ماجة, سلسلة الصحيحة: ١٨٦/١ برقم: ٩١.

خۆیان حەرامن و واجبە لەسەریان لێی دوور کەونەوە.

* ئیبن عەساکر لە مێژوەکەیدا ریوایەتی کردووە کە ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمویەتی: ئەوەی دانیشێ و گوێ لە ئافرەتێکی گۆرانی بێژ بگرێ، خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا قورقوشمی تواوە رۆدەکاتە گوێکانیەوە.

* ئەبو موسا گێڕاویەتیەوەو گوتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(من استمع إلى صوت غناء لم يؤذن له أن يسمع الروحانيين في الجنة)**[1]. واتە: هەر کەسێ گوێ لە گۆرانی بگرێ, لە قیامەتدا رێی پێ نادرێ گوێ لە رۆحانیەکانی بەهەشت بگرێ.

شتێکی شاراوە نیە لای هەموو خاوەن عەقڵ بەرچاو رونێك کە گوێگرتن بۆ گۆرانی و مرسیقای حەرام چەندە کاریگەری هەیە بۆسەر رەوشتی منداڵ و, پەل کێشی دەکەن بۆ لەرێ لادان و کەوتنە ناو تاوان، هەروەها دەیانخەنە ناو گێژاوی حەزو ئارەزووە قەدەغەکراو حەرامەکانەوە!!.. [2].

بەو بۆنەیەوە حوکمی ئیسلامتان دەربارەی کڕین و بەکارهێنانی دەزگای تەلەفزێون و هۆکارەکانی راگەیاندنتان بۆ باس دەکەین تاکو باوکان و دایکان بەرچاو روون بن و بزانن کە حەرامە یان نا:

ئەوەی هیچ گومانی تێدا نیە ئەوەیە داهێنانی هۆکارەکانی راگەیاندن لە تەلەفزێون, رادوێو، سەتەلایت و ئالەتەکانی تەسجیل کردن.. باشترین شتێکن کە ئەقڵی ئادەمیزاد پەی پێ بردوون لەم سەردەمە نوێیەدا، شمشێرێکی دوو دەمە

---

[1] - ضعيف رواه الترمذي, ضعيف الجامع برقم ٢١٩٠.

[2] - پێویستە لەسەر پەروەردەکاران منالەکانیان بە دووربگرن گۆرانی و مۆسیقا چونکە خوای گەورە بەوتەی بێ خێرو پڕو پووچی داناون وەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُواً أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾. لقمان٦. واتە: هەندێ کەس قسەی بێهوودە دەکرێ, بۆ ئەوەی بەنەزانی خەڵك لە رێگای خوا گومرا بکات, رێگای خوا دەکاتە جێگای گاڵتەو لاقرتێ, ئەوانە سزای ریسواکەریان بۆ هەیە. زۆربەی موفەسیرینی قورئان پێیان وایە مەبەستی لە گۆرانیە. ئیبن مەسعود و حەسەنی بەصری رەزای خوایان لێ بێ فەرمویانە: ئەم ئایەتە دەربارەی گۆرانی و مۆسیقا دابەزیووە. وەرگێڕ.

بەکاردێت بۆ چاکەو، بەکاریش دێت بۆ خراپەو تاوان، لای کەس شاراوە نیە ئەگەر بەکارهاتن بۆ بڵاوکردنەوەی زانست و، چەسپاندنی عەقیدەی ئیسلامی و پیرویاوەڕی یەکتاپەرستی و، خورەوشتی بەرزو چاك و، بەستنەوەی نەوەی نویٚ بەمێژووی باو باپیرانیانەوەو، گەل و نەتەوەی ئاراستەکرد بۆ چاکسازی لە ئیش و کارەکانی ژیانی دنیاو قیامەتیاندا.. ئەوە هیچ کەسێك ناتوانیٚ کڕین و بەکارهێنانی قەدەغەی بکا, سوود لیٚ وەرگرتنیشی شتێکی چاکەو حەڵاڵە..

بەڵام ئەگەر بۆ وروژاندنی ئارەزووەکانی گەنجان و بڵاوکردنەوەی خراپەکاری بەکاریان هێنان و نەوەی نوێیان بەرەو هەڵدێرو گومڕایی بردو لە ئیسلام دووریان خستنەوە.. ئەوە بێگومان هەموو کەسێکی ئاقڵ و خاوەن ویژدان بەحەرامی دەزانێت کڕین و بەکارهێنان و گویٚ لیٚ گرتنیان..

ئێمە ئەگەر ئەمڕۆ سەیری تەلەفزیۆن و سەتەلایتەکان بکەین دەبینن هەر هەموویان بانگەواز بۆ بەرەڵایی و بیٚ ئابڕوویی و خۆشەویستی و تێکەڵاوی ناشەرعی دەکەن، خەڵك ئاڕاستەدەکەن بۆ زیناکردن و خۆ رووت کردنەوەو, تێکدانی خورەوشتی کۆمەڵگە.. تەنها چەند بەرنامەیەکی کەم نەبیت زانست بڵاودەکەنەوەو خەڵك بۆلای چاکە بانگ دەکەن.. ئەگەر ئاوەهابن ئەوە لە روانگەی ئیسلامەوە کڕین و بەکارهێنان و تەماشاکردنیان گەورەترین حەرام و, خراپترین تاوانە.

ئەوەش ئێوەو بەڵگەش لەسەر ئەوە:

أ- زانایان و پێشەوا تێکۆشەرەکانی هەموو سەردەمەکان یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە نیازو مەبەستی شەریعەتی پاکی ئیسلام پێنج شتە: پاراستنی ئایین، پاراستنی ئەقل, پاراستنی نەوەو وەچە، پاراستنی نەفس، پاراستنی ماڵ و سامان، وە فەرمویانە: هەموو ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەرچی لە شەرعی ئیسلامدا هاتووە بۆ پاراستنی ئەم پێنج شتەیە..

لەبەر ئەوەی زۆربەی تەلەفزیۆن و کەناڵەکانی راگەیاندن لە ئەمڕۆدا خەریکی گۆرانی لێداری وخۆشەویستی بیٚ ماناو، فلیمی خراپ و زنجیرەی یەك لەدوای یەك بڵاوکردنەوەن کەباس لە فروفێڵ و، هەتکی شەرف و ناموس و رووخانی دەکەن,

هاندەرن بۆ پەیوەندی ناشەرعی و زیناکردن.. بە دڵنیاییەوە شەرع حەرامی کردووە سەیرکردن و گوێگرتن لەو جۆرە بەرنامانە، لەبەر پاراستنی وەچەو شەرەف و ناموس، هەروەها کڕین و هێنانەوەشی حەرامە ئەگەر بۆ ئەو مەبەستە بێت.

ب- ئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ)**[1]. واتە: با کەس زیان لە خۆی نەدات و زیانیش بە کەسی تر نەگەیەنێت.

موسوڵمان دەبێت زیانی ماددی و مەعنەوی لەخۆی نەدات و خۆشی بەدووربگرێ لەو شتانەی کە زیانی لێ دەدەن, هەروەها نابێ زیان بەخەڵك بگەیەنێ.

بە ئیعتیباری ئەوەی سەتەلایت و تەلەفزیۆنەکانی ئەمڕۆ برەودەدەن بەبەرەڵایی و بەدڕەوشتی, کۆمەڵگە دەبەن بەرەو خراپەکاری و نقومبوون لە گێژاوی حەزو ئارەزووە ناشەرعیەکان, هەر وەك دەیبینن بەچاوی خۆتان، جا ئەگەر ئاواها بەو شێوەیە بوون ئەوە حەرامە بۆ موسڵمان بیانهێنێتە ناو ماڵی خۆی و سەیریان بکەن و گوێیان لێبگرن, چونگە دەبێتە هۆی لەدەستدانی بیروباوەڕو, ڕەوشت وتەندروستی خێزان, کە ئەوەش مایەی زیانە بۆیان.

ج- زۆربەی بەرنامەکانی سەتەلایت و تەلەفزیۆنەکان ژەنینی ئالەتەکانی مۆسیقایان لەگەڵدایە لەگەڵ گۆرانی دڵداری و خۆشەویستی بێ ماناو، سەماکردنی ئافرەتانی بەرەڵا بەڕووتی لەگەڵ پیاوندا، کە ئەوەش زەنگێکی ترسناکە بۆ رووخانی ڕەوشتە بەرزو ئاکارە جوانەکان، کەواتە حەرامە سەیرکردن و گوێگرتن لێیان و هێنانەوەیان بۆ ماڵەوە بۆ ئەو مەبەستە[2].

---

1 - رواه مالك: ١٢٣٤, وقال الشيخ الألباني صحيح, إبن ماجة:٢٣٤٠, سلسلة الصحيحة: ٢٥٠.

2 - لەجیاتی ئەوەدا موسڵمانان دەتوانن سەیری بەرنامە چاکەکانیان بکەن و گوێیان لێبگرن بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا چەندەها کەناڵی چاك و پاك کراونەتەوە بۆ برەودان بەڕەوشت و پەردەردەی خێزان. گوێگرتن و سەیرکردنی ئەو کەناڵانەی باس لە ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هاوەڵە بەرێزەکانی و پیاوچاکانی پاش ئەوان. گوێگرتن و سەیرکردنی وتارە ئایینیەکان لە کەناڵەکانی راگەیاندن و سیمینارو هۆڵەکان, گوێگرتن بۆ ئەو سرودانەی باس لە یەکتاپەرستی و خۆشەویستی خواو پێغەمبەر

**٤- قەدەغەکردنی خۆ چواندن و لاسایی کردنەوەی ئافرەتان:**

* سەعیدی کوڕی موسەییەب ڕەزای خوای لێ بێ فەرموی: مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕەزای خوای لێ بێ سەردانی مەدینەی کردو وتاری بۆداین و، قژێکی دروستکراوی دەرهێناو فەرموی: **(مَا كُنْتُ أُرَى أَنَّ أَحَدًا يَفْعَلُهُ إِلَّا الْيَهُودَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَلَغَهُ فَسَمَّاهُ الزُّورَ)** [١]. واتە: نەمبیستووە بێجگە لە جولەکەکان هیچ کەسێك ئەم کارەی کردبێ, پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەمەی ڕاگەیاندووەو بەدرۆ ناوی بردووە.

* لە ریوایەتی پێشەوا (مسلم)دا هاتووە، ڕۆژێکیان معاویە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموی: **(إِنَّكُمْ قَدْ أَحْدَثْتُمْ زِيَّ سَوْءٍ وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ الزُّورِ)** [٢]. واتە: ئێوە شکلێ و شێوەی خۆتان گۆڕیوەو جل و بەرگی خراپ لەبەردەکەن، بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم درۆکردنی قەدەغە کردووە.

* ئیبن عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ فەرموی: **(لَعَنَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُخَنَّثِينَ مِنْ الرِّجَالِ وَالْمُتَرَجِّلَاتِ مِنْ النِّسَاءِ)** [٣]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەفرەتی کردووە لەو پیاوانەی ژنانین و لاسایی ژنان دەکەنەوە، هەروەها لە ژنی کوڕانی.

* ئیبن عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(لَعَنَ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنْ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ وَلَعَنَ الْمُتَشَبِّهَاتِ مِنْ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ)** [٤]. واتە: پێغەمبەری خوا نەفرینی کردووە لەو پیاوانەی کە ژنانین و خۆیان دەچوێنن بەئافرەتان جا لە قسەکردندا بێت یان لە جل و بەرگ و هەڵسوکەوتدا

---

دەکەن.. وەرگێڕ.

[1] - رواه البخاري ومسلم:٣٩٦٩ .

[2] - رواه مسلم: ٣٩٧٠ .

[3] - رواه البخاري: ٥٤٣٦, وقال الشيخ الألباني : صحيح انظر حديث رقم: ٥١٠٣ في صحيح الجامع, جامع الترمذي:١٠٦/٥برقم ٢٧٨٥.

[4] - أخرجه البخاري: ٥٨٨٥, وإبن ماجة: ١٧٩٤.

بێت یاخود لە هەر شتێکی تردا بێ, هەروەها بەپێچەوانەشەوە نەفرینی کردووە لەو ئافرەتانەی کە خۆیان دەچوێنن بەپیاوان.

* عەلی کوڕی ئەبو تالب ڕەزای خوای لێ بێ فەرموی: بەچاوی خۆم بینیم پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم ئاوریشمی خستە لای ڕاستی و ئاڵتونیشی خستە لای چەپیەوەو پاشان فەرموی: **(إِنَّ هَذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي)**[1]. واتە: ئەم دوانە حەرامن لەسەر نێرینەی ئوممەتی من.

* ئەبو موسای ئەشعەری ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(حُرِّمَ لِبَاسُ الْحَرِيرِ وَالذَّهَبِ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي وَأُحِلَّ لِإِنَاثِهِمْ)**[2]. واتە: ئاورشم و ئاڵتون حەرامن لەسەر نێرینەی ئوممەتی من, بەڵام بۆ ئافرەتانی ئوممەتم حەڵاڵن.

کەواتە قژی دەستکرد لەسەرنان و لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشم و ئاڵتون بۆ پیاوان و، خۆچواندن و لاسایی کردنەوەی ژنان بۆ پیاوان و، بە پێچەوانەوەو, دەرچوونی ئافرتان بۆ بازارەکان بە لەنجەو لارو بەپۆشتەو رووتی واتە جلیان لەبەردایە بەڵام تەنکە, یا کورتە, یان تەسکە.. ئەمانە هەر هەموویان دیاردەی بەرلاّیی و خۆچواندن و لاسایی کردنەوەن، دەبنە هۆی نەمانی پیاوەتی و کەسایەتی و مەردایەتی, تانەو تەشەرن بۆسەر ڕەوشتە بەرزەکان، بەڵکو گەل و نەتەوەش ڕادەکێش بۆ ناو گێژاوی ئارەزووە ناشەرعیەکان و بەدرەوشتی، گەنج و لاوەکانیش پەلکێش دەکەن بەرەو لای خراپەکاری و تاوان و زیناکردن و تێکەڵاوی ناشەرعی.

٥ – قەدەغەکردنی تێکەڵاوی و رووتی و بەرەڵایی و تەماشاکردنی نامەحرەم:

– خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً ﴾.الأحزاب٥٩.** واتە: ئەی پێغەمبەر! بڵێ: بەهاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی بڕواداران با عاباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا, چونکە ئەوە لەبارترین شتە کە

[1] - قال الشيخ الألباني : صحيح: صحيحح سنن أبي داود ٤/٥٠ برقم: ٤٠٥٧.

[2] - وقال الشيخ الألباني : صحيح , صحيح الجامع الترمذي:٤/٢١٧ برقم: ١٧٢٠.

پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن و تووشی گیروگرفت نەبن، هەمیشەو بەردەوام خودا لێخۆشبوو میهرەبانە.

- هەروەها دەفەرموێت: ﴿**قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ* وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ**﴾. **النور٣٠-٣١**. واتە: ئەی پێغەمبەر! بڵێ بەپیاوانی ئیماندار: باچاوی خۆیان بپارێزن لەسەیرکردنی ئافرەتانی بێگانەو نامەحرەم، هەروەها عەورەتیان بپاریزن لە زیناکردن، بێگومان ئەوە چاکترو پاکترە بۆ ئەوان، بەراستی خوا ئاگادارە بەهەموو کردەوەیەك کە دەیکەن, بڵێ بە ئافرەتانی ئیمانداریش چاویان داخەن لە تەماشاکردنی پیاوانی نامەحرەم و داوێنی خۆشیان بپارێزن لە زنیاکردن جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کەدیارە، باسەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیاندا جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بەتەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت یان باوکیان..

بەڵام ئایا ئافرەتان لە شەرعدا فەرمانیان پێکراوەو واجبە لەسەریان دەم و چاویان داپۆشن؟

* **یەکەم جار گوێ بگرن** لە زانایانی تەفسیر لە هاوەڵان و پیاو چاکانی پێشین بزانین چی دەڵێن لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿ **يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ..**﴾.**الأحزاب٥٩**.

- ئیمام(**إبن جرير الطبري**) لە ئیبن عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: خوای گەورە فەرمانیکردووە بە ئافرەتانی باوەڕدار کاتێك لە ماڵ دەرچوون بۆ کارێکی پێویست با دەست و دەم و چاویان داپۆشن, تەنها چاوێکیان نەبێ بۆ ئەوەی بەرپێی خۆیانی پێ ببینن لە کاتی رۆشتندا.

- ئیمام ئیبن جەریر لە ئیبن سیرینەوە دەگێڕێتەوە کە پرسیاری لە (**عبيدة** کوڕی **الحارث الحضرمی**) کردووە دەربارەی ئەم ئایەتە ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی داوەتەوە: ﴿ **يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ..**﴾. واتە: با بەعەباکەیان سەرو دەم و چاویان داپۆشن,

بەڵام عاباكە لادات لەسەر چاوێكی بۆ ئەوەی لە كاتی ڕۆشتندا بەرپێی خۆی ببینێ.

- زانای بەناوبانگ ئیمام(**إبن جرير الطبري**) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿ **يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ..**﴾. با خۆیان نەچوێنن بە كەنیزەك و خزمەتكارەكان لەجل و بەرگدا كاتێ لە ماڵ دەرچوون بۆ كارێكی پێویست بەوەی كە قژو دەم و چاویان دەرخەن, بەڵكو باسەرپۆشەكانیان بدەن بەسەر سینەو ملیاندا جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن, بۆ ئەوەی لەلایەن گوناحكارانەوە توشی ئازارو كێشە نەبن و بزانن ئەوانە ئافرەتی ئازادن و كەنیزەك نین.

- زانای بەناوبانگ(أبو بكر الجصاص) دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئافرەتانی گەنج فەرمانیان پێكراوەو واجبە لەسەریان دەم و چاویان داپۆشن لە بەرامبەر بەپیاوانی نامەحرەمدا, كاتێك لە ماڵ دەرچوون بۆ كارێكی پێویست قژو دەم و چاویان دەرنەخەن بۆ ئەوەی تەماعیان تێنەكەن و دەست درێژیان نەكرێتەسەر لەلایەن گوناحكارانەوە.

- (**قاضی البیضاوي**) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿**يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ..**﴾. با بە چارشێوەكانیان جەستەو دەم و چاویان داپۆشن, لە كاتی پێویستدا.

- زانای بەناوبانگ(النیسابوری) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿**يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ..**﴾.**الأحزاب٥٩.** ئافرەتان لەسەرەتای ئیسلامەوە وەك باوی سەردەمی نەفامی ئافرەتانی ئازادو كەنیزەك لێك جیانەدەكرانەوە, بەڵام لەدوایدا ئافرەتانی ئازاد فەرمانیان پێكرا كە خۆیان بەعاباكانیان داپۆشن.

ئەو وتانەی سەرەوە دەری دەخەن كە هاوەڵان و هەموو زانایان و توێژەرەوانی قورئان یەكدەنگن لەسەر ئەوەی كە ئافرەتانی موسڵمان فەرمانیان پێكراوە پاڵاپۆش بكەن و بە چارشێوەكانیان جەستەو دەم و چاویان داپۆشن لە بەرامبەر پیاوانی نامەحرەمدا بە حوكمی ئەم ئایەتە: ﴿**يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ..**﴾.**الأحزاب٥٩.**

* **دووبارە گوێ بگرن** لەو فەرموودە صەحیح و ڕاست و دروستانەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و, لە ئافرەتانی هاوەڵان بزانن لەبارەی داپۆشینی دەم و

چاوی ئافرەتانەوە چی دەڵێن:

* ئیبن عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ فەرموی: **(أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أمرالْمُحْرِمَةُ في الحج أن لا تَنْتَقِبُ وَلَا تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ)**[1]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە حەج پەچەو دەستکێشی قەدەغەکرد لەو ئافرەتانەی کە خاوەن ئیحرامن.

* لە ریوایەتی ئەبو داودا: **(نهى النساء في إحرامهن عن الْقُفَّازَيْنِ والنقاب)**[2]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پەچەو دەستکێشی قەدەغەکرد لەو ئافرەتانەی کە خاوەن ئیحرامن.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم ئافرەتان دەم و چاوو هەردوو دەستیان داپۆشیوەو دەستکێشیان لەدەستکردووە, مادەم لە ئیحرامدا لێی قەدەغەکردن, ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ بەموتڵەقی لە ئیحرامدا لایان بردبێ بە بەڵگەی ئەم فەرموودانەی ئێستا باسیان دەکەین:

* عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموی: لە کاتێکدا ئێمەی ئافرەتان لەخزمەتی پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم بووین لەحاڵەتی ئیحرامدا, کاتێك سوارەکان بەلاماندا بڕۆشتنایە هەر یەکێکمان چارشێوەکەی لەسەر سەریەوە شۆڕدەکردەوە سەر رووی وە کاتێ تێدەپەڕین لامان دەبردەوە[3].

- ئیمام مالیك لە کتێبی**(الموطأ)**دا دەڵێت: **(فاطمة کچی المنذر)** فەرمویەتی: ئێمەی ئافرەتان لە ئیحرامدا دەم و چاومان دادەپۆشی, ئەسمای کچی ئەبو بەکریشمان لەگەڵدا بوو ڕێگری لێ نەدەکردین.

---

[1] - رواه الترمذي ومالك في الموطأ وأبو داود, وقال الشيخ الألباني: صحيح, سنن أبي داود:١٦٥/٢ برقم: ١٨٢٦.

[2] - رواه أبو داود, وقال الشيخ الألباني : حسن صحيح , سنن أبي داود : ١٦٦/٢ برقم: ١٨٢٧.

[3] - صحيح رواه أبي داود, مشكاة المصابيح: ٢٦٩٠/٢.

- (إبن الحجر) له کتێبی(**فتح الباري**)دا له عائیشەوه دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئافرەتان له سەریانەوه چارشێوەکانیان دادایەوه بەسەر دەم و چاویاندا.

- له فەرمودەی صەحیحدا هاتووه که یەکێك له ئافرەتانی هاوەڵان به باڵاپوشیەوه بۆ کاریك چووه بازاری بەنی قونەیقاع، دەمو چاوی داپۆشیبوو, جولەکەیەکی نەعلەتی ویستی دەم و چاوی دەرخات و گاڵته بەخۆی و باڵاپۆشیەکەی بکا, بەڵام ئافرەتەکه نەیدەهێشت و هاواریکرد، یەکێ له موسوڵمانان پەلاماری چولەکەکەی داو کوشتی لەسەر ئەوەی که ویستی دەم و چاوی ئەو ئافرەته موسوڵمانه دەرخات!!.

ئەم فەرموده راستانه دەری دەخەن که خێزانەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و, ئافرەتانی هاوەڵان.. کاتێك بۆ کارێکی پێویست بچوونایەته دەرەوه لەماڵ دەم و چاویان دادەپۆشی, با له ئیحرامیشدا بوونایه.. باوەڕیان وابوو داپۆشینی دەم و چاو واجبێکی شەرعیه.

* **بابۆ جاری سێیەم گوێ بگرین** له راو بۆچوونی فوقەها تێکۆشەرەکان ئەوانەی جێگەی باوەڕن بزانین ئەوان له بارەی دەرخستنی رووخسارەوه چی دەڵێن:

- زاناو پێشەوا تێکۆشەرو شەرعناسەکان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی که دەم و چاوی ئافرەت عەورەتەو حەرامه دەربخرێت بۆ بێگانه, داپۆشینیشی واجبه, له سەرویانەوه پێشەوایان: **شافیعی** و **مالیك** و **ئەحمەد**.. بەڵگەشیان ئەوەیه که چەسپاوه له هاوەڵان و پێشینه چاکەکانەوه ئایەتی: ﴿**یُدْنِینَ عَلَیْهِنَّ مِن جَلَابِیبِهِنَّ..**﴾.**الأحزاب٥٩.** فەرمان دەکات بەداپۆشینی دەم و چاو له بەرامبەر پیاوانی نامەحرەمدا, هەروەها جێبەجێکردنی لەلایەن ئافرەتانی هاوەڵانەوه کاتێ بۆ ئیش و کاری زەرووری و پێویست چوونەته دەرەوه خۆیان و دەم و چاویان داپۆشیوه, تەفسیری ئەو ئایەتەی سەرەوه لەلایەن هاوەڵان و پێشینه چاکەکانەوه بەڵگەیه بۆ ئەو راستیه, که پێشتر روون کراوەتەوەو باسکراوه.

- **بەڵام فوقەها حەنەفیەکان** پێیان وایه دەم و چاوی ئافرەت عەورەت نیەو دروسته دەرخستنی ئەگەر بەڵاو فیتنەی لێ نەکەوێتەوه, بەڵام ئەگەر بەڵاو فیتنەی لێکەوتەوه

ئەوە دەرخستنی حەرامە, لەبەر ڕێگرتن لە خراپەو, نەهێشتنی تاوان.

**دیارترین بەڵگەیان بۆ سەرخستنی مەزهەب و بیرو راکانیان ئەمانەیە:**

* (**الفضل** کوڕی عباس) لە پاشکۆی پێغەمبەری خوادا بوو صلى الله عليه وسلم بەسواری وڵاخەوە لەحەجی ماڵئاوایدا, ئافرەتانی خاوەن ئیحرام بەلایدا تێدەپەڕین, فەزڵ تەماشای دەکردن, پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم بەدەستی خۆی چەناگەی گرت و رووی وەرچەرخاند بۆ ئەوەی سەیریان نەکات,,بەڵام ئەو رووی وەردەگێڕا بۆ لایەکی ترو سەیری دەکردن..[١].

بەڵگەیان ئەوەیە دەڵێن ئەگەر دەم و چاوی ئافرەت عەورەت بوایە دەریان نەدەخست و فەزڵیش تەماشای نەدەکردن..

* عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرموی: جارێکیان ئەسمای کچی ئەبو بەکر هاتە خزمەت پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم بەرگێکی تەنکی لەبەردابوو, ئەویش رووی لێ وەرگێڕاو فەرمووی: ( **يَا أَسْمَاءُ إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتْ الْمَحِيضَ لَمْ تَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلَّا هَذَا وَهَذَا وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ)** [٢]. واتە: ئەی ئەسما! ئایا نازانی ئافرەت کاتێك گەیشتە تەمەنی باڵغ بوون ئیتر دروست نیە بێجگە لەئەمەو ئەمە دەربخات, ئاماژەری بۆ رووخساری و هەردوو دەستی خۆی کرد.

بەڵام جەماوەری فوقەهاکان وەڵامی ئەم دوو فەرمودەیان داوەتەوە:

**یەکەم:** فەرمودەکەی فەزڵی کوڕی عەبباس بەڵگە نیە لەسەر دروستی دەرخستنی دەم و چاو بۆ نامەحرەم, چونکە ئەو ئافرەتانە لە ئیحرامدا بوون, بەڵام دروستە بۆ ئەو ئافرەتانەی لە ئیحرامدان دەست و دەم و چاویان دەرخەن بەبەڵگەی ئەو فەرمودەیەی کە پێشتر باسکرا: **(لا تَنْتَقِبُ وَلَا تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ)** [٣] ئەم فەرمودەیە ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر ئافرەتان لەحاڵەتی ئیحرامدا نەبوون ئەوە دەبێت دەم و چاویان داپۆشن و, دەستکێشیش لەدەست بکەن.

---

1 - صحيح سنن أبي داود: ١٨٢/٢برقم: ١٩٠٥.

2 - صحيح رواه مسلم وإبن ماجة, صحيح سنن أبي داود:٦٢/٤ برقم:٤١٠٤.

3 - صحيح سنن أبي داود:١٦٥/٢ برقم: ١٨٢٦.

دووەم: **(إبن الكثير)** لەتەفسیرەکەیدا دەڵێت: ئەبو داود و حاتەمی رازی دەفەرمون: فەرمودەکەی ئەسما (مرسل)ە, چونکە خالدی کوڕی دریك خۆی لە عائیشەی نەبیستووە[1].

زۆربەی ئەهلی زانست و زانیاری فەرمودەی (مرسل)ە, بەلاواز دەزانن, فەرمودەی لاوازیش حوکمی لێ هەڵناهێنجرێت و کاری پێناکرێ.

ئەو وتانەی شەرعناسە تێکۆشەرەکان دەریدەخەن کە دەم و چاوی ئافرەت عەورەتە, داپۆشینی واجبە, دەرخستنی حەرامە, تەنانەت فوقەها حەنەفیەکانیش کە پێیان وایە دەم و چاوی ئافرەت عەورەت نیە، مەرجیان بۆ داناوە ئەویش ئەوەیە ئەگەر بەڵاو فیتنەی لێ نەکەوێتەوە ئەو کاتە دروستە دەرخستنی, بەڵام ئەگەر بەڵاو فیتنەی لێکەوتەوە ئەوە دەرخستنی حەرامە.

دەی ئایا کەسێك هەیە نکوڵی بکات لەو هەموو خراپەو تاوانەی کە بڵاوبۆتەوە لەناو ئەم کۆمەڵگەیەدا کە تێیدا دەژین؟!.. مادەم کار گەیشتۆتە ئەو رادەیە دەبێت هەموو باوکێکی مەردو خاوەن شەهامەت فەرمان بکات بەخێزان و کچەکانی کە دەم و چاوی خۆیان دەرنەخەن لەبەر چاوی پیاوانی نامەحرەم, پەیڕەوکاری فەرمانی خوای پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی بن.. ئافرەتە پاك و بەرەوشتەکانی هاوەڵان بکەنە قودوەو پێشەنگ بۆ خۆیان, شوێن وتەی شەرعناسە تێکۆشەرەکان بکەون.. موسڵمان دەبێت شەرەف و ناموسی خۆی بپارێزێ و هەمیشە لایەنی تەقواو دنیا نەویستی بگرێت ئەگەر دەیەوێت لە قیامەتدا لەگەڵ ئەوانەدا بێ کە خوای گەورە نازو نیعمەتی خۆی پێ بەخشیوون ئەوانەش پێغەمبەران و راستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکانن و چاکترین هاوڕێن.

**بەڵام ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردنی خۆرازاندنەوەو دەرخستنی جوانی ئافرەتان:**

* ئەبو هورەیرە رازی خوای لێ بێ گێڕایەوەویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى

---

[1]- تفسیر إبن کثیر: ٢٨٣/٣.

الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلَا يَجِدْنَ رِيحَهَا وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا**) [1].
واتە: دوو کۆمەڵ هەیە لەڕیزی ئەهلی دۆزەخن و من نەمدیون: جۆرێکیان قامچیان پێیە ریشودار وەك کلکی مانگا وایە کە ئەشکەنجەی خەڵکی پێدەدەن، جۆرەکەی ترشیان: ئافرەتانێکن پۆشاکیان لەبەردایە بەڵام رووتن(چونکە تەنك و کورتە یان تەسکە) ئەوانە هەم خۆیان لەخشتەچوون هەم خەڵکیش لەخشتەدەبەن، بەفیزو لەنجەو لارەوە دەڕۆن بەڕێگادا، قژی سەریان لە دواوە وەك کۆپارەی پشتی وشتر بەرزدەکەنەوە، ئەوانە نەدەچنە بەهەشت و نەبۆنیشی دەکەن کە بۆنی بەهەشت ئەوەندەو ئەوەندە ساڵە ڕێ دەڕوات.

خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿**وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى**..﴾. **الأحزاب٣٣**. واتە: لەماڵەکانتان جێگیر بن و بسرەون، وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەفامی زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخەن بۆ بێگانە..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاء اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحاً فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ**﴾. **النور٦٠**. واتە: ئەو ئافرەتە پیرو پەککەوتانەی کە بەتەمای شووکردن نین، قەیناکا ئەگەر هەندێك لەپۆشاکیان دابێنن، لەکاتێکدا جوانی خۆیان دەرنەخەن، خۆ ئەگەر پۆشتە بن ئەوە چاکترە بۆیان، خوایش بیسەرو زانایە.

**ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردنی تێکەڵاوی ناشەرعی پیاوان و ئافرەتان:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ**﴾. **النور٣٠**. واتە: ئەی پێغەمبەری! بڵێ بە پیاوانی ئیماندار باچاوی خۆیان بپارێزن لە سەیرکردنی ئافرەتانی نامەحرەم، عەورەتی خۆیان بپارێزن لە زیناکردن.. بەئافرەتانی ئیماندارش بڵێ: چاویان بپارێزن لە

---

[1] - أخرجه مسلم ١٦٨/٦ (٢١٢٨) (١٢٥) , وأحمد في مسنده: ٣٥٦/٢.

سەیرکردنی پیاوانی نامەحرەم و خۆیان بپارێزن لە زیناکردن، جوانی خۆیان دەرنەخەن بۆ مێردەکانیان نەبێت..

دەی ئیتر چۆن چاوی خۆیان دەپارێزن لە کاتێکدا کە پیاوان و ئافرەتان لە بارەکان و شوێنە تایبەتیەکاندا کۆدەبنەوەو لەیەك شوێنداو تێکەڵاو دەبن, کەواتە ناوەڕۆکی ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە تێکەڵاوی ناشەرعی شتێکی حەرام و قەدەغەکراوە.

- لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿**وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ**..﴾. **الأحزاب٥٣**. واتە: کاتێك داوای کەل و پەلێکتان کرد لە خێزانەکانی پێغەمبەر لەپشتی پەردەوە داوایان لێبکەن، ئائەو جۆرە رەفتارو کرادرە چاکترو باشترە بۆ دڵێ ئیۆەو ئەوانیش.

* پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (**لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلَّا كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ**)[١]. واتە: هەر ئافرەت و پیاوێك بەتەنیا کۆبوونەوە ئەوە شەیتان سێیەمیانە.

* عوقبەی کوڕی عامر رازی خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ قَالَ الْحَمْوُ الْمَوْتُ**)[٢]. واتە: ئاگادارتان دەکەینەوە مەچنە ژووروە بەتەنها بۆ لای ئافرەتان و لەگەڵیان کۆمەبنەوە، پیاوێك لە پشتیوانان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! صلى الله عليه وسلم ئەی ئەگەر خزم و کەس و کاری مێردەکەی بێت؟ فەرموی: ئەوا مردنی باشترە.

* ئیبن عەباس رازی خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ**)[٣]. واتە: کەستان لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم کۆنەبێتەوە بەتەنها، مەگەر ئەو ئافرەتە کەسێکی مەحرەمی

---

[1] - صحيح حامع الترمذي: ٤٧٤/٣ برقم: ١١٧١.

[2] - متفق عَلَيْهِ: أخرجه البخاري ٤٨/٧ (٥٢٣٢) ، ومسلم ٧/٧(٢١٧٢)(٢٠).

[3] - صحيح رواه البخاري:٣٠٠٦, ومسلم: ٤٢٢ -١٣٤١.

خۆی لەگەڵدا بێت، وەك باوكی، یان مێردەكەی، یا براكەی و ئەوانەی لەشەرعدا بەمەحرەم ناویان هاتووە .

**ئەوەی هاتووە دەربارەی حەرامی سەیركردنی ئافرەتانی نامەحرەم:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ..**﴾. **النور٣٠.** واتە: ئەی پێغەمبەری! بڵێ بە ئیمانداران باچاوی خۆیان بپارێزن لە سەیركردنی ئافرەتانی نامەحرەم، عەورەتی خۆیان بپارێزن لە زیناكردن..

هەروها دەفەرموێت: ﴿ **وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً**﴾. **الإسراء٣٦.** واتە: شتێك كە زانیاریت لەبارەیەوە نیە شوێنی مەكەوە چونكە بەراستی بیستن و دیتن و دڵ هەموو ئەوانە لێیان دەپرسرێتەوە.

* جەریری كوڕی عبدللە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموی: لەبارەی سەیركردنی كتوپڕەوە پرسیام لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كرد؟ ئەویش فەرموی: (**اصْرِفْ بَصَرَكَ**) [1]. واتە: فەرمانی پێكردم كە چاوم لابدەم.

* دایكی سەلەمە ڕەزای خوای لێ بێ گێراویەتیەوەو فەرمویەتی: من و مەیمونە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دانیشتبووین پێشوازیمان كرد لە (إبن المكتوم) كە پیاوێكی كوێر بوو, دوای ئەوەی فەرمانمان پێكرابوو بەباڵاپۆشی, پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموی: (**احْتَجِبَا مِنْهُ**). پەردەدادەنەوە و خۆتان داپۆشن، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە كوێرە ئێمە نابینێ و نامان ناسێ؟. فەرموی: (**أَفَعَمْيَاوَانِ أَنتُما أَلَسْتُمَا تُبْصِرَانِهِ ! ؟**) [2]. ئەی ئێوە كوێرن و ئەو نابینن؟!.

---

[1] - أخرجه مسلم ٦/١٨١-١٨٢ (٢١٥٩) (٤٥), المشكاة: ٢/٣١٠٤.

[2] - رواه أبُو داود والترمذي، وقال: ( حديث حسن صحيح), أخرجه أبو داود (٤١١٢)، والترمذي (٢٧٧٨)، وأحمد:١٩٦/٦, والحديث ضعيف لجهالة نبهان مولى أم سلمة ، وقال الإمام أحمد: ( نبهان روى حديثين عجيبين - يعني هذا الحديث وحديث : ( إذا كان لإحداكن مكاتب فلتحتجب منه) المغني لابن قدامة ٥٦٣/٦ .

* ئەبو سەعیدی خودری گێراویەتیەوە کە پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ فِي الطُّرُقَاتِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَنَا بُدٌّ مِنْ مَجَالِسِنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا أَبَيْتُمْ إِلَّا الْمَجْلِسَ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهُ قَالُوا وَمَا حَقُّهُ قَالَ غَضُّ الْبَصَرِ وَكَفُّ الْأَذَى وَرَدُّ السَّلَامِ وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنْ الْمُنْكَرِ**)[1]. واتە: نەکەن لەسەر ڕێگاوبان دابنیشن, وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! چارمان نیە جێگایەك نیە تێیدا کۆببینەوەو دەمەتەقێی تێدا بکەین, فەرموی: ئەگەر هەر ناچاربوون دابنیشن ئەوا مافی ڕێگاکە بدەن, وتیان: مافی ڕێگاوبان چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: چاوی خۆتان بپارێزن لە سەیرکردنی ئافرەتانی نامەحرەم، ئازاری کەس مەدەن، وەڵامی سڵاو بدەنەوە، ڕێگەی باش پیشانی خەڵك بدەن, فەرمان بکەن بەچاکەو، جڵەوگیری لە خراپەش بکەن.

شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە ئەگەر خەڵك بە پیرو لاوەوە, بە پیاوان و ئافرەتانەوە، بە دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵاتەوە، هەموو کۆمەڵ و گەلانی دنیا، لەسەر ئەو ڕێبازە پڕشکۆیە بڕۆن، دووربکەونەوە لە هەرچی بەرەڵایی و شتێکی ناشەرعی هەیە، خویان بپارێزن لەو شتانەی زیان بە ڕەوشتیان دەگەیەنێ، وەك رووتی, خۆرازاندنەوە بۆ نامەحرەم, تێکەڵاوی ناشەرعی و, سەیرکردنی نامەحرەم.. ئەوە بێگومان ئەو کومەڵگەیە دەگاتە ئاستێکی بەرز لە پاکێتی و ڕەوشت بەرزیدا، لە ژێر سایەی ئاشتی و ئارامیدا بەخۆشی دەژین و دەحەوێنەوە, شەرەفمەند دەبن.. چونکە لەسەر بەرنامەو ڕێبازێك رۆشتوون کە خوای گەورە نەخشەی بۆ کێشاوەو بۆی داناون، پەیڕەوی ئەو پرۆگرامەیان کردووە ئیسلام واجبی کردووە لەسەریان، وەکو خوای گەورەو کاربەجێ دەفەرموێت: ﴿**وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ**﴾ **الأنعام١٥٣.** واتە: بێگومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کە ڕاست و دروستە کەواتە شوێنی بکەون، شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون چونکە دوورتان دەخاتەوە لە ڕێگەی خوا، خوا ئەو شتانەی بەئێوە سپاردووە بۆ ئەوەی پارێزکاربن..

---

[1] - متفق عَلَيْهِ: أخرجه البخاري: ٦٣/٨ ( ٦٢٢٩ ) ، ومسلم في اللباس: ١٦٥/٦ ( ٢١٢١ ) ( ١١٤ ) .

ئەوەی نەتەوەی ئیسلام بەدەستی هێناوە لە هەموو چەرخ و سەردەمێکدا بەدرێژایی مێژوو.. بەفەزڵی گەورەیی و شوێنکەوتنی ڕێنماییەکانی قورئانی پیرۆزەوە بووە کە خوای گەورە ناردوویەتی مژدە دەرو ترسێنەر بێ بۆ جیهانیان, هەروەها هیدایەت بەخش و ڕووناکی بێ بۆ نەوە لەدوای نەوە تا قیامەت..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**إِنَّ هَـذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْراً كَبِيراً**﴾. **الإسراء٩**. واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێبازو بەرنامەیەك کە ڕاست ترینە, مژدەش دەدات بەو ئیماندارانەی کە کردەوە چاکەکان دەکەن بەڕاستی پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە.

ئەی باوکان و دایکان ئەوانەی لێیان دواین گرنگترین بنەمای پەروەردەیی و بەرنامەی زانستی بوون کە ئیسلام دایناون بۆ پاراستنی ڕەوشتی منداڵ و، گەشەکردنی کەسایەتی هەڵبژاردە، ڕاهێنانی منداڵە لەسەر پیاوەتی و جوامێری و ڕەوشت و ئاکاری بەرزو جوان.. ئێوەش لەسەرتانە منداڵەکانتانی لەسەر پەروەردەبکەن و، پەیڕەوی ئاراستەو ڕێنماییەکانی بکەن..تادەبنە پیاوی ناو پیاوان و!!..سوودیان بۆ خۆیان و ئێوەش و کۆمەڵگەکەشیان دەبێ..

دەی ئیتر بێجگە لەم پەیڕەو پرۆگرامەی کە ئیسلام دایناوە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ و پێگەیاندنی کەسێتی، ئامادەکردنی بۆ هەڵگرتن و شان دانەبەری بەرپرسێتی، ئایا چ بەرنامەیەکی تر هەیە؟

کێیە ئەو کەسە کە دەڵێ ڕۆچوون لەنازو نیعەمەت و ڕابواردنەکانی دنیادا بەبێ سەروبەرە زیان ناگەیەنێ بەکەسێتی منداڵ؟

کێ دەڵێ شۆینکەوتنی حەزو ئارەزووە ناشەرعیەکان زیان ناگەیەنێ بە کەسێتی منداڵ؟

وە کێیە دەڵێ گوێگرتن بۆ گۆرانی دڵداری و خۆشەوشتی و، و مۆسیقلی سەماکردن و وروژاندنی ئارەزووەکان زیانی نیە بۆ کەسێتی منداڵ ؟

کێ دەڵێ دیاردەی ڕووتی و خۆرازاندنەوەو تێکەڵاوی زیان ناگەیەنێ بەکەسێتی منداڵ؟

وە کێ دەڵێ دیاردەی خۆچواندن و لاسایکردنەوەی ئافرەتان, دەنگ ناسکردنەوەو بە مەکرو ناز قسەکردن زیان ناگەیەنێ بەکەسێتی منداڵ ؟.

پیاوانی بواری پەروەردەو، زانایانی دەروون ناسی و رەوشت یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ئەم دیاردانە ترسناکترین پەتاو نەخۆشین بۆ لاوازکردنی زاکیرەو بیرو هۆش، روخانی کەسێتی، کوشتن و نەمانی پیاوەتی و جوامێری، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی, بەدرەوشتی و، نەهێشتنی رێزی شەرەف و پاکێتی..

- دکتۆر(الکس کارلیل)ی فەرەنسی لەکتێبی **(الانسان ذلك المجهول)**دا دەڵێ: کاتێك غەریزەی جنسی دەوروژێت جۆرە مادەیەك دەرێژێ دەبێتە هۆی تەشەنەکردنی خوێنی دەماغ و بێئاگابوون، ئیتر ناتوانرێت بەشێوەیەکی رێکوپێك بیرو هۆش بخرێتەکار.

- (جورج بالوشی) لە کتێبی**(الثورة الجنسية)**دا نووسیویەتی و دەڵێت: لەساڵی ١٩٦٢جۆرج کەندی سەرۆکی ئەمریکا رایگەیاند داهاتووی ئەمریکا لە مەترسیەکی گەورەدایە, چونکە گەنج و لاوەکانی نقووم بوون لە گێژاوی ئارەزوو بازی جنسیدا, توانای راپەڕاندنی ئەو ئەرکانەیان نەماوە کە لەسەر شانیانە، لە نێوان حەوت کەس لەوانەی کاتی سەربازیانەو دەبرێنە تەجنید شەشیان بەکەڵکی سەبازی نایەن، چونکە ئەو ئارەزوو بازییەی کە تێیدا رۆچوون تواناو لیاقەی تەندروستی و دەروونی نەهێشتوون.

- لەرۆژنامەی**(الأحد)**ی لوبنانی لە ژمارە(٦٥٠)یدا لەسەر زمانی سەرپەرشتیاری پەروەردەی کۆمەڵایەتی**(مرغريت سميث)**ەوە نووسیویەتی: لە سەدا شەستی قوتابییە کچەکان لە قوتابخانەو زانکۆکاندا لە وانەکانیاندا کەوتوون, چونکە بەردەوام بیریان بەلای خۆشەویستی و کاری جنسیەوە بووە، ئەوەندە گوێیان بەوانەکانیان نەداوە..

هیچ نەماوەتەوە تەنها ئەوەندە نەبێ کە بەرپرسیاران لە پەروەردەکاران و دایکان و باوکان منداڵەکانیان بپارێزن و دووریان بخەنەوە لەو تێکەڵاویە بێ سەروبەرەو ناشارستانیە، هەوڵبدەن و هەرچی لە توانایاندایە بیخەنەگەڕ بۆ بەگژاچوونەوەی, لەدڵ و دەروونی منداڵەکانیاندا تۆوی رەوشتی بەرزی و ئاکاری جوان بڕوێنن!!..

**له کۆتایدا لەسەرمانە دەوری کاریگەری لێپرسینەوەو چاودێری ورد بەکەم نەنرخێنین بۆ راستکردنەوەی رەوشتی منداڵ و، چاکسازی دەروونی و، گەشەپێدانی کەسێتی..**

ئەگەر بمانەوێت بگەڕێین بەدوای هۆکارەکانی لادان و روخانی رەوشتی منداڵدا، بۆمان دەردەکەوێت بەهۆی فەرامۆشکردنی چاودێری وردوو پشتگوێ خستنی پەروەردەو ئاراستەکردنیانەوە بووە لەلایەن باوك و دایکیانەوە..

**ئەمانەش چەند هۆکارێکن بۆ لادان و رورخانی منداڵ لە روی ئاکارو رەوشتەوە:**

١- باوك ئەگەر بواری بەمنداڵەکانی بدات بچنەسەر جادەو کۆڵانەکان بەبێ لێپرسینەوەو چاودێری ورد, بە ئارەزووی خۆیان تێکەڵاوی هاوڕێی خراپیان کرد..ئەوا بە بێگومان لەوانەوە جۆرەها رەوشت و خووی خراپ وەردەگرن..

٢- باوك ئەگەر رێگای دا بە منداڵەکانی سەیری ئەو فلیمەمانە بکەن باس لە دڵداری دەکەن، هەروها سەیری ئەو فلیمە پۆلیسیانەیان کرد کە خەڵك فێری تاوان و لادان دەکەن, لە کاتێکدا ئەو فلیمانە زیانیان بۆ گەورەش هەیە چ جای منداڵان.. بێگومان ئەو باوکە بەخۆی بزانێ یان نەزانێ بەدەستی خۆی منداڵەکانی فڕێداوەتە ناو ئاگرێکی بڵێسەدارەوەو بەهیلاکیانا دەبا.

٣- باوك ئەگەر بواریدا بەمنداڵەکانی لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە تەماشای دیمەنە ئارەزوو وروژێنەرەکان بکەن, هەرووەها سەیری تەمسیل و پڕوپاگەندەی بەرەڵایی بکەن, بێگومان ئەوا منداڵەکانی لەسەر بەرەڵایی و بەدرەوشتی پەروەردە دەبن, پلە پلە دەڕۆن بەرەو لادان و سەرگەردانی, پیاوەتی و جوامێری و ئەدەبی ئیسلامی لە دەستدەدەن.

٤- باوك ئەگەر بواریدا بەمنداڵەکانی گۆڤارو کتێبی بەرەڵایی و چیرۆکی دڵداری بکڕن و بیخوێننەوە, وێنەی ئافرەتانی بەرەڵایان هێنایەوە بۆ ماڵەوە.. بێگومان ئەوا منداڵەکانی لەسەر رێگای بەرەڵایی و خراپە هەنگاو هەڵدەگرن, فێری خۆشەویستی و دڵداری دەبن و, سەرەنجام دەکەونە داوی زیناکردن و بەدرەوشتیەوە..

٥ - باوك ئەگەر بالآپۆشی ژن و كچەكانی فەرامۆشكرد, بەرگری نەكرد لە ژنەكەی و كچەكانی بەرووتی و بەجل و بەرگی كورت و تەنك و تەسكەوە چونەدەرەوە لەماڵ, بەئارەزووی خۆیان تێكەڵاوی ناشەرعیان كرد.. بێگومان شەرەف و ناموسیان دەكەوێتە مەترسیەوەو پاكێتیان لە دەستدەدەن .. ئەو كاتە گریان و پەشیمانی دادیان نادات..

**أتبكي على لبنة وأنت قتلتها**

**لقد ذهبت لبنتي فما أنت صانع؟**

٦- باوك ئەگەر چاودێری منداڵەكانی نەكرد لەكاتی چوون بۆ قوتابخانەو گەڕانەوەیاندا، ئەوا بێكومان منداڵاكانی بەبیانوی قوتابخانەوە دەچن بۆ ئەو شوێن و جێگایانەی كە برەودەدەن بە بەدرەوشتی وەك سینەماو تیاترۆخانەو بارەكان.. چەندەها جار بیوستومانە بەهۆی ئەو فەرامۆشكردنەوە كچان كەوتوونەتە داوی كوڕانی بەدرەوشتەوەو شەرەفیان لەكەداركردوون كاتێك باوك و دایكیان پێیان زانیون كار لەكار ترازوەو ئابڕوویان چووە ؟!...

٧- باوك ئەگەر چاوی نەگێڕا بە كتێبخانەی ماڵەوەدا بزانێ چی دەخوێننەوەو چی دەنووسن.. بێگومان منداڵان بەئارەزووی خۆیان گۆڤارو كتێبی بەرەڵایی دەكڕن و سەیریان دەكەن و دەیانخوێننەوە، بەئارەزووی خۆیان لەگەڵ دڵدارەكانیان خەریكی نامەگوڕینەوە دەبن، بەبێ چاودێری و لێپرسینەوەی سەرپەرشتیارەكەیان!!.. بێگومان هێدی هێدی بەرەو بەدرەوشتی هەنگاو هەڵدەگرن، تا سەرەنجام دەكەونە داوی بێ ئابڕووی و بەبێ ویژدانی و دوور لە ئایین ژیان بەسەردەبەن.. ئەو كاتە چارەسەری و گێڕانەوەیان بۆسەر ڕێگای راست زۆر ئەستەم دەبێ!!..

ئەو بیرباوەڕو بنەما رەوشتیانەی كە پێویستە پەروەردەكاران و باوك و دایك گرنگی پێبدەن, سوربن لەسەری و منداڵەكانیان لەسەری پەروەردە بكەن و پەیوەست بن پێوەی ئەوەیە رایانبهێنن لەسەر ئاكاری جوان و رەوشتی بە زرو، مامەڵەكردن لەگەڵ خەڵكدا بە هێمنی و لەسەرخۆیی.

ئەوەش ئێوەو چەند فەرمودەیەكی پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم كە

مندالْ ئاراسته دەكەن بۆ چاكترین ئاكارو, جوانترین رەوشت و, راست ترین مامەڵەكردن:

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ مَكارِمَ الْأَخْلَاقِ)**[1]. واتە: من بۆ ئەوە رەوانەكراوم تا رەوشتە بەرزو ئاكارە جوانەكان تەواو بكەم.

* پیاوێك پرسیاری كرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە بارەی رەوشت بەرزییەوە، ئەویش ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە: ﴿**خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ**﴾. **الأعراف١٩٩.** واتە: كارئاسانی لە خەڵك داوابكە و چاوپۆشی بكە لە كەموكوڕیەكانیان و، فەرمان بدە بەچاكەو كردەوەیەك كە لەلای شەرع پەسەندە، روو وەرگێڕەو پشت بكە لە نەفام و تێنەگەیشتووان. پاشان فەرموی: **(أن تصل من قطعك وتعطي من حرمك وتعفو عمن ظلمك)**[2]. واتە: خورەوشتی جوان ئەوەیە ئەو كەسەی سەردانت ناكات تۆسەردانی بكەیت بەتایبەتی خزمان، ببەخشە بەوەی پێت نابەخشێ، چاوپۆشیش بكەی لەوەی زوڵم و ستەمی لێكردووی.

* ئەبودەرداء رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(مَا مِنْ شَيْءٍ يُوضَعُ فِي الْمِيزَانِ أَثْقَلُ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ)**[3]. واتە: هیچ كردەوەیەك لەسەر ترازوودا قورستر نیە لە رەوشتی چاكە.

* **أبو ذر** رەزای خوای لێ بێ فەرموی: پیاوێك گوتی ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئامۆژگاریم بكە ئەویش پێی فەرموو: **(اتَّقِ اللَّهِ حَيْثُمَا كُنْتَ وَأَتْبِعْ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ)**[4]. واتە: پارێزكار بەو لەخوا بترسە لە هەركوێیەكدا هەیت, بێ فەرمانی مەكە، لە دوای هەموو كردەوەیەكی خراپەوە

---

1 - أخرج الإمام أحمد: ١٣٧/١٨ برقم: ٨٥٩٥, سلسلة الصحيحة: ١١٢/١برقم: ٤٥, والحاكم والبيهقي.

2 - رواه إبن مردويه بسند حسن, تحقيق الألباني : (ضعيف) انظر حديث رقم: ٤٠٢٦ في ضعيف الجامع.

3 - صحيح أخرجه أبو داود والترمذي, جامع الترمذي: ٣٦٣/٤ برقم: ٢٠٠٣.

4 - حسنه الألباني وأنظر صحيح الجامع: ٩٦.

چاکەیەك بکە با خراپەکە بشواتەوە، چونکە کردەوەی چاکە کردەوەی خراپە لادەبات، لەگەڵ هەموو کەسێکدا کردارو رەفتارت باش بێت.[1]

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَاناً أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً**)[2]. واتە: ئەو موسوڵمانانەی بەتەواوی باوەڕیان بەخودا تەواوە، ئەوانەن کە رەوشتیان چاك و پەسەندە.

* موحەممەدی کوڕی نەصری مروزی فەرموی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و لە بەردەمیدا دانیشت و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دین بریتیە لە چی؟ فەرموی: بریتیە لە رەوشتی چاك, جارێکی تر هات و لای راستیەوە پرسیاری لێکردو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دین چییە؟ فەرموی: رەوشتی چاك, ئەمجا لای چەپیەوە هەمان پرسیاری کردەوە, فەرموی: بریتیە لە رەوشتی چاك, بۆ جاری چوارەم لە پشتەوە هەمان پرسیاری کردەوە, پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاوڕی دایەوە بۆ لایداو فەرموی: بۆ تێناگەی؟ دین ئەوەیە کە توڕە نەبی و هەڵنەچی.

ئەمانەش چەند دڵۆپێك بوون لەدەریای بێ پایانی ئاراستەکردنەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی رەوشتی بەرزو، ئادابی کۆمەڵایەتی و، رەفتارکردنی چاك لەگەڵ خەڵك.. پێویستە لەسەر پەروەردەکاران و باوك و دایك پەیڕەوی لێبکەن و ببنە پێشەنگێکی چاك بۆ خانەوادەو منداڵەکانیان, فێری ئەو رەوشتانەیان بکەن و رایان بهێنن لەسەریان.. تاکو لێبوردە بن بەرامبەر ئەوانەی

---

[1] - ئیبن قەیم دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەقوای خواو رەوشتی بەرزی کۆکردۆتەوە بەیەکەوە، چونکە بەتەقوای خوا و پارێزکاری نێوان خواو بەندەکەی چاك دەبێت، بەرەوشتی بەرزیش نێوانی بەندەو بەدیهێنراوانی خوا چاك دەبێ, پارێزکاری خۆشەویستی خوا زیاد دەکات، رەوشتی بەرزیشت بانگی خەڵك دەکات بۆ ئەوەی خۆشیان بوێیت. وەرگێڕ.

[2] - رواه الترمذي وَقَالَ: (حديث حسن صحيح ). أخرجه أبو داود (٤٦٨٢)، والترمذي( ١١٦٢), تحقيق الألباني صحيح: وأنظر صحيح الجامع:١٥٧٨.

ستەمیان لێدەکەن، سەردانی ئەوانە بکەن کە بەسەریان ناکەنەوە، چاکەکار بن لەگەڵ ئەوانەی کەخراپە دەکەن لەگەڵیان، هەتا لە ناو خەڵکدا دەبنە پیاوی ناو پیاوان، دەبنە مەلائیکەو بەسەر زەویدا دەڕۆن.. ئەمەش تەنها بە پەیڕەوکردنی ئەم ئایەتانە دێنەدی:

﴿**خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ**﴾. **الأعراف١٩٩**. واتە: کارئاسانی لە خەڵك داوابکەو چاوپۆشی بکە لە کەموکوڕیەکانیان، فەرمان بکە بەچاکەو کردەوەیەك کە لەلای شەرع پەسەندە، پشت بکە لە نەفام و تێنەگەیشتووان و روویان لێ وەرگێڕە.

- ﴿**لَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ**﴾. **فصلت:٣٤**. واتە: چاکەو خراپە چوون یەك نین, بەچاکترین شێوە وەڵامی خراپە بدەرەوە, ئەوسا ئەو کەسەی لە نێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتی هەیە, وەك دۆستێکی دڵسۆزو گیانی بە گیانی لێ دێت.

- هەروەها دەفەرموێت: ﴿**وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ**﴾. **آل عمران١٣٤**. واتە: ئەوانەی رقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوەو دەبوورن لە خەڵکی, خواش چاکەکارانی خۆشدەوێت.

بەویست خوا لە باسی بەرپرسیارێتی پەروەردەی جەستەیی و پەروەردەی کۆمەڵایەتیدا بەدرێژی لەو بارەوە دەدوێین, ئەو کاتە خوێنەر رێی لە شتێك دەکەوێت شیفادەری دەردەکان بێ و تینوێتی بشکێنێ.

**دەسا ئەی باوکان و دایکان و دۆستان و پەروەردەکاران!!** دوای ئەوەی زانیتان کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چەندە گرنگیداوە بە لایەنی پەروەردەی رەوشتی منداڵەکانتان.

دوای ئەوەی زانیتان کە رەوشتی بەرز بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی ئیمانی جێگیرو دامەزراو, هۆکارێکە بۆ راستکردنەوەی چەوتی و لاریەکانی منداڵەکانتان.

دوای ئەو دیاردە خراپانەی کە خوێندتانەوە پێویستە جگەر گۆشەکانتانی لێ دوربخەنەوە.

دوای بیستنی ئەو ئامۆژگاریانەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەبارەی رەوشتی بەرزو, مامەڵەی چاکەوە.

**له پاش هەموو ئەمانەوە.. هیچ رێگایەکتان لەپێشدا نەماوە تەنها ئەوەندە نەبێ** که قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵکەن و مەردانە بچنە ئەو مەیدانەوە هەموو هەوڵێکتان بخەنەگەڕ بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانی سەرشانتان بەتەواوی بەرامبەر بەوانەی حەقی پەروەردەو فێرکردن و چاودێریان له ئەستۆتاندایە..

بزانن ئەگەر کەموکوڕیتان نواند بەرامبەر مافی پەروەردەیی قوتابی و منداڵەکانتان لەبارەری رەوشتیانەوە, بێگومان ئەوانەی حەقی پەروەردەیان له ئەستۆتاندایه لەسەر لادان و بەدرەوشتی و تاوانکردن پەروەردەدەبن.. ئەو کاتە دەبنە مەترسی بۆسەر ئاشتی و ئارامی, ئامرێرێکی روخێنەر دەبن بۆ رووخانی کیان و بوونی کۆمەڵگە.. بەڵکو نەوەکانی کۆمەڵگە پەنادەگرن له کردەوە تاوانکاری و رەوشتە کۆمەڵایەتیە خراپ و ناپەسەندەکانیان.

خوای پەروەردگار بە چاودێر بزانن بەسەر خۆتانەوە, ئەو واجبەی لەسەرتانە بەرامبەر بە منداڵەکانتان جێبەجێی بکەن, ئەوی له تواناتاندایه بیخەنەگەڕ, ئەو بەرپرسێتیەی لەسەر شانتانە رای پەڕێنن, ئەگەر بەشێوەیەکی راست و دروست ئەو ئەمانەتان راپەڕاند ئەو کاتە دەبینن منداڵەکانتان دەبنە رەیحانە لەناو ماڵەکانتاندا بۆن و بەرامەیان خۆشدەبێ, لەناو کۆمەڵگەشدا دەدرەوشێنەوەو رووناکی بەخش دەبن, دەبنە مەلائیکەو بەسەر زەویدا بەئارامی و دڵنیایەوە هاتوچۆ دەکەن.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ **وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ..**﴾. **التوبة١٠٥**. واتە: ئەی پێغەمبەر! بەو خەڵکە بڵێ: هەرچی دەتوانن لەکارو کردەوە ئەنجامیبدەن، چونکە خوا کارو کردەوەکانتان دەبینێت. هەروەها پێغەمبەرو ئیماندارانیش..

## بەندی سێیەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی جەستەیی

یەکێکی تر لەو بەرپرسیارێتیە گەورانەی کە ئیسلام واجبی کردووە لەسەر پەروەردەکاران لە باوکان و دایکان و مامۆستایان.. بەرپرسێتی پەروەردەی جەستەییە, بۆ ئەوەی منداڵان گەشەبکەن لەسەر چاکترین شێوەی نەشونماکردنی بەهێزی و سەلامەتی جەستەیی و, دیاردەی تەندروستی و چوست و چالاکی.

ئەی پەروەردەکاران ئەوەش ئێوەو ئەو بەرنامە زانستیەی کە ئیسلام وێنەو نەخشەی بۆ کێشاوە لە رووی پەروەردەی جەستەیی منداڵانەوە, تاکو بزانن ئەو سپاردەو ئەمانەتەی لەسەر شانتانە چەندە گەورەیە, هەروەها شارەزای ئەو بەرپرسێتیە بن کە خوای پەروەردگار واجبی کردووە لەسەرتان:

**١- دابینکردنی بژێوی خێزان و منداڵ واجبە:**

بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: ﴿**وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا..**﴾. **البقرة٢٣٣**. واتە: واجبە لەسەر هەموو بەخێوکەرێك بژێوی و پۆشاك بەپێی تواناو دەسەڵاتی خۆی دابین بکات بۆ خاوو خێزان و منداڵەکانی و زوڵم و ستەمیان لێ نەکات..

هەروەها بە بەڵگەی ئەم فەرمودەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە دەفەرموێت: (**دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي رَقَبَةٍ وَدِينَارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ أَعْظَمُهَا أَجْرًا الَّذِي أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ**)[1]. واتە: دینارێك ببەخشیت لەرێی خواو, دینارێك بدەیت بۆ ئازادکردنی کۆیلەیەك, دینارێك بدەیت بەهەژارێك, دینارێك خەرج بکەیت بۆ خێزان و منداڵەکانی خۆت, ئەوەیان خێرو پاداشتی گەورەترە بۆ خێزان و منداڵەکانی خۆتی خەرج دەکەیت.

جا هەر وەکو باوك چۆن خێرو پاداشتی بۆ هەیە لەسەر دابینکردنی بژێوی و رزق و رۆزی بۆ خێزان و منداڵەکانی, ئاوەهاش ئەگەر تونای هەبوو خەرجی نەکێشان و

[1] - أخرجه مسلم ٧٨/٣ ( ٩٩٥ ) ( ٣٩ ), مشكاة المصابيح: ١٩٣١.

ڕژدی نواند بەرامبەریان ئەوا پێی گوناهبار دەبێت, گوێ بگرن بزانن پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم لە بارەی ئەو کەسانەوە کە رزق و ڕۆزی دابین ناکەن بۆ خانەوادەکەیان و مافیان پشتگوێ دەخەن چی دەفەرموێت: **(كَفَى بِالمَرْءِ إِثْماً أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ)**[1]. واتە: ئەوەندە بەسە بۆ گوناهباری پیاو, کە ئەو کەسانەی بەخێویان دەکات پشتگوێیان بخات و رزق و ڕۆزیان بۆ دابین نەکات. وە لە ریوایەتی پێشەوا موسلیمدا دەفەرموێت: **(كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يَحْبِسَ عَمَّنْ يَمْلِكُ قُوتَهُ)**[2]. واتە: بەسە بۆ گوناهباری پیاو نان و ئاو بگرێتەوە لەو کەسانەی بەخێویان دەکات.

بژێوی دابینکردن بۆماڵ و منداڵ بریتیە لەوەی باوك خواردنی پاك و حەڵاڵ, پۆشاکی چاك, شوێنی حەوانەوەیان بۆ دابین بکات.. تاکو لەبەر نەبوونی و رووتی و رەجاڵی جەستەیان پەکی نەکەوێ, تووشی پەتاو نەخۆشی ترسناك نەبن.

**٢ - شوێنکەوتنی بنەما تەندروستیەکان لە خواردن و خواردنەوەو خەوتندا:**

بۆ ئەوەی منداڵان ڕابێن لەسەری و خوی پێوەبگرن.

لە ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەبارەی **خواردنەوە:** خۆپارێزی لە زۆرخۆری و ئینتەلا, قەدەغەکردنی خوارن و خواردنەوەی زیاد لە پێویستە..

* پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: **(مَا مَلَأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلَاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ فَإِنْ كَانَ لَا مَحَالَةَ فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ)**[3]. واتە: ئادەمیزاد هیچ دەفرێکی پڕ نەکردووە خراپتر بێت لە پڕکردنی ورگی, ئادەمیزاد چەند پاروە نانێکی بەسە کە هێزی پشتی ڕابگرێ, خۆ ئەگەر هەر چاری نەبوو ویستی زۆر بخوات ئەوە با گەدەی بکات بەسێ بەشەوە: بەشێکی بۆ خواردن, بەشێکی بۆ خواردنەوە, بەشێکیش بۆ هەناسەدان.

---

[1]- حديث صحيح: أخرجه : أبو داود ( ١٦٩٢ ) ، والنسائي في " الكبرى " ( ٩١٧٦ ).

[2]- : أخرجه مسلم: ٧٨/٣ (٩٩٦) (٤٠).

[3]- أخرجه ابن ماجه (٣٣٤٩) ، والنسائي في " الكبرى: (٦٧٧٠)، والترمذي (٢٣٨٠) ، وقال: (حديث حسن صحيح).

له ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی **خواردنەوە**: بە دوو تاسیٚ جار دەبێت **بخورێتەوە**, فوو لێکردنی قەدەغەیەو, نابیٚ بەپێوە **بخورێتەوە**..

* ئیبن عەباس ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(لَا تَشْرَبُوا وَاحِدًا كَشُرْبِ الْبَعِيرِ وَلَكِنْ اشْرَبُوا مَثْنَى وَثُلَاثَ وَسَمُّوا إِذَا أَنْتُمْ شَرِبْتُمْ وَاحْمَدُوا إِذَا أَنْتُمْ رَفَعْتُمْ)**[1]. واتە: بەیەك بینی وەك وشتر ئاو مەخۆنەوە, بەڵکو بەدوو یان سیٚ جار بیخۆنەوە, لەپێشەوە ناوی خوا بهێنن و له دوایشدا سوپاس و ستایشی خوا بکەن.

* ئەبو قەتادە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ فەرموی: **(أَنَّ النبيَّ صلى الله عليه وسلم نَهَى أَنْ يُتَنَفَّسَ فِي الإِناءِ)**[2]. قەدەغەیکردووە هەناسەدان لەناو ئەو دەفرەدا کە شتی پێدەخۆنەوە, بەڵکو لەلاوە هەناسە بدەن و فووی لێنەکەن ئەگەر گەرم بوو.

* ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(لَا يَشْرَبَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَائِمًا فَمَنْ نَسِيَ فَلْيَسْتَقِئْ)**[3]. واتە: باکەس لە ئێوە بەپێوە نەخواتەوە, هەرکەسیش لەبیری چوو با خۆی بڕشێنێتەوە.[4].

---

[1] - قال الشيخ الألباني: ضعيف, جامع الترمذي: ١٨٨٥.

[2] - **متفق عَلَيْهِ: أخرجه البخاري ١٤٦/٧ ( ٥٦٣٠ ) ، ومسلم في الطهارة: ١٥٥/١ ( ٢٦٧ ) ( ٦٥ ) .**

[3] - رواه مسلم: ٣٠٧/١٠ برقم: ٣٧٧٥.

[4] - ئیمام غەزالی لە کتێبی(إحياء علوم الدين) دا ئەو ئادابانەی کە منداڵ لەکاتی نان خواردن دا زۆر پێویستی پێیەتی هێناویەتی: - تەنها بەدەستی ڕاست خواردنەکە بگریٚ و ١ - بڵێٚ بسم الله بەناوی خوا. ٢ - لەلای خۆیەوە خواردنەکە بخوا و دەست بۆ ئەملاو ئەولا نەبا. ٣ - لەپێش خەڵکەکەوە هەڵپە بۆ خواردن نەکا. ٤ - چاو نەبڕێتە خواردنەکە و ئەوانەی خواردن دەخۆن. ٥ - لە کاتی خواردندا زۆر پەلەپەل نەکا. ٦ - خواردنەکە چاك بجاویٚ ئەمجا قوتی بدا. ٧ - پاروو لەسەر پاروو نەکا بەڵکو بەهێواشی پاروو بکا. ٨ - پۆشاك و هەردوو دەستەکانی لە خواردنەکە هەڵنەسویٚ. ٩ - زۆرخۆری بەلای منداڵەکەوە ناشیرین بکریٚ، وەزۆر خۆر بەماڵات بچوێندریٚ. ١٠ - لەبەردەم منداڵەکەدا زەمی زۆر خۆری بکریٚ و ستایشی منداڵی بە ئەدەب و کەم کەخۆر بکریٚ . ١١ - خواردن بەخشین و زۆر گرینگی نەدان پێی بەلای منداڵەوە خۆشەویست بکریٚ. ١٢ - قەناعەت کردن بە خواردنی زبر. وەرگێڕ لە کتێبی فیقهی منداڵ مامۆستا ئەبو بەکری صدیقی.

له ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەبارەی **خەوتنەوە: خەوتن** دەبێت لەسەر لای ڕاست بێ, چونکە خەوتن لەسەر لای چەپ زیان بەدڵ دەگەیەنێ و دەبێتە هۆی بەربەست لەرێی هەناسەداندا..

**(براء)** ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: کاتێك چوویتە سەر جێگای خەوتن دەستنوێژێکی بۆ بگرەو لەسەر لای ڕاست راکشێ و بڵێ: **(اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ لامَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ وَبِرَسُولِكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ فَإِنْ مَاتَ مَاتَ عَلَى الْفِطْرَةِ)**[1]. واتە: پەروەردگارم من خۆم سپارد بەتۆ, ڕووی ڕووخسارم کردە لای تۆ, خۆم دایە دەست تۆ, پەنام هێنا بۆ تۆو هەر خۆت پشت و پەنامی, چاوی هواو ئومێدم لەدەرگای بەزەیی و میهری تۆیە, مەترسیم لەقەهرو سزای تۆ هەیە, هیچ پەناو دالّدەیەك نیە لەقەهرو خەشمی تۆ مەگەر هەر لەلای خۆت, باوەڕم بەو کتێبانە هەیە کە ناردووتن, بەو پێغەمبەرەش کە ڕەوانەت کردووە, ئەگەر لەو شەوەدا بمریت ئەوە لەسەر فیترەت دەمریت واتە بەموسلّمانی دەمری.ئەوە با کۆتا وشەت بێ کە دەیڵێی.

**٣ - خۆپاراستن لەو نەخۆشیانەی دەگوێزرێنەوە:**

بە بەلّگەی ئەم فەرمودانەی لای خوارەوە:

* جابری کوڕی عبدالله فەرموی: **(كَانَ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ رَجُلٌ مَجْذُومٌ فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّا قَدْ بَايَعْنَاكَ فَارْجِعْ)**[2]. وەفدی**(الثقيف)** پیاوێکی گولیان لەگەلّدا بوو, ویستیان بێنە خزمەتی پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم بۆ پەیمان و بەلّێندان بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم, ئەویش هەوالّی بۆ ناردن کە پێی بلّێن بگەڕێتەوە پەیمان و بەلّێنمان لی وەرگرتووە

* پێشەوا بوخاری ریوایەتی کردووە لە پێغەمبەری پێشەواوە صلى الله عليه وسلم

[1] - البخاري في التوقيت: ٧٤٨٨, ومسلم في الذكر والدعاء: ٥٦ -٥٨, ٢٧١.

[2] - صحيح رواه مسلم: ٢١٠/١١ , المشكاة: ٤٥٨١/٢ .

که فەرمویەتی: **(وَفِرَّ مِنْ الْمَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنْ الْأَسَدِ)**[1]. واتە: چۆن لەشێر هەڵدێی ئاواش لە گول هەڵبێ.

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ فەرموی: بیستم لەپێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: **(لا يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ)**[2]. واتە: با نەخۆش نەبرێتە لای ئەوانەی لەش ساغن.

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر پەروەردەکاران بەتایبەتی دایکان کاتێك منداڵێکی تووشی نەخۆشی هات نەیەڵێت تێکەڵاوی منالەکانی تری بکا, بۆ ئەوەی نەخۆشیەکە تەشەنە نەکاو بڵاونەبێتەوە..دەی ئیتر چی لەم رێنماییانەی پەیامبەر گەورەترە بۆ پەروەردەی جەستەیی و, پارێزگاری لە رووی تەندروستیەوە!!.

**٤- چارەسەری نەخۆشی بەدەرمان و تەداوی:**

چارەسەری بەدەرمان و تەداوی کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر لابردنی بەڵاو نەخۆشی و بەدیهاتنی شیفا..

فەرمودەی زۆر هاتووە لەبارەی تەداویەوە, ئەمانەی لای خوارەوە هەندێکیانن بەکورتی:

* جابیر رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ بَرَأَ بِإِذْنِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)**[3]. واتە: هەر دەردێك دەرمانی خۆی هەیە, ئەگەر دەرمانەکە دەردەکەی پێکا ئەوا بە ئیزنی خوای گەورە چاك دەبێتەوە.

* ئوسامەی کوڕی شەریك رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بووم صلی الله علیه وسلم هەندێ دەشتەکی هاتن و وتیان: **(يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَتَدَاوَى؟ قَالَ تَدَاوَوْا يَا عِبَادَ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يضع دَاءً إِلَّا وضع لَهُ**

---

[1] - رواه البخاري: ٥٧٠٧, وهو في الصحيحة برقم ٧٨٣ .

[2] - صحيح سنن أبي داود: ١٧/٤ برقم: ٣٩١١.

[3] - صحيح رواه مسلم ,المشكاة: ٤٥١٥/٢ .

**شِفَاءً إِلَّا الْمَوْتَ وَالْهَرَمَ)**[1]. واته: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئایا ئێمە تەداوی خۆمان نەکەین؟ فەرموی: بەڵێ ئەی بەندەکانی خوا تەداوی خۆتان بکەن, ئەوەش بزانن خوای پەروەردگار هیچ دەردێکی دانەناوە تا دەرمان و چارەسەری بۆ دانەنابێت جگە لەیەك دەرد, وتیان ئەو دەردە چییە؟. فەرموی: پیرییە.

* ئەبو خوزامە لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوەو گوتویەتی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو خۆپاراستن و دوعاو تەداویەی کە چارەسەری خۆمانی پێدەکەین, ئایا ئەوانە هیچ لە قەدەری خوا دەگێڕنەوە؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: **(إِنَّهُ مِنْ قَدَرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)**[2]. واتە: ئەوەش هەر لە قەدەری خوای گەورەوەیە.

دەی ئیتر هیچ نەماوەتەوە بۆ باوکان و دایکان و پەروەردەکاران تەنها ئەوەندە نەبێت کە دەستبگرن بەئاڕاستەکردنەکانی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم لەبارەی گرنگیدان بەمنداڵەکانیانەوە کاتێك تووشی نەخۆشی بوون چارەسەریان بکەن.. چونکە دەستگرتن بەهۆکارەکانەوە شتێکی سروشتی و فیترییە, لە بنەماو کرۆکی بیروباوەڕی ئایینی ئیسلامە!!.

**٥ - پەیڕەویکردنی دروشم و بیروباوەڕی: (لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ):**

* ئەبو سەعیدی خودری رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ)**[3]. واتە: با کەس زیان لە خۆی نەدات و زیانیش بە کەسی تر نەگەیەنێت.

زانایان و شەرعناسان ئەم فەرموودەیان بەیەکێك لەگرنگترین قاعیدەو بنەما شەرعی و گرنگەکان حسابکردووە کە ئیسلام دایناوە..کارو فەرمانی زۆری لەسەر بنیاتنراوە بۆ پاراستنی کیان و بوونی تاك و کۆمەڵگە و, نەهێشتنی زیانگەیاندن بەخەڵك..

---

[1] - رواه أحمد: ١٧٧٢٨, قال الألباني صحيح في الأدب المفرد: ١٠٩/١ رقم: ٢٩١.

[2] - رواه أحمد والترمذي وابن ماجه, المشكاة: ٩٧/١.

[3] - رواه مالك: ١٢٣٤, وقال الشيخ الألباني صحيح, إبن ماجة:٢٣٤٠, سلسلة الصحيحة: ٢٥٠.

هەر لەبەر رۆشنایی ئەو قاعیدەو بنەما شەرعیە گرنگەدا واجبە لەسەر پەروەردەکاران بەتایبەتی دایکان کە رێنمایی منداڵەکانیان بکەن پابەندبن بەرێنماییە تەندروستیەکان و, هۆکارەکانی خۆپارێزی بۆ پاراستن و تەندروستی منداڵ و, گەشەپێدانی هێزی جەستەیی.. هەروەها لەسەریانە بەیارمەتی ئەو کەسانەی پسپۆڕن لەو بوارەدا ئەوەی پێویستە بیگرنەبەر بۆ پاراستنی جەستەی منداڵ لە بەڵای نەخۆشیە ترسناك و درمەکان ئەوانەی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوێزرێنەوە..

- جا ئەگەر خواردنی میوەی کاڵ و پێنەگەیشتوو ئازاری جەستە بدات و, ببێتە هۆی نەخۆشی.. کەواتە پێویستە لەسەر پەروەردەکاران رێنمایی منداڵان بکەن و رایان بهێنن لەسەر خواردنی میوەی پێگەیشتوو.

- ئەگەر خواردنی سەوزەو میوە پێش شتن ببێتە هۆی دەردو نەخۆشی.. بێگومان دەبێ رێنمایی منداڵان بکەن و رایان بهێنن لەسەر خواردنی سەوزەو میوەی پاك و شۆراوە.

- ئەگەر خواردن لەسەر خواردن و زۆر خۆری ببێتە هۆی نەخۆشی گەدەو کۆئەندامی هەرس و هەناسەدان. کەواتە پێویستە لەسەر پەروەردەکاران رێنمایی منداڵان بکەن و رایان بهێنن لەسەر کەمخۆری و خواردن لەکاتی تایبەتیو دیاریکراودا.

- ئەگەر نانخواردن پێش شتنی دەستەکان ببێتە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی.. کەواتە پێویستە لەسەر پەروەردەکاران رێنمایی منداڵان بکەن لەسەر پەیڕەوکردنی رێنماییەکانی ئیسلام بەشۆردنی هەردوو دەست پێش نانخواردن و دوای نانخواردن.

- ئەگەر فووکردن لە کەوچك و ئەو دەفرەی کە خواردن و خواردنەوەی تێدا دەخورێت ببێتە هۆی زیانی جەستەیی.. کەواتە پێویستە لەسەر پەروەردەکاران ئەو دیاردە زیان بەخشە قەدەغەبکەن لە منداڵان.

هەر بەو شێوەیە ئەگەر هاتوو پەروەردەکاران پابەندبوون بەرێنماییە تەندروستیەکانەوەو, منداڵانیان راهێنا لەسەر پەیوەست بوون پێیانەوە.. بێگومان منداڵان گەشەدەکەن لەسەر تەندروستی تەواو, لەش ساغی, بەهێزی جەستەو, دیاردەی چوست و چالاکی!!.

٦- راهێنانی منداڵ لەسەر مەشقکردن و ئەسپ سواری:

بۆ بەدیهاتنی ئەم ئایەتە: ﴿**وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ..** ﴾. واتە: هەرچی لە توواناتاندایە لە کەرەستەی جەنگی ئامادەی بکەن.

* هەروەها بە پەیڕەوکردنی ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە: (**الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ..**) [1]. واتە: ئیمانداری بەهێز چاکترو خۆشەویسترە لای خوا لە ئیمانداری لاواز..

لە پێناوی دەستەبەرکردنی ئەمانەدا ئیسلام بانگەوازی کردووە بۆ فێربوونی **مەلەوانی و مەشقکردن و تیرهاوێژی و ڕەمی و ئەسپ سواری**, ئەوانەش لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئاراستەکردنانەی پێغەمبەری پێشەوادا صلی الله علیه وسلم:

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (**كُلُّ شَيْءٍ لَيْسَ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَهُوَ لَهْوٌ أَوْ سَهْوٌ إِلا أَرْبَعَ خِصَالٍ: مَشْيُ الرَّجُلِ بَيْنَ الْغَرَضَيْنِ ، وَتَأْدِيبُهُ فَرَسَهُ ، ومُلاعَبَةُ أَهْلِهِ ، وَتَعَلُّمُ السِّبَاحَةِ**) [2]. واتە: هەرشتێك زیكرو یادی خوا نەبێ ئەوە قسەی پڕوپوچە یان گاڵتەو گەپ و بێ ئاگایی و غافڵ بوونە تەنها چوار شت نەبێ: هات و چۆی پیاو لە نێوان دوو نیشانەنەدا بۆ ڕەمی و تیرهاوێژی, مەشقکردن بە ئەسپەکەیی و ئامادەکردنی بۆ جیهاد, گاڵتەو گەپ کردن لەگەڵ خێزان و منداڵەکانی, فێربوونی مەلەوانی.

* عوقبەی کوڕی ڕعامر گوتی بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر منبەر دەیفەرموو: ﴿**وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ..**﴾. **أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ**) [3]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر مینبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوەو سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: ئاگاداربن هێز

[1] - أخرجه مسلم في القدر: ٥٦/٨ ( ٢٦٦٤ ) ( ٣٤ ), وأحمد في المسند: ٣٧٠/٢.

[2] - رواه والطبراني في الكبير: ٢٧٠/٢ والحاكم, وقال الشيخ الألباني : صحيح, سلسلة الصحيحة: ٣١٥, غاية المرام: ٣٨٩.

[3] - صحيح رواه مسلم :٣٢/١٠برقم: ٣٥٤١, معالم السنن: ٢٨٣, مشكاة المصابيح: ٣٨٦١/٢

مینبه‌ر ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه‌و سێ جار له‌سه‌ر یه‌ك فه‌رموی: ئاگاداربن هێز بریتیه له‌ ره‌می و تیرئه‌ندازی.[1]

* **(عَليكُم بالرَّمْيُ فإنّه خير لهوكم)**[2]. واته‌: ئێوه‌ ره‌می و تیرئه‌ندازی بكه‌ن, چونكه‌ چاكترین گاڵته‌و گه‌پتانه‌.

* **(ارْمُوا فَأَنَا مَعَكُمْ كُلِّكُمْ)**[3]. واته‌: ره‌می و تیرئه‌ندازی بكه‌ن من له‌گه‌ڵ هه‌مووتان پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم مۆڵه‌تی حه‌به‌شیه‌كانی دا كاتێك له‌ مزگه‌وتدا یاریان ده‌كرد به‌رمه‌كانیان, هه‌روه‌ها مۆڵه‌تی عائیشه‌ی خێزانی داوه‌ ته‌ماشایان بكات, پێشی فه‌رموون: **(دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ)**[4]. واته‌: رمبازی و تیرئه‌ندازی بكه‌ن ئه‌ی نه‌وه‌ی ئه‌رفیده‌ كینایه‌یه‌ بۆ حه‌به‌شیه‌كان, عه‌ره‌به‌كان وایان بانگ ده‌كردن. عومه‌ری كوڕی خه‌تاب ره‌زای خوای لێ بێ له‌و كاته‌دا چووه‌ ژووره‌وه‌ ورده‌ به‌ردی هه‌ڵگرت پێیاندا بكێشێ, پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم فه‌رموی: وازیان لێ بێنه‌ ئه‌ی عومه‌ر.

* ئه‌بو هوره‌یره‌ ره‌زای خوای لێ بێ گێڕاویه‌تیه‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم ده‌فه‌رموێت: **(لَا سَبَقَ إِلَّا فِي خُفٍّ أَوْ حَافِرٍأو نصل)**[5]. واته‌: بارمته‌ نیه‌ ته‌نها بۆ خوف و تیرو هه‌ر شتێك زه‌وی پێ هه‌ڵكه‌نرێت نه‌بێ. چونكه‌ ئه‌وانه‌ ده‌وری كایگه‌رو گرنگیان هه‌یه‌ بۆ ئاماده‌كردنی كه‌ره‌سه‌و هۆكاره‌كانی جه‌نگ و تێكۆشان.

* ئه‌بو هوره‌یره‌ ره‌زای خوای لێ بێ گێڕاویه‌تیه‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم ده‌فه‌رموێت: **(ارْمُوا بَنِي إِسْمَاعِيلَ فَإِنَّ أَبَاكُمْ كَانَ رَامِيًا )**[6]. واته‌: تیرئه‌ندازی

---

[1] - جا ئه‌گه‌ر له‌و رۆژه‌دا تیرئه‌ندازی بووبێ ئه‌وا ئه‌مڕۆ مه‌شقكردن له‌سه‌ر هه‌موو جۆره‌ كه‌ره‌سه‌یه‌كی جه‌نگی ده‌گرێته‌وه‌. وه‌رگێڕ.

[2] - صحيح رواه البزار والطبراني بإسناد جيد, غاية المرام: ٣٨١.

[3] - رواه البخاري في صحيحه: ٣٠/١٠ برقم: ٢٦٨٤, صحيح في سنن إبن ماجة: ٢٢٦٧.

[4] - رواه البخاري: ٦/٤ برقم ٨٩٧, ومسلم: ٤١٧/٤ برقم: ١٤٨٢.

[5] - صحيح سنن إبن ماجة:٢/ ٩٦٠ برقم: ٢٨٧٨, والنسائي:٦/٢٢٧ برقم: ٣٥٨٩ و احمد: ٧١٧٠ .

[6] - رواه البخاري في صحيحه: ٣٠/١٠ برقم: ٢٦٨٤, صحيح في سنن إبن ماجة: ٢٢٦٧.

بکەن ئەی نەوەی ئیسماعیل چونکە بەراستی باوکتان تیرهاوێژ بووە.

**٧- ڕاهێنانی منداڵ لەسەر بەتەنگ دنیاوە نەچوون:**

بۆ ئەوەی منداڵ کاتێك گەیشتە تەمەنی لاوی و باڵغ بوون هەستێ بەئەرکی جیهادو تێکۆشان, هەروەها بانگەواز بکات بۆ دینی خوا بەشێوەیەکی جوان و, بەتەواوی مانا..

لە چەندەها فەرمووددا بانگەواز کراوە بۆ ژیانی بەتەنگ دنیاوە نەچوون و ڕۆنەچوون لە نازو نیعمەتەکانداو پەروەدەکردن لەسەر ژیانی زبری:

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە موعازی فەرموو: **(إِيَّاكَ وَالتَّنَعُّمَ فَإِنَّ عِبَادَ اللَّهِ لَيْسُوا بِالْمُتَنَعِّمِينَ)**[1]. واتە: ئاگاداربە لەژیانی ڕۆچوون لەناو نازو نیعمەتەکاندا, چونکە بەندەکانی خوا دوورن لە خۆشگوزەرانی, وە دنیا نەویستن.

ئەوەندە بەسە ژیانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەرووی دنیا نەویستی و زبری, خواردن و خواردنەوەی, پۆشاك و, خانووبەرەیەوە بکرێتە سەرمەشق و پێشەنگ .. بۆ ئەوەی نەوەکانی ئیسلام لەسەر ڕێنمایی و سوننەتەکانی ئەو هەنگاو هەڵبگرن و.. بەردەوام ئامادەبن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕووداوە سەخت و دژوارەکان, بەرگەی هەموو بەڵاو ناخۆشیەکان بگرن..

بۆ ئاگاداری ئەگەر نەتەوەی ئیسلام ڕوویانکردە خۆشگوزەرانی, لەناو نازو نیعمەتەکاندا ڕۆچوون, لەسەر جێگای ئاوریشم و شل و نەرمدا خەوتن, هەڵخەڵەتان بەبرق و باقی شارستانیەتی مادی.. ئەوە هەر زوو دەڕووخێن و, خۆیان ناگرن لەبەردەم گورزی دوژمنانداو خۆ بەدەستەوە دەدەن, ڕۆحی خۆڕاگری و جیهادو تێکۆشان لە پێناوی خوا لە دەروونیاندا دەکوژێتەوە.. ڕووخانی دەوڵەتی ئەندەلوس لەمێژوودا زۆر دوور نیەو هێشتا لە زەینماندا ماوەتەوە !!..

**٨- ڕاهێنانی منداڵ لەسەر ژیانی پیاوەتی و دوور لە تەمەڵی و فشۆڵی:**

لەبەر ڕێنوومایی ئەم فەرموودانە:

---

[1] - صحیح رواه أحمد:٢١٠٨٩, مشكاة المصابيح: ٣/٢٦٢ ٥.

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلَا تَعْجَزْ.**)[1]. واتە: سووربە لەسەر ئەوەی سوودت پێدەگەیەنێت, پشت تەنها بەخوای گەورە ببەستەو, دەستەپاچە مەبەو دەستەوسان لێی دامەنیشە..

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (**كُلُّ شَيْءٍ لَيْسَ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَهُوَ لَهْوٌ أَوْ سَهْوٌ إِلا أَرْبَعَ خِصَالٍ: مَشْيُ الرَّجُلِ بَيْنَ الْغَرَضَيْنِ ، وَتَأْدِيبُهُ فَرَسَهُ ، وَمُلاعَبَةُ أَهْلِهِ ، وَتَعَلُّمُ السِّبَاحَةِ**)[2]. واتە: هەرشتێك زیکرو یادی خوا نەبێ ئەوە قسەی پڕوپوچە یان گاڵتەو گەپ و بێ ئاگایی و غافڵ بوونە تەنها چوار شت نەبێ: هات و چۆی پیاو لە نێوان دوو نیشانەنەدا بۆ رەمی و تیرهاوێژی, مەشقکردن بە ئەسپەکەیی و ئامادەکردنی بۆ جیهاد, گاڵتەو گەپ کردن لەگەڵ خێزان و منداڵەکانی, فێربوونی مەلەوانی.

* ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ**)[3]. واتە: زیناکەر لەکاتی زیناکردندا ئیماندار نیە, ئەو کەسەی دزی بکا لە کاتی دزیکردندا ئیماندار نیە, ئەو کەسەی مەی و ماددە سەرخۆشکەرەکان بخواتەوە لە کاتی خواردنەوەیدا ئیماندار نیە. ئیمام نەسائی ئەمەشی بۆ زیادکردووە ئەگەر ئەو کردارەی ئەنجامدا ئەوە رەشمەی ئیسلامی لەگەردنی خۆی داماڵیوە: (**فَإِذَا فَعَلَ ذَلِكَ خَلَعَ رِبْقَةَ الْإِسْلَامِ مِنْ عُنُقِهِ**)[4].

* ئەبو هورەیرە رازی خوای لێ بێ گێڕایەوەویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ**

---

[1] - رواه مسلم: ١٤٢/١٣ برقم: ٤٨١٦ , وأحمد في المسند: ٢/ ٣٧٠.

[2] - رواه والطبراني في الكبير: ٢٧٠/٢ والحاكم, وقال الشيخ الألباني : صحيح, سلسلة الصحيحة: ٣١٥, غاية المرام: ٣٨٩.

[3] - متفق عليه: المشكاة: ٥٣/١.

[4] - رواه النسائي: ٣٦/١٥ برقم: ٤٧٨٦.

**الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلَا يَجِدْنَ رِيحَهَا وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا)** [1].

واتە: دوو کۆمەڵ هەیە لەڕیزی ئەهلی دۆزەخن و من نەمدیون: جۆرێکیان قامچیان پێیە ریشودار وەك کلکی مانگا وایە کە ئەشکەنجەی خەڵکی پێدەدەن، جۆرەکەی ترشیان: ئافرەتانێکن پۆشاکیان لەبەردایە بەڵام رووتن(چونکە تەنك و کورتە یان تەسکە) ئەوانە هەم خۆیان لەخشتەچوون هەم خەڵکیش لەخشتەدەبەن، بەفیزو لەنجەو لارەوە دەڕۆن بەرێگادا، قژی سەریان لە دواوە وەك کۆپارەی پشتی وشتر بەرزدەکەنەوە، ئەوانە نەدەچنە بەهەشت و نەبۆنیشی دەکەن کە بۆنی بەهەشت ئەوەندەو ئەوەندە ساڵە ڕێ دەڕوات.

ئەمانە کە بینیت چەند دڵۆپێك بوون لەدەریای بێ پایانی ئاراستە راست و دروستەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم , لە ژیانی راستی و پیاوەتی, هۆشیارکردنەوە لە ژیانی دوور لە تەمەڵی و هەڵوەشاوەیی.. وەك زانراوە ئەگەر منداڵ نەشونمایکرد لەسەر ژیانی تەمەڵی و هەڵوەشاوەیی, پەروەردە بوو لەسەر تاوان و خراپەکاری, پلە پلە لاواز دەبێ , کەسێتی دەڕووخێ, دەروونی ئاڵۆزدەبێ, جەستەی ئامادە دەبێت بۆ ترسناکترین دەردو نەخۆشی.

لەبەر ئەمانە هەموو پێویستە لەسەر پەروەردەکاران بەتایبەتی دایکان لەسەرەتاوە پەیمان بدەن چاودێری منداڵەکانیان بکەن, تۆوی پیاوەتی و جوامێری و زبری و بەرزی و رەوشتی جوان لەدەروونیاندا بڕوێنن.

هەروەها پێویستە لەسەریان بەدووریان بگرن لەو شتانەی دەبنە هۆی رووخانی پیاوەتی و کەسێتیان و, کوشتن و لەدەستدانی گەورەیی رەوشت و, لاوازی ئاوەزو جەستەیان.. بەراستی ئەگەر بەو شێوەیە بوون ئەوە هیچ گومانی تێدا نیە بیرو هۆشیان سەلامەت دەبێت, جەستەیان بەهێز دەبێت, رەوشتیان پارێزراو دەبێ, رۆحیان بەرز دەبێ, هاندەرێکی بەهێز دەبێ بۆ بەدیهێنانی هیواو ئاواتەکانیان..

---

[1]- أخرجه مسلم ١٦٨/٦ (٢١٢٨) (١٢٥) , وأحمد في مسنده: ٣٥٦/٢.

**ئەی پەروەردەکاران ئەمانەش گرنگترین ئەو بنەمایانە بوون کە ئیسلام وێنەی بۆ کێشاوە لەبارەی پەروەردەی جەستەیی منداڵانەوە..**

بێگومان ئەگەر گرنگیتان پێدان و, لەسەرەتاوە هەستان بەچاودێریکردن و ئاراستەکردنی ئەو نەوەیە لەرووی پەروەردەو بەهێزی و تەندروستی و چوست و چالاکیەوە.. ئەوە هەستاون بەجێبەجێکردنی ئەو ئەمانەتەی لەسەرشانتانە, بەدیهێنانی ئەو بەرپرسێتیەی کە خوای گەورە واجبی کردووە لەسەرتان, هەروها بەرووی سپی و گەشەوە بەدیداری پەروەردگاتان شاد دەبن, لەگەڵ پەیامبەران و راستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان دەبن لە قیامەتدا کە ئەوانەش چاکترین هاوەڵن!!.

چەند دیاردەیەکی ترسناك هەیە کە دەوروبەری گەورەو بچوك و گەنج و لاوەکانی داوە, بۆیە واجبە لەسەر پەروەردەکاران بەتایبەتی باوك و دایك لێیان ئاگاداربن و زیان و مەترسیەکانیان بزانن, بەڵاو مەرگەساتەکانیان روون بکرێتەوە بۆ ئەو کەسانەی ئەرکی پەروەردەیان لە ئەستۆدایە.. تاکو نەکەونە داوی ئەو دیاردانەو سەرگەردان و ماڵ وێران نەبن و ئاگری ئەو بەڵایانە نەیان سوتێنێ..

من پێم وایە ئەو دیاردانەی کە زۆر بەربڵاون لەناو منداڵ و گەنج و لاوەکاندا دیارترینیان ئەم چوار دیاردانەی لای خوارەوەن, کە بەیارمەتی خوای پەروەردگار باسی هەر یەکێکی لەوانەتان بۆ روون دەکەینەوە:

١ - دیاردەی جگەرەکێشان. ٢ - دیاردەی ئاوهێنانەوە بەدەست.

٣ - دیاردەی مادە سەرخۆشکەرو سڕکەرەکان. ٤ - دیاردەی زیناکردن و نێربازی.

**١ - دیاردەی جگەرەکێشان:**

بەداخەوە یەکێك لە بەربڵاوترین دیاردە زیانبەخشەکان کە لەم رۆژگارەدا بەچاوی خۆمان دەیبینین دیاردەی جگەرەکێشانە, هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵی گرتۆتەوە, گەورەو بچوك, ئافرەت و پیاو, پیرو گەنج, کەس لەدەستی رزگاری نەبووە مەگەر یەکێك ئیرادەی زاڵبێ بەسەر هەواو ئارەزووەکانیدا, یان عەقڵ و ئاوەزی زاڵبێ بەسەر هەست و سۆزیدا, یا بەرژەوەندی چاکەی خستبێتە پێش خراپەکانیەوە.. کە ئەوانەش زۆر کەمن.

بۆ ئەوەی لە هەموو روویەکەوە حەقی خۆی بدەینێ, چاکتر وایە لەم سێ لایەنەوە لێی بدوێین:

١ - زیانەکانی جگەرەکێشان.

٢ - حوکمی شەرع لەو بارەوە.

٣ - چۆن چارەسەری بکەین؟

**دەتوانین زیانەکانی جگەرەکێشان لەم دوو خاڵەدا دیاری بکەین:**

**یەکەم- زیانی تەندروستی و دەروونی جگەرەکێشان:**

بەشێوەیەك چەسپاوە کە بواری گفتوگۆی تێدا نەماوەتەوەو هیچ گومانیشی تێدا نیە, پزیشکە پسپۆڕەکانی بواری تەندروستی بڕیاریان لەسەرداوە کە جگەرە کێشان دەبێتە هۆی نەخۆشی سیل, سەرەتانی سیەکان, لاوازی بیروهۆش و زاکیرە, کەم بوونەوەی ئیشتیهاو ئارەزووی خواردن, زەردبوونی دەم و چاوو ددانەکان, هەناسە تەنگی, گرژی و ئالۆزی دەمارەکانی مێشك, تێك شکانی گشتی جەستە, تێکچوونی رەوشت, زاڵنەبوون بەسەر ویست و ئیرادەدا, راهاتن لەسەر تەمەڵی و تەوەزەلی..

**ئەوەش ئێوەو راپۆرتی پزیشکە پسپۆڕەکان لەبارەی زیانەکانی جگەرەکێشان و کاریگەری لەسەر تەندروستی:**

گۆڤاری(الشبیکل)ی ئەڵمانی نوسیوویەتی: لە ویلایەتی ماری لاندی ئەمریکا دە زانای پسپۆڕی ئەمریکی کۆبوونەوەیەکیان ئەنجامداو, لێکۆڵینەوەیەکیان کرد دەربارەی کاریگەری زیانەکانی جگەرە کێشان لەسەر تەندروستی تاکەکانی کۆمەڵ هەر هەموویان یەکدەنگ بوون لەسەر ئەم زیانانەی لای خوارەوە:

١ - رێژەی مردنی ئەو پیاوانەی جگەرە دەکێشن لە(٦٨)ی زیاترە لەو پیاوانەی کە جگەرە ناکێشن.

٢ - رێژەی مردن بەسەرەتانی سیەکان لەوانەی کە جگەرە دەکێشن لە(١٠،٨)ی زیاترە لەوانەی کە جگەرە ناکێشن, ئاوسان و هەوکردنی بۆری هەناسەدان(٦،١) ی زیاترە, نەخۆشیەکانی گەدە(٢،٤) ی زیاترە, نەخۆشیەکانی دڵ(١،٧) ی زیاترە, سەرەتانی قوڕگ (٥،٤) ی زیاترە, سەرەتانی سورێنچك (٣،٤) ی زیاترە..

٣- ڕێژەی تووشبوون بەنەخۆشیەکانی دڵ بەهۆی جگەرەکێشانەوە لە ویلایەتەکانی ئەمریکا لە(٧٠)یە کە زۆرجار دەبێتە هۆی مردنیان.. هەروەها توشبوون بەسەرەتانی سیەکان بەربڵاوترین نەخۆشیە بەهۆی جگەرە کێشانەوە..[١].

- کۆمەڵەی سوری بۆ بەرگریکردن و لەناوبردنی نەخۆشی سیل ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە بەکورتی ئەمە دەقەکەیەتی: بێگومان ساڵانێکە لێکۆڵینەوەی زانستی دەکرێت لەسەر جگەرە کێشان و چەسپاندوویانە و گەیشتوونەتە ئەم ئەنجامە: ئەو کەسانەی جگەرە دەکێشن زیاتر تووشی سیل و سەرەتان دەبن لەو کەسانەی کە جگەرە ناکێشن.. بێگومان جگەرە کێشان دەبێتە هۆی بەڵاو نەخۆشی بەردەوام بۆ سیەکان وەك: هەوکردنی بۆریەکانی هەناسەدان و , نەخۆشی ڕەبو هەڵاوسانی سیەکان.. وە مادەی نیکۆتین لێدانی دڵ زیاد دەکات و دەبێتە هۆی نەخۆشی بۆریەکانی خوێن.. باجەکەشی کە ئەیدەن فەوتانی ڕۆحی خۆیانە, ئاگداربە لە زیانەکانی جگەرەکێشان, پێویستە خۆتی لێ بەدووربگری بۆ ئەوەی جەستەت ساغ و سەلامەت و چالاك بێت [٢].

**دووەم- زیانی ماڵی جگەرەکێشان:**

بەدڵنیاییەوە خاوەنی ڕۆژانەی دیاریکراو لە سامان چارەکێك یان زیاتر لە ڕۆژانەکەی خەرج دەکات, کە ئەوەش ماڵ وێرانیە, سامان بەفیڕۆدانە, تێکچونی شیرازەی خێزانە.. چونکە جگەرەکێشی بەردەوام لە بژێوی و قوتی خۆی و خانەوادەکەی دەبڕێت بۆ کڕینی جگەرە, هەندێ جاریش بۆ دابین کردنی جگەرە لەڕێی ڕاست لادەدات و دەسدەکا بە بەرتیل وەرگرتن و دزیکردن..

دەی ئیتر ئایا زیان لەو زیانە گەورەترو خراپتر هەیە بۆسەر تەندروستی و ڕەوشت و کۆمەڵگە ؟! بەڵام بەداخەوە زۆربەی خەڵك ئەو ڕاستیە نازانن!!

**٢- حوکمی شەرع لەبارەی جگەرەکێشانەوە:**

أ- ئەوەی شەرعزان و پێشەوا فیقهیەکان یەکدەنگن لەسەری ئەوەیە هەر شتێك

---

[1] - گۆڤاری شارستانی لاپەڕە ١٥٨ی ژمارە ٣-٤ ی ساڵی دووەم.

[2] - هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٥ -١٦ی لەژێر ناونیشانی( کۆمەکی بکەن بۆ لەناوبردنی نەخۆشی سیل) .

زیانی هەبێت و ببێتە هۆی تیاچوون.. دوورکەوتنەوە لێی واجبەو کردنیشی حەرامە, بەبەڵگەی ئەم فەرمودەیە:

* ئەبو سەعیدی خودری رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (**لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ**)[1]. واتە: با کەس زیان لە خۆی نەدات و زیانیش بە کەسی تر نەگەیەنێت.

بەگشتی ئەم ئایەتە: ﴿**وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ..**﴾. **البقرة١٩٥**. واتە: بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تیاچوونەوە..

هەروەها ئەم ئایەتەش: ﴿**وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً**﴾. **النساء٢٩**. واتە: خۆتان مەکوژن, بەراستی خودا میهرەبانە بۆتان..

بە ئیعتیباری ئەوەی چەسپاوە کە جگەرەکێشان زیان دەگەیەنێت بەتەندروستی و جەستەی مرۆڤ, کە پێشتر باسکرا کەواتە جگەرەکێشان حەرامەو, دوورکەوتنەوە لێی واجبە.

ب- جگەرەکێشان لای ئەوانەی خاوەنی بیرو هۆش و زەوقی سەلیمن دەکەوێتە ریزی ئەو شتانەی پیسن و زیان دەگەیەنن بە جەستە, وە دەبێتە هۆی بۆنی ناخۆشی ناو دەم, خوای پەروەردگار هەر شتێك پاکە حەلاڵی کردووە بۆ مرۆڤ, هەر شتێکیش پیسە حەرامی کردووە بۆ ئەوەی جەستەی پارێزراو بێ لە بەلاو نەخۆشی, رەوشت و بیروهۆشی سەلامەت بێ, لەناو کۆمەڵدا خۆشەویست بێ و بەجوانی دەرکەوێ..

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿**وَلاَ تَتَبَدَّلُواْ الْخَبِيثَ بِالطَّيِّبِ..**﴾. **النساء٢** . واتە: ماڵی پیس مەگۆڕنەوە بە ماڵی پاك..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ ..**﴾. **الأعراف١٥٧**. واتە: شتە خاوێن و پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات و, شتە پیسەکانیان لێ حەرام دەکات..

لەم ئایەتەشدا دەفەرموێت: ﴿**قُل لاَّ يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ**

[1]- رواه مالك: ١٢٣٤, وقال الشيخ الألباني صحيح, إبن ماجة: ٢٣٤٠, سلسلة الصحيحة: ٢٥٠.

**الْخَبِيثِ..﴾. المائدة١٠٠.** واته: ئەی پێغەمبەر! بڵێ: پیس و پاك وەك یەك نین, هەرچەندە زۆری پیسیەکە سەرسامت بکات..

ج- جگەرەکێشان ئەگەر زێدەڕەوی تێداکرا دەبێتە هۆی مەستی عەقڵ, شێوان و لاوازی جەستە, ئەمەش ئەوانەی بەردەوامن, یان ئەوانەی پێشتر کێشاویانە, یا ئێستا دەستیانکردووە بەکێشانی هەستی پێدەکەن.

هەر شتێك مرۆڤ مەست و سەرخۆش بکات پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قەدەغەیکردووە, وەك لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆ کردووە: **(نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كُلِّ مُسْكِرٍ وَمُفَتِّرٍ)**[1].

ئەم دەقانەی سەرەوە بەڵگەن لەسەر ئەوەی **کە جگەرەکێشان حەرامە**, کەواتە واجبە دوورکەوتنەوە لێی چونکە زیانی گیانی و ماڵی گەورەی هەیەو خراپی و پیسیەکەشی ئاشکرایە.. ئەمە جگە لەوەی کاریگەری خراپی هەیە لەسەر تاك و خێزان و کۆمەڵ, بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ماڵ بە فیڕۆدانی قەدەغەکردووە وەك لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆ کردووە: **(نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ إِضَاعَةِ الْمَالِ)**[2].

ئەو شەرعزانانەی کە پێشتر فەرمویانە: جگەرەکێشان شتێکی حەرام نیە یان کەراهەتی هەیە, ئەوە هەندێ بەهانەیان هەبووە چۆنکە ئەو کاتە زانستی پزیشکی زیانەکانی روون نەکردبووەوە, ئەوانیش لەسەر بنەمای ئەسڵی و بنەمای هەموو شتێك باشە ئەوەیان دەرهێناوەو وایان فەرمووە.. بەڵام دوای ئەوەی پسپۆرەکانی بواری زانستی پزیشکی زیانە جەستەیی و دەروونیەکانی روون کردەوەو سەلماندیان چەندە ترسناکە بۆ سەر تاك و کۆمەڵ ئیتر بواری ئەوەی تێدا نەماوە کەس گومانی هەبێ لە حەرامی جگەرەکێشان. خوا خۆی دەیزانێ.

---

[1] - رواه أحمد وأبو داود بسند صحيح عن أم سلمة, وقال الشيخ الألباني : ضعيف, سنن أبي داود برقم: ٣٦٨٦.

[2] - مُتَّفَقٌ عَلَيه: أخرجه البخاري ٤/٨ ( ٥٩٧٥ ) ، ومسلم ١٣٠/٥ ( ٥٩٣ ) ( ١٢ ) .

**٣ - چۆن چارەسەری بکەین؟**

بەپلەی یەکەم چارەسەری دیاردەی جگەرەکێشان دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت, بەوەی بانگەوازێکی بەرفراوان بکات لەدژی, لە کەناڵەکانی راگەیاندن و, رۆژنامەو گۆڤارەکان و, رادویۆ و تەلەفزیۆنەکانەوە, وە لە هەموو جێگایەك.. بەیارمەتی شارەزاو پسپۆران و خاوەن قەڵەم و رۆشنبیرەکان, بە بەردەوامی خەڵك و گەنج و لاوەکانی میللەت ئاگادار بکەنەوە لە مەترسی و زیانەکانی جگەرە کێشان, هەروەها لەسەر دەوڵەتە نرخی بەرزکاتەوەو باجی لەسەر زیاد بکا, وە لەشوێنە گشتی و قەرەباڵغەکاندا قەدەغەی بکات بەتەواوی.

گرتنەبەری ئەم رێگایەش قۆناغ بە قۆناغ دەبێت تادەگاتە ئەوەی لە داهاتوودا بەتەواوەتی قەدەغەدەکرێت, وەك ئەوەی ئێستا لە ئەمریکاو بەریتانیا پێی هەستاون.

پاشان پێویستە لەسەر ئەو بەتەمەنانەی بە بەردەوامی جگەرە دەکێشن و ئیدمان بوون لەسەری با لەخوا بترسن و بیکەنە چاودێر بەسەر خۆیانەوە, نزیکی شتە حەرامەکان نەکەونەوە بەتایبەتی جگەرەکێشان, بەئیرادەیەکی بەهێزو خۆراگریەوە هەوڵبدەن بۆ وازلێهێنانی بەیەکجاری, سەرکەون بەسەر نەفس و هەواو ئارەزووەکانیانداو بگەڕێنەوە ناو ژیانێکی ئارام و تەندروست. بەڵام ئەو منداڵانەی خوویان گرتووە بەو ئاکارە پیسەوە لەبەر بێئاگایی و چاودێری نەکردنیان لەلایەن بەخێوکەرو پەروەردەکارەکەیانەوە, فەرامۆشکردنی ئەو ئەرکە شتێکی ترسناکەو, زیان و خراپەیان گەورەتر دەبێت بۆ کۆمەڵ ئەگەر فەرامۆشیان بکەن.

ئیتر هیچ بوار نەماوەتەوە بۆ پەروەردەکاران باوکان و دایکان تەنها ئەوەندە نەبێت کە چاودێری کاروباری منداڵەکانیان بکەن, ئاگاداری هەڵسوکەوتیان بن, چارەسەری لادانەکانیان بکەن, تا دەیانگەێڕنەوە بۆسەر رێگای راست و ژیانی خۆشگوزەرانی.

ئەوەی دوو کەس جیاوازییان نیە لەسەری ئەوەیە ئەگەر منداڵ لەسەرەتای گەشەکردنی خونچەی ژیانیەوە راهات لەسەر جگەرە کێشان بێگومان پلە بەپلە دەڕوات بەرەو لادان و کاری لەوە گەورەترو خراپتر.. چونکە جگەرەکێشان بەریدی کرداری ناشیرین و نابەجێیە, رێگەی تاوان و کاری ناپەسەندە..

ئەی ئەوانەی خاوەن فام و بیروهۆشن ئاگادابن بیریٚ بکەنەوەو پەند وەرگرن!!. .

**٢ - دیاردەی ئاو هێنانەوە بەدەست:**

یەکێکە لەو دیاردانەی کە بڵاوبۆتەوە لەناو گەنج و لاوە تازە باڵغ بوەکاندا, هۆکاری سەرەکی بڵاوبوونەوەشی دەگەڕێتەوە بۆ بەرەڵایی و رووتی ئەو ئافرەتانەی خۆیان دەڕازێننەوەو, لە شەقام و بازارو شوێنە گشتیەکاندا بەلەنجەولار دەڕۆن و ئارەزووی جنسی دەوروژێنن..

بەڵام ئەوەی دەیبینن لەشاشەی سەتەلایت و تەلەفزیۆنەکانەوە خراپترو تاڵترە.. چی دەبینن؟ ئەوە دەبینن کە غەریزەی جنسی دەوروژێنیٚ و دەبێتە هۆی نەمانی شەرەف و پاکێتی و غیرەت و شەهامەت. .

بگرە ئەوەی لە گۆڤارو کتێبەکاندا دەیخوێننەوە لە چیرۆکی عەشق و دڵداری, ئارەزوو وروژێنەرەکان, خراپترین کایگەریان هەیە بۆسەر تەندروستی لاوەکان لەرووی دەروونی و عەقڵیٚ و ئاوەزو رەوشتەوە.. ئەو ئارەزوو وروژێنەرانە بەتەنها بەسن بۆ بردنی لاوەکان پلە بەپلە بەرەو زیناکردن, هەرزەکاری لاو ئەگەر خوای گەورەی بەچاودێر نەزانیٚ بەسەر خۆیەوە, ترسی خوای لەدڵدا نەبوو, گوێی نەدا بەسەرەنجامی کردەوە خراپەکانی ئەوە ئەو کاتە دەکەوێتە نێوان ئەم دووکارەوە کە سێیەمی نیە:

- یان ئەوەتا ئارزوو غەریزە جنسیەکەی لە حەرامدا تێر دەکات.
- یا ئەوەتا بەهێنانەوەی ئاوی خۆی غەریزە جنسیەکەی هێوردەکاتەوە.

ئەو دوو کارە ترسناکەش زیانی گەورەیان هەیە لەسەر جەستەو وەچەو ئاوەزو تەندروستی دەروونی..

بۆ ئەوەی نوسینەکەمان دەربارەی ئەو دیاردەیە گشتگیر بێت بەباشی دەزانین لەم سیٚ لایەنەوە لێی بدوێین:

١ - زیانەکانی ئاو هێنانەوە بەدەست.

٢ - حوکمی شەرع لەو بارەوە.

٣ - چۆن چارەسەری بکەین؟.

**١- زیانەکانی ئاو هێنانەوە بەدەست:**

**أ- زیانە جەستەییەکان:** لە ڕێگەی زانستی پزیشکیەوە چەسپاوە کە ئەو کەسەی بەردەوام بێت لەسەر ئەم خووە خراپە تووشی ئەم نەخۆشیانەی لای خوارەوە دەبێت:

ماندووبوون و کەم توناییی, لاوازی جەستە, لەرزۆکی پەلوپۆکان, ئاوسانی دڵ, کزی چاوو زاکیرە, پشێوی کۆئەندامی هەرس, هەوکردنی سیەکان کە هەندێ جار دەبێتە هۆی نەخۆشی سیل و, لە کۆتایدا کاردەکاتە سەر دەورەی خوێن و دەبێتە هۆی کەم خوێنی..

**ب- زیانە جنسیەکانی:**

یەکێك لە بەرچاوترین زیانەکانی نەخۆشی **پەککەوتنی کاری پێکەوە جووت بوونە,** مانای وایە ئەو لاوە توانای هاوسەرگیری نامێنێ, کە ئەوەش گومانی تێدا نیە دەبێتە هۆی هەڵاتنی ژن لە مێردەکەی, بەهەرحاڵ بەهۆی ئەنجامنەدانی کاری پێکەوە جووت بوونەوە پەیوەندیان بەردەوام نابێ.

یەکێکی تر لە زیانەکانی بێزار بوونی هەرێکێکیانە لەوی تر چونکە پیاوەکە بەهۆی ئەو خووە خراپەوە غەریزەی جنسی خۆی تێردەکات, ئەوەش مانای ئەوە دەگەیەنێ ژنەکە ناتونێت غەریزەی جنسی خۆی تێرکات لەو پیاوە نەخۆشە..لەوانەیە ئەو حاڵەتەیان ببێتە هۆی ڕوودانی تەڵاق و لێك جیابوونەوە, یان ئەوەتا ژنەکە بەنهێنی بەدزی مێردەکەیەوە پەیوەندی لەگەڵ یەکێکی تر دەبەستێ و غەریزەی جنسی خۆی لەگەڵ تێردەکات.

**ج- زیانە دەروونی و عەقڵیەکانی:**

زانایانی دەروونناسی بڕیاریان داوە لەسەر ئەوە کە هەرکەسێك بەردەوام بێت لەسەر ئەم خووە خراپە تووشی چەندەها نەخۆشی ترسناکی دەروونی و ئاوەزی دەبێ, لەوانە:

وورپبوون و لەبیرچوونەوە, لاوازی ئیرادە, لاوازی زاکیرەو بیرو هۆش, دوورەپەرێزی و حەزکردن لە گۆشەگیری, خەجاڵەتی و هەست بەشوورەییکردن, هەستکردن بەترس و تەمەڵی, دەرکەوتنی بەغەمۆکی و دڵتەنگی, بیرکردنەوە لە تاوانکردن و خۆکوشتن.. چەندەها زیانی تر کە دەبنە هۆی پەککەوتنی بیرکردنەوە, شێواوی ئیرادە, نەهێشتنی

کەسێتی, بێگومان پسپۆرەکان بەتێرو تەسەلی لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەم دیاردەیەکردووە..

**٢- حوکمی شەرع لەو بارەوە:**

ئەنجامدانی ئەو کارە حەرامەو تاوانێکی خراپە, بەپێی ئەم بەڵگانەی لای خوارەوە:

أ- خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ* إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ* فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ﴾. المؤمنون ٥-٧.** واتە: ئەوانەی کە داوێن و شەرمی خۆیان دەپارێزن, مەگەر بۆ خێزانی خۆیان یان بۆ کەنیزەکێك کە بووبن بەخاوەنیان, ئەوە بەراستی ئەوانە سەرزەنشت ناکرێن. هەر کەسێ جیا لە مانەی بویٚ ئەو لەئەندازە لادەرە.

بەگشتی ئەم ئایەتە: **﴿فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ﴾ المؤمنون ٧.** ئەوە دەگەیەنێت کە خاڵی کردنەوەیەکی غەریزەی جنسی جگە لەرێگەی هاوسەرگیری شەرعی و کەنیزەك, جا ئیتر زینا بێت, یان نێربازی, یا دەستپەڕ حەرامەو تاوانێکی پیس و خراپە..

لە عەتاوە کە یەکێك بووە لە هەوالانی ئیبن عەبباس ڕەزای خوایان لێ دەگێڕنەوە کە گوتویەتی: بیستومە گەلێك حەشردەکرێن دەستیان حامیلەیە, وا گومان دەبەم ئەوانە ئەو کەسانەبن ئاوی خۆیانیان بەدەست هێناوەتەوە.

سەعیدی کوڕی جوبەیر کە یەکێك بووە لە (تابعین) شوێنکەوتوانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گوتویەتی: خوای گەورە سزای گەلێك دەدات لەسەر ئەوەی گاڵتەو یارییان لەگەڵ چوکی خۆیان کردووە.

هەروەها لەم فەرمودەیەدا هاتووە: (حەوت کۆمەڵ خوای گەورە سەیریان ناکات لە ڕۆژی قیامەتدا.. یەکێکیان ئەوەیە کە دەستی خۆی مارە کردبێ واتە ئاوی خۆی بەدەستی هێنابێتەوە)[1]. ئەم دەقانەی سەرەوە بەگشتی دەریدەخەن کە ئەنجامدانی ئەو کارە حەرامە.

[1] - سلسلة الضعيفة: ٤٩٠/١ برقم ٣١٩..

ب- هەروەك پێشتر لە باسی حوکمی شەرع لە بارەی جگەرە کێشانەوە وتمان: هەرشتێك ببێتە هۆی زیان و تیاچوون.. ئەوە دوورکەوتنەوە لێی واجبە, کردنیشی حەرامە بەگشتی ئەم فەرمودەیە: **(لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ)** [1] . واتە: با کەس زیان لە خۆی نەدات و زیانیش بە کەسی تر نەگەیەنێت. وە بەگشتی ئەم ئایەتە: **﴿وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ..﴾. البقرة١٩٥**. واتە: بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تیاچوونەوە..

بێگومان ئەنجامدانی ئاو هێنانەوە بەدەست زیانی جەستەیی و جنسی و دەروونی و ئاوەزی هەیە.. کەواتە حەرامە بە بەڵگەی ئەم فەرمودەیە: **(لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ)**.هەروەها بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: **﴿وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ..﴾**.

**پرسیارێکی گرنگ:**

ئەگەر ئاو هێنانەوە بەدەست حەرام بێت, ئەی رای شەرع چیە دەربارەی کەسێك چاری نەماو غەریزەی جنسی زاڵ بوو بەسەریداو خەریك بوو بکەوێتە داوی زیناکردنەوە؟

گوماتنی تێدا نیە ئەگەر مرۆڤ کەوتە نێوان دوو کای خراپەوە دەبێت ئەوەیان هەڵبژێرێت ئاسانترەو کەمترین زیان و خراپەی هەیە, بە بەڵگەی ئەم بنەما شەرعیە کە دەڵێت: (هەڵبژاردنی ئەوەیان ئاسانترەو کەمترین زیان و خراپەی هەیە).

شتێکی ئاشکرایە ئاو هێنانەوە بەدەست خراپەو تاوانە, بەڵام زیناکردن و نێربازی خراپترن چونکە دەبنە هۆی رووخانی کیان و بوونی گشتی, نەهێشتنی شەرەف و پاکێتی.. جگە لەوەش دەبێنە هۆی تێکەڵاوی نەوەو وەچەکان و, ئاژاوەو دووبەرەکی و خوێن رشتن.. کەواتە لەو حاڵەتەدا هەڵبژاردنی ئاو هێنانەوە بەدەست ئاسانترەو کەمترین زیان و خراپەی هەیە.

شەرعزانەکان فەرمویانە: ئاو هێنانەوە بەدەست حەرامە ئەگەر خرۆشانی غەریزەی جنسی هێور بوو, بتوانرێت دەستی بەسەردا بگیرێت, بەڵام ئەگەر سەرکەوت بەسەر بیروهۆشداو سەرقاڵی کرد, وەسوەسەی بۆ دروستبوو بردی بەرەو زیناکردن و کاری

[1] - رواه مالك: ١٢٣٤, وقال الشيخ الألباني صحيح, إبن ماجة:٢٣٤٠, سلسلة الصحيحة: ٢٥٠.

بەدرەوشتی, ئەوە ئەو کاتە ئاو هێنانەوە بەدەست ڕێگەچارەیەك دەبێت بۆ دامرکانەوەو هێور بوونەوەی, خاوەنەکەی سەربەسەر دەردەچێ نەچاکەی بۆ دەنوسرێ نەخراپە, نەپاداشت وەردەگرێ لەسەری و نەسزاش دەدرێ[1].

**٣- چۆن چارەسەری بکەین؟:**

**چارەسەری سەرکەوتوو بۆ بنەبڕکردنی ئەم دیاردەیە بەم هۆکارانەی لای خوارەوە دەکرێ:**

**١- ژن هێنان لەسەرەتای لاویەوە:**

چونکە چاکترین هۆکارێکی سودبەخشە بۆ لە بنەبڕکردنی ئەم دیاردە کوشندەیە, بەڵکو تاکە ڕێگایە بۆ خاڵی کردنەوەی ئارەزووی جنسی, جگە لەوەش چەندەها سودی ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و تەندروستی و دەروونی هەیە لێرەدا بوار نیە لێییان بدوێین.

**٢- ڕۆژووی سوننەت:**

ئەگەر بارودۆخی ناچاری ڕێگەی نەدا بە زوو ژن هێنان.. ئەوە ئیسلام ڕێنمایی ئەو کەسانە دەکات کە توانای ژن هێنانیان نیە ڕۆژووی سوننەت بگرن.. چونکە ڕۆژووی سوننەت دەبێتە هۆی هێوربوونەوەی ئارەزووە سەرکەش و لەوزە دەرچووەکان, هەروەها دەبێتە هۆی بەهێزی چاودێری خوایی و ترسان لێی.. ئەو ڕێنماییانەش لەم فەرمودەیەدا هاتووە: (**يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ**)[2] واتە: ئەی کۆمەڵی گەنج و لاوان! هەر کەسێك لە ئێوە ئەگەر پارەو سامان و پێداویستیەکانی ژن هێنان و توانای جنسی هەیە با ژن بیهێنێ, چونکە باشترین پارێزەرە بۆ چاو داخستن و داوێن پاکی, هەر کەسێکیش توانای ژن هێنانی نەبوو با ڕۆژوو بگرێ, چونکە ڕۆژوو بۆی قەڵغانەو دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئارەزووەکانی و لە خراپە دەیپارێزێ.

ئەو ڕۆژووە سوننەتانەی کە شەرع هانی خەڵکی داوە بۆ گرتنیان زۆرن.. لەوانە:

---

1- من كتاب(ردود على أباطيل) للعلامة الشيخ محمد حامد ص٤٢.

2- البخاري: ١٩٠٥\٤ , ومسلم: ١٠١٨/٢ - ١٤٠٠ .

رۆژووی داود پێغەمبەر سلاوی خوای لەسەر بێ کە رۆژی نارۆژێك بە رۆژوو دەبوو, رۆژووی دووشەمان و پێنج شەممان, شەش رۆژووی مانگی شەوال لە دوای مانگی رەمەزان, رۆژووی (عاشورا).. رۆژوو بۆ هێورکردنەوەی ئارەزوو وەك لەم فەرمودەیەدا هاتووە: (..**وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ**).

**٣- دووركەوتنەوە لە وروژێنەرە جنسیەکان:**

ئەوەی دوو کەس رایان لەسەری جیاواز نیە ئەوەیە ئەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژین پڕبووە لە تاوان و بێسەروبەرەیی و هەڵوەشاوەیی و بەرەڵایی.. گومانی تێدا نیە ئەگەر گەنج کەوتە دوای خراپەو ئارەزوو وروژێنەرەکان, ئەو کاتە کاریگەری خراپیان دەبێت بۆسەر رەوشت و ئاکارە بەرزرکانی و وەك ئاژەڵی بەرەڵای لێدێ.

دەی ئیتر هیچ نەماوەتەوە بۆ بەخێوکەرو پەروەردەکاران تەنها ئەوە نەبێت هەستن بەدەوری ئامۆژگاری و, واجبی ئاگادارکردنەوەو هۆشیارکردنەوەی ئەو کەسانەی ئەرکی پەروەردە و ئاراستەیان لە گەردنیانایە, بە ئەسپایی بچپێنن بە گوێیاندا کە چەندە ناپەسەندو تاوانە تەماشاکردنی ئافرەتانی رووت و بەرەڵا.. یان خوێندنەوەی چیرۆك و بەسەرهاتی عەشق و دلداری, یا خوێندنەوەی ئەو گۆڤارە رووت و بەدرەوشتیانەی کە بازرگانانی شەرەف و ناموس و بەدرەوشتی برەوو رەواجی پێدەدەن, هەروەها گوێگرتن بۆ ئەو گۆرانیە ناشەرعیانەی لە هەموو شوێنەکاندا لیدەدرێن و پەخش دەکرێن..

ئەمانە هەموویان دەبنە هۆی نەمانی غیرەت و کەرامەت, پیس بوونی شەرەف, بەدرەوشتی, لاوازی جەستە, تێنەگەیشتن, کزی زاکیرەو بیروهۆش, جولاندنی غەریزەی جنسی, لە دەستدانی کەسێتی و, لە گۆڕانی پیاوەتی و رێزو رەوشت!!.. بەڵکو گەنجەکانمان لەم ئامۆژگاریانە پەند وەرگرن و, حسابێك بکەن بۆ دەرنجامەکانی.. لەدوای ئەم ئاگاداکردنەوەو بیرخستنەوانە هیچیان دەست ناکەوێت تەنها ئەوە نەبێت پارێزگاری بکەن لە هاوسەنگی ئیرادەو راستکردنەوەو رێکخستنی دەروونی و رەوشتی و تەندروستی عەقلی و جەستەیی.. ئەو کاتە بەوانە دەچنە ریزی پیاوچاکە پاکەکان و, باوەڕدارە چاکەکان.

**٤ - پڕکردنەوەی کاتی بەتاڵی بەکارێکی بەسود:**

زانایانی بواری پەروەردەو دەروون بڕیاریان لەسەر ئەوەداوە ئەگەر منداڵ سەرقاڵ نەکرێت بەکارێکەوە, ئەوا بیروهۆشی دەڕوات بۆ لای حەزو ئارەزووە سەرکەشەکانی, کاریگەری لێ دەکەن و دەکەوێتە بەر لێشاویان.. ئەو کاتە هیچ شتێك نیە پەنای پێ بەرێت تەنها ئەوە نەبێت بەو دیاردە ناشیرینە خۆی رزگارکات لە هەڵچوونی ئارەزووی.. کەواتە ئەی چارەسەری چیە بۆ رزگار بوون لەو بەتاڵی و ئەندێشەو خەیاڵاتانە, تا نەکەوێتە ناو ئەو ئاکامە ترسناك و پڕ لە ئێش و ئازارەوە..؟

**چارەسەر:**

دەبێت هەرزەکاری لاو بزانێت چۆن کات بەسەر دەبات, کاتی بەتاڵی بەچی پڕبکاتەوە؟ زۆرن ئەو بوارانەی کاتیان تێدا بەسەر ببرێ و, بەتاڵیان پێ پڕبکرێتەوە!!..

وەرزشی بەدەنی بۆ بەهێزی جەستەی, گەشتوگوزار لەگەڵ هاوەڵی چاك و ئەمیندار بۆ مورتاح کردنی رۆحی, خوێندنەوەی بەسود بۆ کامل بوونی زانستی, ئیشی دەستی بۆ گەشەپێدانی حەزەکانی, ئامادەبوون لەوانە ئایینی و ئاراستەییەکان بۆ پاککردنەوەی رەوشتی, وەرزش و یاری رۆشنبیری بۆ راهێنانی عەقڵی, مەشقکردن لەسەر تیرهاوێژی و رەمی و کەرەسەکانی جەنگ بۆ ئامادەکردنی نەفسی.. جگە لەم بوارانەش هەر شتێکی بەسوود  کە ببێتە هۆی خۆراکی بیرو هۆش و, پاککردنەوەی رۆح و, بەهێزی جەستەو, رەوشت بەرزی!!..

**٥ - تێکەڵاوی هاوڕێی باش:**

ئەوەی گرنگە پەروەردەکار سوربێت لەسەری بەرامبەر بە لاوی هەرزەکار ئەوەیە دەبێت هاوەڵانی باش و ئەمینی بۆ هەڵبژێرێ, بۆ ئەوەی کاتێك لەبیری چووەوە یادی بخەنەوە, ئەگەر لایدا بیهیننەوە سەر رێگای راست, یارمەتی بدەن لەسەر کردەوەی چاکە, ئەگەر بەڵاو کارەسات رووی تێکرد دەستی بگرن و رزگاری بکەن!!..

وەك دەڵێن: ئەو جۆرە هاوەڵانە زۆر کەمن, بەتایبەتی لەم رۆژگارەدا دۆستی چك و دڵسۆزو هاوڕێی باوەڕدار زۆر دەگمەنە.. بەڵێ زۆر کەمن بەڵام ئەو کەمانە لە هەموو شوێنێك هەر دەستدەکەون و بەناوچاوانیانەوە دەدۆزرێنەوە کە سیمایەکی

جوانیان هەیە چونکە سەجدەی زۆر یان بۆ خوا بردووە, جیادەکرێنەوە بە رەوشتی بەرزیان و ئەو بەرنامە راستەی کە لەسەری دەڕۆن.. چەند شایستەو جێگەی خۆیەتی لاوەکان بگەڕێن بەدوایاندا, تا ببنە یارمەتی دەریان, جێگەی بڕواو متمانەیان بن لە هەموو کات و ساتێکدا.. پێکەوە بژین لەسەر رەوشتی بەرزو جوان.

گومانی تێدا نیە پیاو لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی, دۆست و هاوڕێکەی پێشەنگیەتی, راستی فەرمووە پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێت: * پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(المرء عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ)**[1]. واتە: پیاو لەسەر ئایینی هاوەڵ و برادەرەکەیەتی, هەر کەسێك لە ئێوە باسەیر بکات لەگەڵ کێ هاوڕێیەتی دەکات.

وەك ئاشکرایە بەدڵنیاییەوە ئەو کەسەی هاوڕێیەتی خەڵکی خراپ و گوناحکار بکات, پێشەنگی نابن تەنها لە لادان و سەرلێشێواویدا نەبێ, نایبەن بەرەو هیچ لایەك تەنها بەرەو گومڕایی نەبێ, لەبەر بەرژەوندی خۆیان هاوەڵی دەکەن و بۆ مەبەستی دنیایی بەکاری دەهێنن!!..

گەنج و لاوەکانمان دەبێت هۆشیاربن و خۆیان بپارێزن لە تێکەڵاوی هاوەڵی خراپ و گوناحکار.. ئەگەر دەیانەوێت ئیمانیان پتەوو جێگیر بێت, رەوشتیان بەرز بێت, جەستەیان سەلامەت و بەهێز بێت.. باسوربن لەسەر هاوڕێیەتی برادەری باش و, کۆمەڵی باوەڕدار, بۆ بەدیهێنانی بەختەوەری لە دنیاو قیامەتدا, لە دنیادا خاوەن رێزو کەرامەت بن, لە دوارۆژدا سەرفرازبن, خوای گەورە راستی فەرمووە لە قورئانەکەیدا کە دەفەرموێت: ﴿**الْأَخِلَّاء يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ**﴾. **الزخرف٦٧**. واتە: دۆست و خۆشەویستەکان لەو رۆژەدا دوژمنی یەکترن جگە لە پارێزکاران.

**٦- دەسگرتن بە رێنوومايیە تەندروستیەکانەوە:**

پەندو ئامۆژگاری زانایانی بواری تەندروستی و پزیشکی لە بارەی هێورکردنەوەی ئارزوو غەریزە جنسیەکانەوە ئەمانەی لای خوارەوەیە:

---

[1]- حسن أخرجه أبو داود ( ٤٨٣٣ ) ، والترمذي ( ٢٣٧٨ ).

- خۆشتنی زۆر بەئاوی سارد بەتایبەتی لە وەرزی هاویندا, وە لە هەموو وەرزەکانی تردا ئاوی سارد بکرێت بەئامێری زاوزێدا.

- وەرزش و یاریکردنی زۆرو, راهێنانی جەستەیی.

- دوورکەوتنەوە لە خواردنی بەهارات و ئەو شتانەی کە تونن چونکە ئەوانە وروژێنەری ئارەزوون.

- کەمکردنەوەی خواردنی ئەو شتانەی دەبنە هۆی وریاکردنەوەی مێشك وەك چاو قاوە.

- کەمخواردنی گۆشتی سورو هێلکە.

- نەخەوتن لەسەر سك و پشت, بەڵکو خەوتن دەبێ لەسەر لای راست و روو بەقیبلە بێ کە ئەوەش سوننەتە.

**٧ - هەستکردن بەترس و لەرز لە خوای پەروەردگار:**

ئەگەر گەنج لە قوڵایی ویژدانیەوە هەستیکرد کە خوای گەورە دەیبینێ و چاودێرە بەسەریەوە, ئاگاداری نهێنی و شاراوەکانیەتی, ئاگادارە بەپرتەی چاوی و ئەوەی لە سنگیدا شاراوەیە.. لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات لەسەر زێدەرەوی و کەموکورتیەکانی, تۆڵەی لێ دەسێنێ ئەگەر لایدا لەرێی راست.. ئیتر گومانی تێدا نیە وازدەهێنێت لە کردەوە ناشیرین و لەناوبەرەکان, خۆی دەگرێتەوە لە تاوان و بەدرەوشتی.

وەك ئاشکرایە بەدڵنیایەوە ئامادەبوون لە کۆڕی زانیاری و یادی خوا, بەردەوامبوون لەسەر نوێژە فەرزو سوننەتەکان, خوێندنەوەی قورئان, شەونوێژکردن, رۆژوگرتنی بەردەوام, گوێگرتن و خوێندنەوەی بەسەرهاتی هاوەڵان و پیاچاکان, تێکەڵاوی برادەری باش, پەیوەندیکردن بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە, یادی مردن و رووداوەکانی دوای مردن.. ئەمانە هەر هەموویان لایەنی ترسان لە خوا, چاودێری خوایی, هەستکردن بەگەورەیی و دەسەڵاتی بەهێزو جێگیردەکەن لە دڵی باوەڕداردا.

چەند بەجێیە گەنجی باوەڕدار ئەم هۆکارانە بگرێتەبەر بۆ بەهێزکردنی عەقیدەو بیروباوەڕی و, چاودێری خوایی بەسەریەوەو, ترسان لێی.. تاکو بەرەڵاییە فریودەرەکان رای نەکێشن بەلای خۆیاندا, خۆشی و جوانی کاتی و بڕاوەی ژیانی دنیا هەڵی

نەخەڵەتێنێ، نەکەوێتە ناو حەرام و قەدەغەکراوەکانەوە، هەمیشە ئەم ئایەتەی خوای بەرزو بالا بخاتە پێش چاوی خۆی: ﴿**فَأَمَّا مَن طَغَى* وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا* فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى* وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى* فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى**﴾. **النازعات٣٧–٤١.** واتە: ئەو کەسەی سەرکەش بێت، ژیانی دنیای هەڵبژاردبێ، ئەوە بێگومان دۆزەخ جێگایەتی، ئەو کەسەی ترسابێت لە هەڵوێستگەی بەردەم پەروەردگاری و، بەرگری نەفسی خۆی کردبێت لە ئارەزووی خراپە، ئەوە بێگومان بەهەشت جێگایەتی.

**٣- دیاردەی مادە سەرخۆشکەرو سڕکەرەکان:**

ئەمەش دیاردەیەکی ترسناك و بەئازارە دەبینن بڵاوبۆتەوە لەناو ئەو ژینگانەی هیچ بایەخ و نرخێك بۆ ڕەوشتی بەرز دانانێن، هەروەها ڕێزو حورمەتی پەروەردەی ئیسلامی ناگرن..

**ئەم دیاردەیە** زیاتر لەناو منداڵانی پەرتەوازەدا دەبینرێت ئەوانەی سەرپەرشتی و پەروەردەو ئاراستەکردنیان لەدەستداوە لەلایەن بەخێوکەرەکەیانەوە، هەروەها لەناو ئەو منداڵانەی لەسەر ڕێگای خراپەکاری و لادان دەڕۆن لەبەر بێ ئاگایی و چاودێری نەکردنیان لەلایەن باوك و دایکیانەوە.. تێکەڵاوی هاوەڵی خراپ و یاخی و سەرپێچیکەر دەکەن، لەوانەوە هەموو خراپەو بەدڕەوشتیەك وەردەگرن.

بۆ ئەوەی ئەم دیاردەیە حەقی خۆی بدەینێ، چاکتر وایە لەم سێ لایەنەوە لێی بدوێین:

١- زیانەکانی مادە سەرخۆشکەرو سڕکەرەکان.

٢- حوکمی ئیسلام لەو بارەوە.

٣- چارەسەری سەرکەوتوو بۆ لە ڕیشە دەرهێنان و دەست بەسەراگرتنی.

١- زیانەکانی مادە سەرخۆشکەرو سڕکەرەکان بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

**أ- زیانەکانی تەندروستی و عەقڵی:**

ئەوەی زانایانی تەندروستی و پزیشکەکان یەکدەنگن لەسەری ئەوەیە خواردنەوەی مادە سڕکەرو سەرخۆشکەرەکان دەبنە هۆی شێتی، لاوازی زاکیرە، توشبوون

بەنەخۆشیەکانی دەمارگیری و گەدەو ریخۆڵەکان, ئیفلیجی بیرکردنەوە, ئازاری کۆئەندامی هەرس, نەمانی ئارەزوو ئیشتیهای خواردن, بەدخۆراکی, وڕێنەکردن, ئازاری جومگەکان, لاوازی جنسی و, گرژبوونی شانەکان و بۆریەکانی خوێن.. چەندەها نەخۆشی ترسناکی تر, ئەوندە بەسە بیزانین دەربارەی زیانەکانی ئەم دیاردەیە کە پەیمانگای سەرژمێری قەومی لە فەرەنسا ئەم بڕیارەی دەرکردووەو دەڵێ: (بێگومان مادە سڕکەرو سەرخۆشکەرەکان زیاتر فەرەنسیەکان دەکوژن تاکو نەخۆشی سیل, لەساڵی (١٩٥٥)دا حەڤدە هەزار کەس لە فەرەنسیەکان بەهۆی کاریگەری مەی و ئارەق خواردنەوە مردون, لە کاتێکدا هەر لەو ساڵەدا تەنها دە هەزار کەس بەهۆی نەخۆشی سیلەوە گیانیان سپاردووە).

**ب- زیانەکانی ئابوری:** شتێکی ئاشکرایە خواردنی ماددە سڕکەرو سەرخۆشکەرەکان دەبێتە هۆی خەرجکردنی سامان بەسوك و ئاسانی و بەبێ حساب و لێپرسینەوە.. شتێکی شاراوە نیە ئەو ماڵ و سامان بەفیڕۆدانە دەبێتە هۆی ماڵ وێرانی و, دەستکورتی و هەژاری.. ئەمە جگە لەوەی دەبێتە هۆی کەمی داهات, ئیفلیجی ئابوری, دواکەوتن لە بوارەکانی ژیاری و شارستانیدا.. خواردنی ماددە سڕکەرو سەرخۆشکەرەکان لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی توشبوون بە نەخۆشیە جەستەیی و دەروونیەکان و وڕێنەکردن.

رۆژنامەی ئەهرامی میصری لە رۆژی ١٩٦٥/٥/٣دا نووسیویەتی: (٧٢) ملیۆن ئەمریکی مەی و ئارەق دەخۆنەوە, (٢٠) ملیۆن لەوانە ساڵانە دوو بلیۆن دۆلار دەخەنە ئەستۆی دەوڵەت بەهۆی دەوام نەکردنیان لەسەر کارەکانیان..

**ج- زیانەکانی دەروونی و رەوشتی و کۆمەڵایەتی:**

ئەوانەی بەردەوامن لەسەر خواردنی ماددە سڕکەرو سەرخۆشکەرەکان لەناو خەڵکدا بەخراپی رەوشتیان دەناسرێن, رادێن لەسەر خووە ناشیرینەکانی وەك درۆکردن, ترسنۆکی, گاڵتەکردن بە رەوشتە راست و دروست و بەرزەکان.. پەلکێشکردنیان بۆ ئەنجامدانی تاوان و دزی و بێ ئابڕوویی, دەستدرێژیکردنە سەر نەفس.. تووشی بەدرەوشتی و هەڵوەشانەوەی ئیرادەو لاوازی هەستکردن بە ئەرکەکانیان دێن.. ئەمە

جگە لەوەی زۆربەی کاتیان بەنهێنی لەگەڵ ئەو بەدرەوشت و بەرەڵانەدا بەسەر دەبەن, هەروەها لەگەڵ هاوڕێکانیاندا هەتکی هەرچی ڕێزو حورمەتە دەیکەن!!.

وەك ئاشکرایە دەوڵەتە داگیرکەرەکان برەو دەدەن بەمادە سەرخۆشکەرەکان وەك چەکێکی کوشندە بەکاریدەهێنن بۆ شکاندنی هێزو دەسەڵاتی گەلان, لەناوبردنی رەوشتیان, کوژاندنەوەی رۆحی تێکۆشان و بەرگریکردن.. میصر یەکێکە لەو دەوڵەتانەی کە تائێستاش دەناڵێنێ بەدەست جەنگی مادە سەرخۆشکەرەکانەوە کە دەوڵەتی بەریتانیا برەوی پێدا لەکاتی داگیرکردنیدا پێش چارەکە سەدەیەك لەمەوبەر, هەروەها دەوڵەتی ئینگلتەرا جەنگی بەرپاکرد لە دژی دەوڵەتی صین و بازرگانی تلیاکی قەدەغەکردو ناوی نا چەنگی تلیاك.

**٢- حوکمی ئیسلام لەو بارەوە:**

حوکمی ئیسلام لە بارەی خواردنی مادە سڕکەرو سەرخۆشکەرەکان بەیەکدەنگی زانایان حەرامە بەپێی ئەم بەڵگانەی لای خوارەوە:

خوای گەورە دەربارەی حەرامی مەی و ئارەق دەفەرموێت: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ* إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ** ﴾. **المائدة-٩١**. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بیگومان بن کە ئارەق و قومارو ئەو بەردانەی کە کراون بەبت و, ئەو دارانەی (کە بەکاردەهێنرێن بۆ دیاریکردنی بەش و چارەنوس) ئەوانە پیسن و لە کردەوە ناشیرینەکانن, کەواتە دوورکەونەوە لێی تا رزگاربن, بێگومان شەیتان ئەوەی دەوێت کە دوژمنایەتی بخاتە ناوتانەوە بەهۆی ئارق و قومارەوە بەرگریتان بکات لە یادی خواو نوێژکردن, دەی ئایا ئێوە واز دەهێنن؟.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی حەرامی مەی و ئارق دەفەرموێت: (**لَعَنَ اللَّهُ الْخَمْرَ وَشَارِبَهَا وَسَاقِيَهَا وَبَائِعَهَا وَمُبْتَاعَهَا وَعَاصِرَهَا وَمُعْتَصِرَهَا**

وَحَامِلَهَا وَالْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ)[1]. واتە: خوای گەورە نەفرەتی کردووە لە مەی و ئارەق, نەفرەتی کردووە لەوەی مەی گێڕە, ئەوەی دەیفرۆشێت, ئەوەی دەیگوشێت و ئامادەی دەکا, ئەوەی بۆی دەگوشن, ئەوەی هەڵی دەگرێت و دەیگوێزێتەوە, ئەوەی بۆ دەگوێزنەوە.

بۆ حەرامی مادە سەرخۆشکەرەکان ئەوەندە بەڵگە زۆرە لە ژمارە نایەن, ئەوەش ئێوەو هەندێك لەو بەڵگانە:

أ- بە گشتی ئەم ئایەتە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿**وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ ..**﴾. **الأعراف:١٥٧**. واتە: شتە خاوێن و پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات و, شتە پیسەکانیان لێ حەرام دەکات..

هەروەها بەپێی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم: (**لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ**)[2]. واتە: با کەس زیان لە خۆی نەدات و زیانیش بە کەسی تر نەگەیەنێت.

ب- هەر شتێك مرۆڤ مەست و سەرخۆش بکات پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قەدەغەیکردووە وەك لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆ کردووە: (**نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كُلِّ مُسْكِرٍ وَمُفَتِّرٍ**)[3].

ج- یەکێکی تر لە بەڵگەکانی حەرام بوونی ئارەق ئەوەیە کە عەقڵ مەست دەکات و لە سروشت و دەسەڵات و ئیدراکی خۆی دەریدەکات, عومەری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لێ بێ لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هاواری کردو فەرموی: (**وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ..**)[4]. واتە: ئارەق ئەوەیە عەقڵ مەست دەکات. ئیتر ئەو وشەیە هیچ پرسیارێکی نەهێشتۆتەوە بۆ ئەوانەی گومانیان هەیە, کەواتە

---

[1] - صحيح رواه أبو داود: ٦٩/١٠ برقم ٣١٨٩, وابن ماجه, المشكاة: ٢٧٧٧/٢.

[2] - رواه مالك: ١٢٣٤, وقال الشيخ الألباني صحيح, إبن ماجة:٢٣٤٠, سلسلة الصحيحة: ٢٥٠.

[3] - رواه أحمد وأبو داود بسند صحيح عن أم سلمة, وقال الشيخ الألباني : ضعيف, سنن أبي داود برقم: ٣٦٨٦.

[4] - صحيح رواه البخاري: ٥١٥٣ ومسلم: ٥٦٣٠, المشكاة: ٣٦٣٥/٢.

هەرشتێك بێتە هۆی مەستی عەقڵ و لە سروشتی جیاوازی خۆی دەریکات ئەوە ئارەق و مادەی سەرخۆشکەرەو حەرامە تا رۆژی قیامەت.

بەهەمان شێوە ئەو مادانەی کە ناسراون بەناوی مادە سڕکەرەکان و تلیاك و حەشیشەو کۆکاین هەر ناوێکی تری لەو شێوە, ئەگەر کاریگەری زۆریان کردە سەر عەقڵ, دوور بەنزیك ببینێ و نزیکیش بەدوور, بیخاتە ناو دەریای خەوو خەیاڵات تا خۆی و ئایین و دنیای بیرچێتەوە, هەمان حوکمیان هەیە.

لە ئیمام قەرافی و ئیبن تەیمیەوە دەگێڕنەوە کە گوتویانە: **زانایان یەکدەنگن لەسەر حەرامی حەشیشە**. ئیبن تەیمیە دەڵێت: ئەوەی حەڵاڵی بکات کافرە.

ئەو لایەنەی ماوەتەوە هەندێ کەس پرسیاردەکەن دەربارەی ئەوەیە بەکارهێنانیەتی وەك دەرمان.. وەڵامەکەی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەڵامی داوەتەوە:

* تاریقی کوڕی سوەید پرسیاریکرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی دروستکردنی مەی, ڕێگری لێکرد, گوتی بۆ دەرمان و چارەسەری بەکاری دەهێنین, فەرموی: (**إِنَّهُ لَيْسَ بِدوَاءٍ ولَكِنَّهُ داءٌ**)[1]. واتە: بێگومان ئەوە دەرمان و چارەسەری نیە, بەڵکو ئەوە دەردو نەخۆشیە.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (**إِنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ الدَّاءَ وَالدَّوَاءَ وَجَعَلَ لِكُلِّ دَاءٍ دوَاءً فَتَدَاووْا ولَا تَدَاوَوْا بِحَرَامٍ**)[2]. واتە: خوای پەروەردگار دەردی داناوەو دەرمان و چارەسەریشی بۆ داناوە, هیچ دەردێکی دانەناوە تا دەرمان و چارەسەری بۆ دانەنابێت, ئەی بەندەکانی خوا تەداوی خۆتان بکەن, بەڵام بەحەرام تەداوی خۆتان مەکەن.

ئیبن مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ لەو بارەوە فەرمویەتی: (**إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَجْعَلْ**

---

[1]- صحيح رواه مسلم: ٣٦٧٠, المشكاة: ٣٦٤٢/٢.

[2]- رواه أبي داود عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ: ٣٧١/١٠ برقم: ٣٣٧٦, قال الألباني ضعيف في سنن أبي داود: ٧/٤ برقم: ٣٨٧٤.

**شِفَاءَكُمْ فِيمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ**[1]. واتە: خوای پەروەردگار شیفاو چارەسەری هیچ دەردێکی دانەناوە لەو شتانەدا کە حەرامە لەسەرتان.

ئەم دەقانەی سەرەوە هەموویان بەڵگەیەکی بڕاوەن لەسەر حەرامی بەکارهێنانی مەی بەتەنها وەك دەرمان ئەو کەسەی بەکاری بهێنێت ئەوە گوناهبارە.

بەڵام ئەگەر بەرێژەیەکی کەم هەندێکی تێکەڵاوی کحول بکرێ بۆ حاڵەتی زەروری بۆ نمونە وەك پاراستنی لە خراپە ئەوە دروستە بەکارهێنانی بەمەرجێك بۆ چارەسەری و شیفا بێت, رەچەتەکەی لەلایەن پزیشکێکی باوەڕپێکراوەوە نوسرابێ لە نهێنی و ئاشکرادا لە خوا بترسێ, چونکە دروشمی شەریعەت راوەستاوە لەسەر ئاسانکاری و نەهێشتنی قورسی و نارەحەتی, بەدیهێنانی بەرژەوەندی خەڵك, ئەسڵیش لەمەدا ئەم ئایەتە: ﴿**فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ**﴾. **البقرة١٧٣.**
واتە: هەرکەسێك ناچار بوو بەبێ یاخی بوون و دەرچوون لەسنور ئەوە هیچ گوناحێکی لەسەر نیە, بێگومان خوا لێ خۆشبووی میهرەبانە.

**٣- چارەسەری سەرکەوتوو بۆ لە ریشە دەرهێنان و دەست بەسەراگرتنی ئەم دیاردەیە بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەبێت:**

أ- پەروەردەیەکی چاك.

ب- قەدەغەکردنی هۆکارە دیارەکانی.

ج- سزادانی ئەو کەسانەی ئەو تاوانە ئەنجامدەدەن.

**أ- پەروەردەیەکی چاك:** ئەویش بە پەروەردەی منداڵ دەبێت لەسەرەتای پشکوتنیەوە لەسەر ئیمان بەخوا, ترسان لێی, هەستکردن بەچاودێری خوایی لە نهێنی و ئاشکرادا, چونکە ئەو پەروەردە راست و دروستە کاریگەری چاکی دەبێت لەسەر جێگیربوونی ویژدانی, چاکسازی دەروونی و, رەوشتی بەرزو جوانی.. وەك لە مێژوودا ئاشکرایە ئەو عەرەبانەی کە ئیسلامیان ناسی و ئیمانیان هیناو چوونە ناو ئیسلامەوە, کاتێ ویژدانی خۆیان راهێنا لەسەر چاودێری خوایی, ترسان لێی و, پشتیان پێبەست, داوای

[1] - صحيح رواه البخاري: ٣٢٨/١٧, غاية المرام: ٦٧.

یارمەتی و کۆمەك کردن لە خوا رەگی داکوتا لە دڵ و دەروونیاندا, ئیتر بەویستی خۆیان وازیان هێنا لە هەموو دابونەریتێکی سووك و ریسوای سەردەمی نەفامی..

بۆ نمونە باسی ئەوەتان بۆ دەکەین کە عەرەبەکان لەپێش ئیسلامدا چەندە پەیوەست بوون بەمەی و ئارەقەوە, چۆن هەڵیانداوە پێیدا, چەندە رۆچووبوون لە وەسفیدا.. گوێ بگرن لەم شاعیرە بزانن لەوبارەوە چی دەڵێت:

**إذا متّ فأدفني الى جنب كرمة**

**تروّي عظامي بعد موتي عروقها.**

بەکورتی مانای شیعرەکە ئەوەیە ئەگەر مردم مەی بخەنە گۆڕەکەم با دوای ئەوەی رەگەکانی جەستەم مردن ئەو مەیە ئێسکەکانم تێراو بکات.

هەروەها گوێ بگرن چەندە ناوو نازناویان بۆ داناوە: **(المدامة, السلافة, الراح, الصهباء, إبنة عنقود, إبنة الكرم, بنت الدنان, بنت الحان..)** کە لەسەد ناو زیاترە بووە.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك پێیان گەیشت کە خواردنەوەی مەی حەرامە هەموو بەجارێك وتیان: **ئەی پەروەردگارمان ئەوا وازمان لێ هێنا**, بەڵکو هەرچیش لە کوپەڵەو گۆزەکانیشدا بوو رژاندیانە سەر جادەو کۆڵانەکانی مەدینە.. بەو شێوەیە ئیمان شتی سەرسوڕهێنەر دروستدەکات کاتێك گەیشتە قوڵایی دڵ و رەگی داکوتا لە ویژدان و دەرووندا.. بەڵکو هەڵدەسێ بەدەوری کاریگەری گەورەی خۆی لە پاکردنەوەو چاکسازی, کە دەوڵەتان دەستەوسانن لەبەردەمیدا, دەسەڵاتداران بەو هەموو دەسەڵاتەی خۆیان سەرنەکەوتوون لە بەدیهێنانی ئەو ئامانجەدا کە لەناوبردنی مەی و ئارەقە..

ئای کۆمەڵگەکانی مرۆیی چەندە پێویستیان بە ئیمان و پەروەردەی چاکی لەو جۆرەیە!!..

**ب- قەدەغەکردنی هۆکارە دیارەکانی:** جێبەجێکردنی دەگەڕێتەوە بۆ کاربەدەستان, دەوڵەت ئەگەر لە بازاڕو هەموو شوێنەکان مەیی قەدەغەکرد, رێگا چارەی گرتەبەر بۆ لەناوبردن و بنەبڕکردنی, دەرگای داخست بەرووی ئەو کەسانەدا کە

ئیدمان بوون لەسەری, ئەو کاتە گەنج و لاوەکان دەستیان نایگاتێ و نایخۆنەوە, هیچ ریگایەکیش نابێت بۆ گوناحکارەکان بیگەنێ..

**ج- سزادانی ئەو کەسانەی ئەو تاوانە ئەنجامدەدەن:** بەراستی ئیسلام سزای توندی داناوە بۆ ئەو کەسانەی دەیخۆنەوە (٤٠ تا ٨٠) داریان لێدەدرێ, کە ئەوەش لە زیندانی و تەمێکردن و غەرامەو دەست بەسەراگرتن رێگریان لێ ناکات.. بۆ هەموو ئەوانەی دەیفرۆشن و دەیگوێزنەوەو بازرگانی پێوە دەکەن..

لەسەر دەوڵەتانە ئەگەر دەیانەوێت بەراستی قەدەغەی بکەن دەبێت لێکۆڵەرەوەی کۆمەڵایەتی خاوەن ئەزموون و دڵسۆزو چالاك دابنێن.. دەستبەکار بن بەشێوەیەکی جوان و گونجاو بۆ لەناوبردنی ئەو دیاردەیە تا لە کۆتاییدا دەگەنە ئەوەی کۆمەڵ پاك دەبێتەوە لە تاوانی گەورەو ترسناکی لەناوبەری مەی و مادە سڕکەرەکان.

**٤ - دیاردەی زیناکردن و نێربازی:**

یەکێکە لە ترسناکترین دیاردەی کۆمەڵایەتیەکان لای منداڵان و هەرزەکارو لاوەکان.. چەند جار بیستومانە ئەو منداڵانەی نەگەیشتوونەتە تەمەنی باڵغ بوون, بەدوور لە چاودێری باوك و دایك و خزمەکانیان رێگەی بەدرەوشتی وخراپەکارییان گرتۆتەبەر.. سەرەنجام خلیسکاون و کەوتونەتە ناو چاڵی هەواو ئارەزووە ناوازەو دەگمەنەکان, رەوشتیان هەڵوەشاوەو, نقوم بوون و تیاچوون.

چی کارەساتێك لەوە گەورەترە باوك و دایك و سەرپەرشتیاران بەچاوی خۆیان ببینن منداڵەکانیان شکستیان هێناوەو, لە فیترەتی خۆیان لایانداوە, رەوشتیان بێسەروبەرەیە, کەوتوونەتە ناو قوڕو لیتەی ریسوایی رەوشتە دەگمەن و ناوازەو خراپەکانەوە!!..

ئایا ئەو کاتە دادو بێدادو داخ و حەسرەت هیچ سوودێکیان پێدەگەیەنێ, دوای ئەوەی بینیان جگەرگۆشەو بەرهەمی دڵەکانیان کەوتوونەتە ناو قوڕو چڵپاوی بیسەروبەرەیی شتە پیسەکان و شیوو دۆڵی خراپەوە؟

بێگومان ئەگەر پەروەردەیان بکردنایە لەسەر رەوشتی بەرزو جوان, چاودێری هەڵس و کەوتیان بکردنایە بەتەواوی, بیانزانیەیە هاوڕێیەتی تێکەڵاوی کێ دەکەن,

سەرەنجامی منداڵەکانیان بەو کارساتە دڵتەزێن و ئاکامە ریسواییەو ئەو رۆژە رەشە نەدەگەیشت!!..

کێ بەرپرسی یەکەمە لە رەوشتە دەگمەن و ناوازەکان, لە لادانی کۆمەڵایەتیەکانی کیژو کورەکان؟

کێ ئاراستەیان بکات بەرەو لای بیروباوەڕی رەوشتی بەرزو جوان, رەوشتە ناشیرین و خراپەکانیان لەبەرچاو سوك و ریسوا بکات بێجگە لە باوك و دایك و سەرپەرشتیاران؟

باوك و دایك هەردووکیان بەرپرسی یەکەم و کۆتایین لە پەروەردەکردنی منداڵ, پاشان دەوڵەت و کۆمەڵ بەرپرسن لێی.

لە دوای ئەم چەند ئاراستەیەی سەرەوە دەربارەی ئەم دیاردەیە لەم سێ لایەنەوە دەدوێین:

١ - زیانەکانی زیناکردن و نێربازی.

٢ - حوکمی شەرع لەو بارەوە.

٣ - چارەسەری سەرکەوتوو بۆ لە ریشە دەرهێنان و دەست بەسەراگرتنی.

**١ - زیانەکانی زیناکردن و نێربازی:**

أ- زیانەکانی دەروونی و جەستەیی: دەرەنجامی تاوانی زیناو نێربازی ئەم نەخۆشیانەی لای خوارەوەی لێ دەکەوێتەوە:

**١ - نەخۆشی زوهری:** نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە بریتین لە بوونی برین و هەڵاوسان لەسەر ئەندامی زاوزێ و لێوو زمان و پێڵوی چاو.. دەرکەوتنی پەڵە لەسەر هەموو جەستە, ئەم نەخۆشیە ترسناکە دەبێتە هۆی ئیفلیجی, کوێری, گرژبوونی بۆریەکانی خوێن, دڵەکوتێ, شێوانی جەستە, سەرەتانی زمان, لە هەندێك حاڵەتدا توشبوون بە نەخۆشی سیل, کە رەنگە بەهۆی لیك و دەست لێدانەوە بگوێزرێتەوە بۆ ژن و منداڵ و کەسانی تر.. چونکە لە نەخۆشیە درم و گوێزراوەکانە.

**٢ - نەخۆشی سەیلان:** نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە بریتین لە بوونی ئازارو کزانەوەیەکی زۆر لە کاتی میزکردندا, دەردانی ئیفرازاتی بۆگەن لە بۆری میزی

پیاودا, هەروەها لە ملی رەحم و بۆری میزی ئافرەتاندا.. دەرەنجامەكانی نەخۆشی سەیلان لە پیاواندا رووداني هەوكردنی جووتە گون و میزلّدان و تەسك بوونەوەی بۆری میزە.. بۆری میزی پیاو تووشی برین دەبیّ, زۆرجار ئەو برینە دەبیّتە هۆی میزگیران و هەندیّ جاریش مردنی.. نەخۆشی سەیلان لە ئافرەتاندا دەبیّتە هۆی هەوكردنی رەحم و بۆری میزو گورچیلەكان.. هەروەها دەبیّتە هۆی نەزۆكی لە پیاوان و ژنانیشدا..

**٣- بلاّوبوونەوەی ئەو نەخۆشیانەی تەشەنەدەكەن:** نەخۆشیەكانی زیناكردن و نیّربازی دەبنە هۆی نەخۆشی پیس و تەنینەوەی بەهۆی میكرۆبی كوشندەوە لە یەكیّكی تووشبووەوە بۆ یەكیّكی ساغ, وە بەهۆی ئەو تۆوە پیسەی كاتی پیّكەوە جوت بوون.. وەك نەخۆشی ئایدز كە دەبیّتە نەمانی بەرگری جەستەو یەكیّكە لە نەخۆشیە ترسناك و كوشندەكانی باوی سەردەم.

زۆربەی ئەم نەخۆشیانە لەو كۆمەڵگانەدا بلاّودەبنەوە كە زیناكردن و نیّربازی تیّیاندا بەئاشكرا دەكریّت!!

چەند جوان و راستی فەرمووە راستگۆو بەراست زانراو موحەممەدی كوڕی عبدللە صلى الله علیه وسلم لە كاتیّكدا هەواڵی ئەوەی داوە كە ئەگەر بەدرەوشتی و زیناكردن لەناو هەر گەلیّكدا ئەنجامدرا بەئاشكراو دەركەوت خوای گەورە تووشی بەلاّو نەخۆشی سامناكی وایان دەكات كە لە پیّش ئەواندا دەرنەكەوتووە..

* پیّغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمویەتی: (**يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ وَأَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ لَمْ تَظْهَرْ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا إِلَّا فَشَا فِيهِمْ الطَّاعُونُ وَالْأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمْ..** )[١]. واتە: ئەی كۆچەریەكان پیّنج خاڵ هەن ئەگەر تووشی بن, پەنادەگرم بەخوا ئەگەر تووشی بن: هەر كاتیّك بەدرەوشتی و زیناكردن لەناو هەر گەلیّكدا دەركەویّت و بەئاشكرا ئەنجامی بدەن ئیلا ئەو كاتە بەلاّو نەخۆشی سامناكی وایان تیّدا بلاّودەبیّتەوە كە لە پیّش ئەواندا لە سەردەمی باو باپیرانیاندا دەرنەكەوتووە..

[1] - صحيح رواه إبن ماجة, وأنظر صحيح الجامع: ٧٩٧٨.

ئاگاداربن و بیربکەنەوەو پەندی لیٚ وەرگرن ئەی خاوەن بیرو هۆشەکان.

**ب- زیانەکانی کۆمەڵایەتی و رەوشتی و دەروونی:**

ئەوەندە بەسە بۆ ترسناکی و زیانی کە دەبێتە هۆی تێکەڵاوی نەژادو ونبوونی وەچە, هەتککردن و دەستدرێژیکردنە سەر شەرەف و ناموس و شتە حەرام کراوەکان, کوشتن و لەناوبردنی پیاوەتی و شەهامەت, تێکچوونی کۆمەڵگە, پچرانی پەیوەندی نێوان ژن و مێرد, هەڵوەشانەوەی شیرازەی خێزان, رۆشتن بەرەو کەوتنە ناو قوڕو لیتاوی ریسوایی و خراپەکاری, نەمانی رێزو پیاوەتی.

**بەسە بۆ بەدی و خراپی** کە بەهۆیەوە کۆمەڵگە پڕدەبێت لە منداڵی زۆڵی بیٚ رێزو بیٚ دایك و باوك, بێگومان رەوتی بەدرەوشتی و بەرەڵایی چوار دەوری لاوەکانی گەل و ئافرەتانی داگیرکردووە.. ئەگەر کار وابڕوا شەرەف و رەوشتە بەرزەکان هیچ نرخ و رێزێکیان بۆ دانانریٚ!!..

دەی ئیتر کۆمەڵگە دەبێت قیمەتی چی بیٚ کە رەوشتی لەناوچوو, حەیاو شەرمی نەما, کیان و بوونی رووخا ؟

یا کۆمەڵگە دەبێت قیمەتی چی بێت ئەگەر منداڵەکانی پرش وبڵاوبوونەوە, ئافرەتەکانی شەرەفیان نەماو بەدرەوشت بوون, لاوەکانی گوناحکاربن ؟

یان دەبێت کۆمەڵگە قیمەتی چی بیٚ ئەگەر بووبە کۆیلەی حەزو ئارەزووەکان, غریزەی جنسی دەستی بەسەراگرت, هیچ شتێك نەناسن جگە لە غریزەی جنسی و ئارەزووە سەرکەشەکان, هیچ هیوایەیەتێکیان نەبیٚ جگە لە ئارەزووی رەوشتە نزمەکان و تێرکردنی غریزەی جنسی.. ؟

بێگومان ئەوکۆمەڵگەیە رووخاوەو هەموو ئان و ساتێك لەبەردەم هەڕەشەی نەمان و لەناو چووندایە, خوای گەورەش راستی فەرمووە لە قورئانەکەیدا کە دەفەرموێت: **﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيراً﴾. الإسراء١٦**. واتە: کاتێك ویستبێتمان شارو ئاواییەك لەناو بەرین, فەرمان دەدەین(بەگوێڕایەڵی کردەوەی چاك)بەدەوڵەمەندە خراپکارو زۆردارەکانی, جا ئەوانیش لە جیاتی گوێڕایەڵی نافەرمانی و سەرپێچیان تێدا کردووەو لێی دەرچوون, بەوە

سزایان بەسەردا سەپاوە, ئەمجا ئێمەش بەسەختی کاولمان کردووە.

**٢- حوکمی شەرع لەو بارەوە:**

**بەیەکدەنگی شەرعزان و فوقەها تێکۆشەرەکان زیناکردن و نێربازی حەرامن,** بەم بەڵگانە:

**دەربارەی حەرامی زینا** خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً﴾. الإسراء٣٢.** واتە: نزیك مەکەونەوە لە زیناو لە هۆکارەکانی, بۆ ئەوەی نەکەونە ناوی, چونکە بەراستی زینا کردەوەیەکی ئەوپەڕی ناشیرین و پیسترین ڕێگایە.

هەروەها دەفەرموێت: **﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً* يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً﴾ . الفرقان ٦٨-٦٩.** واتە: ئەوانەی وێڕای خوا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن, کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی یاساغ کردبێت, مەگەر بەهەق و ڕەوا, وەکو پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام, زیناکردن, کوشتنی خەڵکی بێ تاوان, زینا ناکەن, وە هەرکەسێك ئەو کارو کردەوە ناپەسەندانە بکات, ئەوە لە دوارۆژدا دەگات بەسزای تاوانەکەی خۆی. لە ڕۆژی قیامەتدا دوو بەرامبەر ئازار دەدرێت, چونکە لەلایەکەوە هاوەڵی بۆ خوا بڕیارداوە, لەلایەکی ترەوە ئەو گوناهە ناشیرینانەی کردووە, بەسووکی و زەلیلی و ریسواییەوە بەهەتا هەتایی هەر لەوێدا دەمێنێتەوە.

* ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ..)**[1]. واتە: زیناکەر لەکاتی زیناکردندا ئیماندار نیە..

* پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: **(إن الزناة يأتون تشتعل**

---

[1] - متفق عليه: المشكاة: ٥٣/١.

**وجوههم نارا)**[1]. واتە: زیناکەران لە ڕۆژی قیامەتدا دێن دەم و چاویان ئاگری لێ هەڵدەگرسێ.

* حاکم گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: **(إذا ظهر الزنا في قرية فقد أحلوا بأنفسهم عذاب الله)**[2]. واتە: ئەگەر زینا لەهەر شارو ئاواییەك دەرکەوت و بەئاشکرا ئەنجامدرا, ئیلا بەدەستی خۆیان سزاو تۆڵەی خوای گەورەیان بۆ خۆیان حەڵاڵ کردووە.

* هەروەها دەفەرموێت: **(الزاني بحليلة جاره لا ينظر الله إليه يوم القيامة ولا يزكيه ويقول له أدخل النار مع الداخلين )**[3]. واتە: ئەو کەسەی لەگەڵ خێزانی دراوسێکەیدا زینا بکا, لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە سەیری ناکات و پاکی ناکاتەوە, پێی دەفەرموێت: بچۆرە ناو ئاگرەوە بەهەتا هەتایی لەگەڵ ئەوانەدا کە بەهەمیشەیی لە دۆزەخدان.

بەڵام دەربارەی حەرامی نێربازی خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ* وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِنْ أَزْوَاجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾. الشعراء١٦٥–١٦٦.** واتە: ئەرێ ئێوە لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا دەڕۆنە لای نێرەکان و, ئارەزووتان لەگەڵ ئەواندا جێبەجێدەکەن, وە خێزان و هاوکوفی خۆتان کە خوا بۆی دروستکردوون وەلا دەنێن! بەڵکو ئێوە هەر گەلێکی زۆر دەست درێژکەرو نارەسەن و سەرکەشن.

هەروەها دەفەرموێت: **﴿وَلُوطاً إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّن الْعَالَمِينَ* أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ السَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ الْمُنكَرَ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلَّا أَن قَالُوا ائْتِنَا بِعَذَابِ اللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾. العنكبوت: ٢٨–٢٩.** واتە: **لوطمان** کردە پێغەمبەرو بەگەلەکەی خۆی وت: بەراستی ئێوە ئەوەندە تاوانی خراپ و ناشیرین ئەنجامدەدەن لەوپەڕی شەرمەزاریدایە!! یەك لە خەڵكانی

---

[1] - ضعيف رواه الطبراني أنظر ضعيف الجامع حديث رقم: ١٤٦٥.

[2] - رواه أحمد بسند الصحيح وأبو يعلى: ٢٣٧/١٠ برقم٤٨٥١.

[3] - رواه الحاكم إبن أبي الدنيا والخرائطي, سلسلة ضعيفة: ٨/ ٣٦٧٥.

جیهانیش پێش ئێوە کاری نەشیاوی وای نەکردووە, ئەرێ ئێوە دەچنە لای پیاوان, رێ لە بەردەوامی بەرەی مرۆڤ دەگرن, یان رێ لە خەڵك دەبڕن و ئەشیکوژن و شتومەکەکانی لێوەردەگرن و دەستدرێژیشی بۆ دەکەن, وە لە یانەی کۆبوونەوەی خۆتاندا کاری زۆر خراپ و دزێوو ناحەز دەکەن؟! کەچی پاش ئەو هەموو ئامۆژگارییە, وەڵامی گەلەکەی هەر ئەوە بوو بەگاڵتەوە بە **لوطیان** وت: ئەگەر لە راست بێژانی ئادەی سزای خوامان بۆ بێنە.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سێ جار لەسەریەك فەرمویەتی: **(مَلعُون من عَمِلَ عَمَل قوم لوط, مَلعُون من عَمِلَ عَمَل قوم لوط. مَلعُون من عَمِلَ عَمَل قوم لوط..)**[1]. واتە: نەفرینی خوا لەو کەسەی کردەوەی نەتەوەی **لوط** دەکات.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي عَمَلُ قَوْمِ لُوطٍ)**[2]. واتە: بەراستی ئەوەی من زۆر لێی دەترسم ئەوەیە ئوممەتەکەم کردەوەی نەتەوەی **لوط** ئەنجامبدات.

* پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(أربَعَة يُصبِحون في غَضب الله ويُمسون في سخط الله, قال أبوهريرة من هم يا رسول الله قال: الْمُتَشَبِّهِونَ مِنْ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ, وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنْ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ, والذي يأتي البَهِيمَةً والذي تأتيه الرِجال)**[3]. واتە: چوار کۆمەڵ بەیانیان و ئێواران دەکەونە بەر تووڕیی و نارەزایی خوا, ئەبو هورەیرە گوتی: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم!؟ فەرموی: ئەو پیاوانەی خۆیان دەچوێنن بەئافرەتان, وە ئەو ئافرەتانەی خۆیان دەچوێنن بەپیاوان, ئەوانەی کاری پێکەوە جوت بوون لەگەڵ ئاژەڵان و پیاوان ئەنجامدەدەن.

**لە شەرعدا سزای دیاریکراو دانراوە بۆ ئەو کەسانەی زیناو نێربازی دەکەن:**

**١- سزای زیناکردن:**

**لە شەرعدا زیناکەر بەدوو جۆر سزادەدرێت:**

---

[1] - صحيح رواه الحاكم, صحيح الترغيب والترهيب: ٢/ ٢٤٢٠.

[2] - صحيح رواه الترمذي: ١٣٧٧, وإبن ماجة: ٢٥٥٣, وأنظر صحيح الجامع: ١٥٥٣.

[3] - سلسلة ضعيفة: ١١/ ٥٣٧٠.

أ- سزای دارلێدان لەگەڵ دوورخستنەوە.                ب- سزای بەرد بارانکردن.

**أ- سزای دارلێدان لەگەڵ دوورخستنەوە:** ئەگەر زیناکەر هاوسەری نەبوو ئەوە سەد داری لێدەدرێ چ کور بێت یان کچ, بەپێی ئەم ئایەتەی خوای بالا: ﴿**الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ**﴾. **النور٢**. واتە: کورو کچی زیناکەر پێش ئەوەی زەواجیان کردبێ, هەریەکەیان سەد داریان لێبدەن, وە نابێت بەزەییتان پێیاندا بێتەوە لە حوکمی خوادا, ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە, وە با بۆ سزا دانەکەیان کۆمەڵێك لە موسڵمانان ئامادەبن.

دوورخستنەوە لای حەنەفیەکان لە بەشی سزادان و تەمێکردنە, ئەگەر ئیمام بینی ئەو دوورکەوتنەوەیە سوودی هەیە, لای ئیمامەکانی تر واجبە دوورخستنەوەی لە دوای دارلێدان بۆ شوێنێك ئەوندە دوور نەبێت نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە, سزای دوورخستنەوە بڕیاری خەلیفە راشیدەکان و زۆربەی هاوەڵانە.

**ب- بەڵام سزای بەردباران** بۆ ژن و پیاوێکە کە زەواجیان کردبێ و زینابکەن, بەپێی ئەم فەرمودەیە: (**لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ الثَّيِّبُ الزَّانِي وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ**)[1]. واتە: حەڵاڵ نیە خوێن رشتنی مرۆڤی موسڵمان کە شایەتومانی هێنا بێت تەنها لەم سێ حاڵەتەدا نەبێت: خوێنێکی کەوتبێتەسەر واتە موسڵمانێکی کوشت بێت, یا زەواجی کردبێت و زینای کردبێت, یان پاشگەزبووبێتەوە لە ئیسلام و وازی لە کۆمەڵی موسڵمانان هێنابێت.

لە فەرمودەی راستدا چەسپاوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانیکرد بە بەردبارانکردنی ماعزی کوڕی مالیك و ئافرەتە غامدیەکە چونکە خۆیان دانیاننا بەتاوانەکەیاندا لەبەردەم پێغەمبەری پێشەوادا صلى الله عليه وسلم, وە هەردووکیشیان زەواجیان کردبوو.

---

[1]- متفق عليه, المشكاة: ٣٤٤٦/٢.

**٢ - سزای نێربازی:**

زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە نێربازی وەك زینایە, بەڵام کەمێك جیاوازییان هەیە لەو سزایەی بۆیان دانراوە, ئیمام**(البغوي)** دەڵێت: ئەهلی زانست و زانیاری جیاوازییان هەیە لە سزادانی نێربازدا, هەندێکیان لایان وایە وەك سزای زینایە, ئەگەر ژنی هێنابوو رەجم دەکرێت, ئەگەر کوڕ بوو ئەوە سەد قامچی لێدەدرێ, کە ئەمەش دیارترین وتەی ئیمام شافیعیە, هەندێکی تریان رایان وایە دەبێت نێرباز رەجم بکرێ ژنی هێنابێ یان نەیهێنابێ, ئەمەش وتەی ئیمام مالیك و ئیمام ئەحمەدە, بەڵام وتەی دووەمی ئیمام شافیعی ئەوەیە کە دەبێت بکەرو کارپێکراو بکوژرێن[1]. بەڵام حەنەفیەکان رایان وایە سزادانی نێرباز واجبە بەو شێوەیەی ئیمام خۆی بەباشی دەزانێ بەمەرجێك ببێتە هۆی تەمێکردن وازهێنانی تاوانکار, بەڵام ئەگەر وازی نەهێناو دووبارەی کردەوە سزاکەی ئەوەیە بەشمشێر بدرێت لە ملی و بکوژرێت.

**ئەوەش ئێوەو ئەو دەقانەی کە بەڵگەن لەسەر کوشتنی بکەرو کارپێکراو, هەروەك هەموو شەرعزان و فوقەهاو شەرعزانە تێکۆشەرەکان یەکدەنگن لەسەری:**

* ئیبن عەباس گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ)**[2]. واتە: هەرکەسێکتان بینی کاری نەتەوەی لوگی ئەکرد بکەرو کارپێکراو بکوژن.

* عەکرەمە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(أقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ, والذي يأتي البَهِيمَةَ)**[3]. واتە: بکەرو کارپێکراو بکوژن, وە ئەوانەش کە کاری پێکەوە جوت بوون لەگەڵ ئاژەڵان ئەنجامدەدەن.

**٣- چارەسەری سەرکەوتوو بۆ لە ریشەدەرهێنان و دەست بەسەراگرتنی ئەم دیاردەیە:** هەمان چارەسەریە کە بۆ ئاو هێنانەوە بەدەست دانراوە, پێشتر باسکراوەو

---

[1] - النص الفقهي من كتاب (الترغيب والترهيب) ج٤, ص٣٢٥ باب( الترهيب من اللواط).

[2] - صحيح رواه الترمذي: ٣٧٦/٥ برقم: ١٣٧٦, وابن ماجه والبيهقي وأبو داود, صحيح الترغيب والترهيب: ٢٤٢٢/٢ .

[3] - رواه البيهقي وغيره.

پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات.

بەڵام ئەی خوێنەری خۆشەویست ئەم چارەسەریەشت بۆ زیاد دەکەم: ئەویش ئەوەیە ئەم گەل و نەتەوەیە چاك نابێت, تاکو نەگەڕێنەوە سەر ئەو بەرنامەیەی کە لەسەرەتادا هاوەڵان لەسەری بوون, بێگومان ئەوانیش ئایینی ئیسلام شەرع و یاسایان بووە, لە سایەیدا سەربەرزی و شکۆمەندیان بەدەسهێنا, بوونە خاوەن دەسەڵات و شارستانی تا لەسەر ئەو رێبازە پیرۆزە رۆشتن, ئەمرۆش نەتەوەچاك نابێت تەنها بەوە نەبێت کە دۆێنیٚ چاکسازیان پێکردووە, ئەو کاتە دەبنەوە بەخاوەن دەسەڵات و شارستانی, سەربەرزی و شکۆمەندی بەدەسدەهێن, دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کاتەی کە چاکترین و هەڵبژاردەترین گەل تێیدا دەژیا, ئەوان دەکەنە پێشەنگ و لەسەر رێنماییەکانی ئەوان هەنگاو هەڵدەگرن.. خوا لە خەلیفەی راشد عومەری کوڕی خەتاب خۆش بیٚ دەیفەرموو: ئێمە گەلێکین خوای گەورە بەهۆی ئیسلامەوە سەرربەرزی کردووین, ئەگەر بمانەوێت بە غەیری ئیسلام سەربەرز بین, ئەوا خوای گەورە سەرشۆڕو ریسوامان دەکات [١].

**إذا الايمان ضاع فلا أمان**

**ولا دنيا لمن لم يُحي دينا**

**ومن رضي الحياة بغير الدين**

**فقد جعل الفناء له قرينا.**

بەکورتی شیعرەکە مانای ئەوەیە: ئەگەر دین نەماو تیاچوو ئەو کاتە ئاشتی و ئارامی نامێنیٚ, دین بۆ کەسێك نیە کە دین زیندوو نەکاتەوەو لەسەر بەرنامەی ئاییني ئیسلام نەڕوات, هەر کەسێك رازی بوو بەبیٚ دینی, ئەو کاتە نەمان و تیاچوونی نزیکە.

لەبەر رۆشایی ئەم بیروباوەڕەی کە پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم دایناوە: **(لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ)** [٢] . واتە: با کەس زیان لە خۆی نەدات و زیانیش بە کەسی

---

[1] - رواه الحاكم.

[2] - رواه مالك: ١٢٣٤, وقال الشيخ الألباني صحيح, إبن ماجة:٢٣٤٠, سلسلة الصحيحة: ٢٥٠.

تر نەگەیەنێت. وە بەگشتی ئەم ئایەتە: ﴿وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ..﴾. **البقرة١٩٥.** واتە: بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تیاچوونەوە.. دەستگرتن بەواجبی ئەو بەرپرسیێتیەی کە پێغەمبەری پێشەوا سەپاندویەتی.. پێویستە لەسەر پەروەردەکاران بەتایبەتی باوکان و دایکان دەستبگرن بەو هۆکارانەوە کە منداڵەکانیان دەپارێزێت, بەهۆشیاری و دووربینیەوە ئاگاداری جگەرگۆشەکانیان بن.. تاکو نەکەونە داوی رووداوی کارەساتی پڕ مەترسی کتوپڕو پڕ لە ژان و ئازارەوە, کە لەوانەیە هەندێ جار ببێتە هۆی گیان لە دەستدانیان, یا شێوانی جەستەیان یان کەمئەندام بوونیان..

**ئەی پەروەردەکاران ئەوەش ئێوەو ئەو هۆکارە خۆپارێزیانەی کە دەبنە هۆی کەمکردنەوەی کارسات و رووداوی ناخۆش:** ئەمەش کورتەی لاپەڕە(١٧٧)ی کتێبی(المشكلات السلوكيه)ی دکتۆر(**نبيه الغبرة**) بەدەسکاریەوە بۆتان نقلّ دەکەین کە دەڵێ: بەراستی دانانی یاسای راست و دروست زۆر پێویستە بۆ سەلامەتی و پاراستنی منداڵەکانمان, ئەمە جگە لەوەی پێویستیشە بۆ دڵنیایی و هەست و سۆزیان, ئاگاداریکردن و پاراستنی منداڵ لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا بەتەواوی دەکەوێتە ئەستۆی کەس و کارەکەی, ئەوان بەرپرسن لە زێدەرۆییەکانی, بەڵام لە ساڵی دووەمی تەمەنیدا شتێکی باش و گونجاوە منداڵ فێری ئەوە بکرێت چۆن خۆی بپارێزێ لەو شتانەی مەترسیدارن, ئەوەش بەراهێنانی لەسەر هەندێك وانە بەنەرم و نیانی, تاکو خۆی بەدووربگرێ لەو زۆباو ئاگرو کەل و پەلانەی گەرمن و دەستیان لێنەداو بکەوێتە ناویانەوە, چاکتر وایە بەشێوەیەکە جوان ئاگادار بکرێنەوە یان پێیان بوترێت ئەو شتە ئەگەر دەستت بەری بکەوێت گەرمەو لەوانەیە دەستت بسوتێت یا ئازار پێ بگات, رێگای بدەی بەخێرایی دەستی لێبدات بەڵام ئازاری پێ نەگەیەنێ, بۆ ئەوەی بترسێ و ئاگاداری خۆی بێت.. کاتێك بینیمان منداڵێك نزیکە لەسەر کورسیەك بکەوێتە خوارەوە ئەگەر شتێکی بەدەستەوە نەبوو کە ئازاری پێ بگەیەنێت یان شتێکی وەها نەبوو لە زەویدا بکەوێت بەسەریداو ئازاری بدات, ئەو هیچی تێدا نیە ئەگەر بکەوێتە خوارەوە بەڵام بەهۆشیاریەوە بۆ ئەوەی ببێتە فرسەتێك بۆ ئاگادارکردنەوەی, بەشێوەیەکی گشتی دەبێت هاوسەنگی هەبێت لەنێوان فێرکردن و پارێزگاریدا.. لەسەر

کەس و کار پێویستە منداڵ هۆشیارکەنەوە لەو مەترسی و کارەساتانەی لەکاتی یاریکردندا دێنە ڕێگای.

ئەوش ئێوەو ئەو هەنگاوانەی کە یارمەتیدەرن بۆ کەمکردنەوەی ڕووداو کارەساتی ناخۆش بەکردەوە وەك دکتۆر (نبیە الغبرە) خستونیەتیەڕوو:

١- پێویستە مادەی ژەهراوی لە شوێنی داخراودا هەڵبگیرێت, کلیلەکەی لە شوێنێکی سەلامەتدا دانرێت, هەروەها پێویستە لەسەر شوشەکەی بەڕوونی ناوی مادە ژەهراویەکە بنوسرێت, لە نزیك شوێنی خوادەمەنیەوە دانەنرێت, ئەمەش هەموو جۆرە ژەهرەکان دەگرێتەوە, کە بۆ چەندەها مەبەستی جیاواز بەکاردێن, گرنگترینیان بۆ کوشتنی جانەوەران و, قەترانە..

٢- فڕێدانی ئەو دەرمانانەی بەکارهاتوون یان پێویست نین, نابێت بخرێنە بەردەستی منداڵ, چاکتر وایە لەبەر چاوی منداڵدا دەرمان نەخورێت یان بەکارنەهێنرێت, چونکە منداڵ حەزی لە لاسایکردنەوەو چاولێکەریە, ڕووداوی ژەهراویبوونی منداڵان بەدەرمان شتێك نیە کەم ڕووبدات, ئەگەر ویستمان دەرمانێك یان شروبێك بدەین بە منداڵ دەبێت لەپێشەوە فێری ئەوەی بکەین کەئەوە دەرمانە شەربەت نیە, چاکتر وایە لەبەردەستی منداڵدا دانەنرێت, بخرێنە شوێنێکەوە دەستی نەیگاتێ, ئەگەر جێگای متمانە نەبوو.

٣- دانانی بەربەستی پارێزگاریکردن شتێکی پێویستە لەبەردەم ئامێرەکانی گەرمکردنەوەدا بەهەموو جۆرەکانیەوە, وەك زۆپاو فڕن و تەباخ.. ئەگەر منداڵ دەیتوانی بڕوات بەلایاندا, ئەگینا ڕووداوی تاڵ و ناخۆش ڕوودەدا, چەندەها منداڵ بەو شتانە سوتاون.

هەروەها پێویستە ڕێگا نەدرێت بەمنداڵ یاری بکات بەو شتانەی گڕدەگرن وەك دەنکەشقارتە, بەڵکو پێویستە لە جێگای بەرزدا دابنرێن بۆ ئەوەی منداڵ دەستی نەیانگاتێ.

کتری و دەفری ئاوی گەرم و مەنجەڵە چێشت شتێکی پڕمەترسین بۆ منداڵ, چەند دایکی نەفام ئاگای لەو شتانە نەبووەو فەرامۆشیکردوون تا جگەرگۆشەکەی سوتاوە

تووشی برین و شێوانی جەستە هاتووە؟

چەند دایکی نەزان قۆریە چای لەسەر لێواری مێزی نان خواردن, یان لەسەرە ڕێگادا, یا لەسەر کورسیدا داناوەو منداڵ کەوتووە بەسەریاو ڕژاوە پێیداو سوتاوە.

هەروەها پێویستە ڕێگانەدرێت بەمنداڵ یاری بکات بەتەقەمەنی لەکاتی بۆنەو ئاهەنگەکاندا, هۆشیاربکرێتەوە لە مەترسی ئامێرە کارەباییەکان لە ترسی ئەوەی ڕووداوی ناخۆش ڕوونەدات.

٤- پێویستە هەموو ئامێرە تیژەکانی وەك مەقەست و چەقۆو دەرزی و شوشە دوور بخرێنەوە لە منداڵ و لەشوێنێکدا دابنرێن دەستی نەیانگاتێ.

٥- پێویستە ڕێگانەدرێت بەمنداڵ یاری بکات بەو شتانەی ترسناکن وەك پەت خستنە مل, یاری بە کیسەی پلاستیك و سەرکردن بەناویا چونکە ئەوە دەبێتە هۆی خنکانی, هەروەها پێویستە منداڵ لە کاتی بازداندا خواردن لەناو دەمیدا نەبێت, یان ئەو شتانەی کە بەددان دەقرتێن وەك قەزوان و فستق هەڵیانەدات بەحەواداو بەدەم بیانگرێتەوە نەوەکا بکەونە ناو بۆری هەوایەوەو ببێتە هۆی خنکاندنی.

٦- پێویستە لەسەر دایك منداڵەکەی لە جێگاکەی خۆیدا نەخەوێنێت نەوەکا لە کاتی خەودا بکەوێت بەسەریاو بیخنکێنێ, چەند ڕووداوی لەو جۆرەمان بیستووە؟ ئەگەر دایکەکە مەمکی بخاتە ناو دەمیی منداڵەکەیەوەو خۆی منداڵەکە بخەون, دایکەکە کەمێك هەڵتلێتەوە بەسەریدا دەبێتە هۆی خنکانی.

٧- پێویستە ئاگاداری پەنجەرەی نهۆمی سەرەوە بین , منداڵ نەتوانێت لێیەوە تێپەڕ بێت, پێویستە شیشی پەنجەرەکان بەشێوەیەکی هونەری و هاوچەرخ دروستکرابن کە منداڵ بتوانێت تەماشای دەرەوە بکات بەڵام نەتوانێت سەرکەوێت پێیاندا, چەند ڕووداوی ناخۆشی لەو جۆرە ڕوویداوەو منداڵان بوونەتە قوربانی؟

٨- پێویستە ئاگادار بکرێنەوە لە ئامێرە میکانیکی و کارەبایەکان, بەتایبەتی غەسالەو مەکینەی گۆشت, بۆ ئەوەی پەنجەی منداڵ نەچێت بەناویانداو بپەڕێت, ڕووداوی لەو جۆرەش کەم ڕووی نەداوە!!

٩- پێویستە دەرگای حەوشە هەمیشە داخرێت بۆ ئەوەی منداڵ نەچێتە دەرەوەو

تووشی رووداوی ناخۆش نەبێت لە کاتێکدا دایکی سەرقاڵی ئیش وکاری ناوماڵە.

١٠- هەروەها پێویستە لەکاتی داختنی دەرگادا وریابین تادەستی منداڵ پێوە نەبێت و پەنجەی بقرتێت یان ئازاری پێبگات.

جگە لەمانەش چەندەها رێگای تری خۆپاراستن کە شاراوە نین لای ئەو کەسانەی هۆشمەندو ژیرو بەرچاو روونن.

ئەمانە گرنگترین هۆکار بوون کە ئیسلام داینانوە بۆ پەروەردەی جەستەیی منداڵان, وەك دەزانیت هۆکارەکان گونجاون, ئەگەر باوك و دایك و پەروەردەکاران ئەو رێگایانە بگرنەبەر .. بێگومان دەبینین رۆڵەکانی ئەم نەوەیە چوست و چالاك دەبن, جەستەیان بەهێزو تەندروست دەبێ و, هەنگاو هەڵدەگرن بەرەو ژیانی خۆشگوزەرانی و ئاشتی و ئارامی.

شتێکی ئاشکرایە بەدڵنیاییەوە ئەگەر نەتەوەی ئیسلام بەعەقڵی سەلیم گۆشکران, جەستەیان بەهێز بوو, چاو نەترس و سەربەرز بوون, ئیرادەیان پۆڵاین بوو, تێگەیشتوو خاوەنی ئیدراك و هۆشیاری بوون.. ئەو کاتە دەبنە خاوەن بەرهەم و پێشکەوتنی شارستانی, دەستیانگرتووە بەهۆکاری سەرکەوتن و شکۆمەندیەوە, کرێکاری ماندوو نەناس دەبن بۆ بەدیهێنانی سەربەرزی هەمیشەیی بۆ ئیسلام و موسڵمانان, ئەو کاتە باوەڕداران خۆشحاڵ دەبن بەسەرخستنی خوایی, ئەو خوایە هەرکەسی بوێت سەریدەخات, هەر ئەو زاڵی میهرەبانە.

دەسا ئەی پەروەردەکاران لە دایکان و باوکان و مامۆستایان..

ئائەوە تاکە رێگای ژیانە..

ئائەوە تاکە رێگای بەهێزی و سەرکەوتنە..

ئائەوە تاکە رێگای شکۆمەندی و سەربەرزیە..

ئائەوە تاکە رێگای جاویدانی و مانەوەیە بەهەمیشەیی..

چەندە پێویستە نەوەی ئەمڕۆ کە ئەمانەتە لە گەردنتاندا پەیڕەوی بکەن لە رێنماییە زانستیە بەرزەکان و, ئەو دروشم و بیروباوەڕە هەمیشەییانەی کە دانراون بۆ ئامادەکردنی جەستەیی و, گەشەپێدانی تەندروستی و دەروونی.. تا بتوانن هەستن

بەراپەڕاندنی ئەو ئەركانەی لەسەر شانیانە, وە لێهاتوو كارامەبن بۆ هەڵگرتنی پەیامی ئیسلام و گەیاندنی بە تەواوی جیهان, وەك چۆن هاوەڵان و ئەوانەی دوای ئەوان گەیاندیان بە نەوەكانی دوای خۆیان.

بەڵكو نەوەی نوێ رۆڵەكانی ئەم گەلە لە تاریكی گومڕایی و نەفامیەوە بگەڕێنەوە بۆ نورو روناكی و هیدایەتی ئیسلام و رەوشتە بەرزەكان!!.. ئەوەش بەلای خوای باڵاوە كارێكی قورس و گران نیەو زۆر ئاسانە.

# پێڕستەکان


پێشـەکـی وەرگێڕ........................................ ٣
پێشەکی چاپی یەکەمی ...................................... ٥
پێشەکی زانای گەوەو بەڕێز شێخ وەهبی سولەیمان غاوجی........... ٢٢
پێشەکی چاپی دووەمی دانەر.................................. ٢٦
پێشەکی چاپی سێیەمی دانەر کە لێی زیادکردووە.................. ٣٠
بەشی یەکەم: هەڵبژاردنی هاوسەر.................................. ٣١
بەندی یەکەم: هاوسەری نمونەیی و پەیوەندی بەپەروەردەوە............ ٣١
أ- هاوسەرگرتن لە فیترەتی مرۆڤەکانە ............................ ٣١
ب- هاوسەرگرتن بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵایەتیە. ......................... ٣٤
ج- هەڵبژاردنی هاوسەری چاك و شیاو.................................. ٣٨
بەندی بەندی دووەم: هەست و سۆزی دەروونی لای منداڵان............ ٥٢
أ- خۆشەویستی دایك وباوك بۆ منالْ کارێکی فیترییە..................... ٥٢
ب- سۆزو بەزەیی خوای گەورە داویەتی بەبەندەکانی.................... ٥٨
ج- رق بوونەوە لە کچ خراپەو رەوشتێکی سەردەمی نەفامیە.............. ٦٢
د- ئارام گرتن لەسەر مردنی منداڵ...................................... ٦٥
ه- پێویستە بەرژەوەندی ئیسلام پێش خۆشەویستی منالْ بخرێ................ ٦٩
و- لێدان و دەنگ وەرگرتن لە منداڵ بۆ بەرژەوەندی پەروەردەیی............. ٧٤
بەندی سێیەم: یاسا گشتیەکانی منداڵی تازە لە دایك بوو ...................... ٨٢
باسی یەکەم: کاری یەکەم رۆژی لەدایك بوون .......................... ٨٢
١- موژدەدان و پیرۆزبایی کۆرپەی تازەبوو.................................. ٨٢
٢- بانگدان بەگوێی راستی منداڵدا.......................................... ٨٤
٣- شیرینکردنی دەم و مەڵاشوی منداڵ....................................... ٨٦

٤- سەرتاشینی مندالّ.......................................... ٨٨
باسی دووەم: ئەحکامەکانی ناونانی مندالّ. ......................... ٩١
١- مندالّ کەی ناوی لیّ دەنریّت؟.................................. ٩٢
٢- هەلّبژاردنی ناوی چاك و ناوی ناپەسەند.......................... ٩٣
٣- سوننەتە نازناوی چاك بۆ مندالّ دابنریّ و باوکی بەو ناوەوە بانگ بکریّ...... ٩٨
باسی سیّیەم: ئەحکامەکانی گویّزەبانە(**العقیقة**).......................... ١٠٤
١- گویّزەبانە(**العقیقة**)مانای چییە؟.................................. ١٠٤
٢- بەلّگە شەرعیەکانی گویّزەبانە...................................... ١٠٤
٣- راو بۆچوونی زانایان لەسەر مەشروعیەتی ........................... ١٠٥
٤- کاتی گویّزەبانەکردن............................................. ١٠٩
٥- ئایا گویّزەبانە بۆ کچ و کورِ وەك یەکە.............................. ١١٠
٦- شکاندنی ئیسقانی گویّزەبانە ناپەسەندە(مکروه)ە..................... ١١٣
٧- ئەو ئەحکامانەی پەیوەندیان هەیە بەگویّزەبانەوە....................... ١١٤
٨- حیکمەت و سوودەکانی گویّزەبانە................................... ١١٦
باسی چوارەم: ئەحکامەکانی خەتەنەکردن(الختان) ......................... ١١٨
١- مانای خەتەنەکردن لە زمانەوانی و لەزاراوەی شەریعەتدا .............. ١١٨
٢- ئەو فەرمودانەی دەبنە بەلّگەی رەوایەتی (**مشروعية**) خەتەنەکردن......... ١١٨
٣- ئایا خەتەنەکردن واجبە یان سوننەت................................. ١١٩
٤- ئایا ئافرەت خەتەنە دەکریّ؟........................................ ١٢٤
٥- خەتەنەکردن کەی واجبە بکریّت؟.................................... ١٢٥
٦- حیکمەت چییە لە خەتەنەکردندا؟..................................... ١٢٦
بەندی چوارەم: هۆکارەکانی لادانی مندالاّن و چارەسەری. ................. ١٢٩
پیّشەکیی ............................................................ ١٢٩
ا- ئەو هەژاریەی بالّی کیّشاوە بەسەر هەندیّ لە مالّەکاندا..................... ١٣٠
ب- دووبەرەکی و ناکۆکی نیّوان دایکان و باوکان............................ ١٣١

ج- ڕوودانی تەڵاق و جیابوونەوەی ژن و مێرد لە یەکتر........... ١٣١
د - کات بەفیڕۆدان لەلایەن منداڵان و گەنجانەوە........................ ١٤١
هـ- تێکەڵاوی هاوڕێی خراپ و بەدرەوشتان............................ ١٤٦
و- مامەڵەو رەفتاری خراپی باوك و دایك بەرامبەر بە مندا........... ١٤٨
ع- تەماشاکردنی فلیمی بەرەڵایی و تاوانکاری ............................ ١٥١
غ- بڵاوبوونەوەی بێکاری لەناو کۆمەڵگەدا.............................. ١٥٤
ف- فەرامۆشکردنی پەروەردەی منداڵ لەلایەن باوك و دایکەوە............ ١٥٨
ق- مەینەتی و دەردەسەری هەتیوی.......................................... ١٦٢
بەشی دووەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەکاران................................ ١٦٧
پێشەکی.......................................................................... ١٦٧
بەندی یەکەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی ئیمانی............................ ١٧٤
مەبەست لە بنچینەکانی ئیسلام .............................................١٧٤
مەبەست لە پایەکانی ئیسلام.................. ......... ........... ...... ١٧٤
مەبەست لە بیروباوەڕی شەرع...............................................١٧٤
١) ووشەی (لا الە الاالله) بدرێت بە گوێی منداڵدا............................١٧٥
٢) کاتێ منداڵ بیرو هۆشی کردەوە فێری ئەحکامەکانی حەڵاڵ و حەرام بکرێت..١٧٥
٣) لە حەوتساڵیدا فەرمانی پێ بکرێت بە خوا پەرستی..........................١٧٦
٤) ئەدەب دانی منداڵ لە خۆشەویستی **پێغەمبەر** (ﷺ) **و خانەوادەکەی** قورئان
خوێندن...........................................................................١٧٧
سنوری بەرپرسیارێتی پەروەردەی ئیمانی .................................١٨٢
١) ڕێنمایی منداڵان بۆ ئیمان بەخوا ..................................١٨٢
٢) چاندنی ڕۆحی گەردن کەچی و تەقوا لە دڵ و دەروونی منداڵ دا.........١٨٧

بەندی دووەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی رەوشتی. ...................... ١٩٨
١ - دیاردەی درۆکردن.............................................. ٢٠٥
٢ - دیاردەی دزیکردن.............................................. ٢٠٨
٣ - دیاردەی جنێودان و دەم پیسی.................................. ٢١١
٤ - دیاردەی بەدرەوشتی و بەرەڵایی.................................. ٢١٤
بەندی سێیەم: بەرپرسیارێتی پەروەردەی جەستەیی............................ ٢٤٢
١ - دابینکردنی بژێوی خێزان و منداڵ واجبە............................ ٢٤٢
٢ - شوێنکەوتنی بنەما تەندروستیەکان لە خواردن و خواردنەوەو خەوتندا....... ٢٤٣
٣ - خۆپاراستن لەو نەخۆشیانەی دەگوێزرێنەوە............................ ٢٤٥
٤ - چارەسەری نەخۆشی بەدەرمان و تەداوی.............................. ٢٤٦
٥ - پەیڕەویکردنی دروشمی(لاضررَ ولا ضِرار) ............................ ٢٤٧
٦ - راهێنانی منداڵ لەسەر مەشقکردن و ئەسپ سواری........................ ٢٤٩
٧ - راهێنانی منداڵ لەسەر بە تەنگ دنیاوە نەچوون......................... ٢٥١
٨ - راهێنانی منداڵ لەسەر ژیانی پیاوەتی و دوور لە تەمەڵی و فشۆڵی....... ٢٥١
١ - دیاردەی جگەرەکێشان. ........................................... ٢٥٤
٢ - دیاردەی ئاوهێنانەوە بەدەست. ..................................... ٢٦٠
٣ - دیاردەی مادە سەرخۆشکەرو سڕکەرەکان. ............................. ٢٦٩
٤ - دیاردەی زیناکردن و نێربازی. ..................................... ٢٧٦

( بە ویستی خوا چاوەڕوانی بەرگەکانی تری بن)

## بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشک)

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێندنامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەکەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان "بەرگی سێیەم" | ن: فازل قەرەداغی |

| | | |
|---|---|---|
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەولەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خالْ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان و سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیستو سێ سالْ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا<br>پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ كتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیكرام كەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٢٥ | ئیشكردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆكێكی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووكی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا كۆمەڵە دیدارێكە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەلاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناكبیر و دەسەلات | فەرهاد شاكەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ - ١٩٣٠، لێكۆڵینەوەیەكی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەكانی بوخاری و موسلیم | ئامادەكردن و وەرگێڕانی: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەكخستنی میرنشینە كوردییەكاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب رەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی "بەرگی یەکەم" | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |
| ٤٦ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە)<br>قانع خورشید پێشەکی بۆ نووسیوەو ڕێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٧ | کۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: کاوە محەمەد شارباژێڕی |
| ٤٨ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی: ناصح ئیبراهیم سازانی |